# جەنگی عێراق

## ستەمکاریی سەدام و پەیامی ئەمەریکی

نووسینی

لۆرانس کاپلان و ویلیام کریستۆل



IRAQ

وەرگێرانی

عەبدولکەریم عوزێری

ستەمكاریی سەدام و پەیامی ئەمریكی

# جەنگی عێراق

نووسینی
لۆرانس كاپلان و ویلیام كریستڵ

وەرگێڕانی
عەبدولكەریم عوزێری

سلێمانی، ٢٠٠٧

ناوی کتێب: جەنگی عێراق

بابەت: رامیاری

نووسەر: کاپلان و کریستڵ

وەرگێڕ: عەبدولکەریم عوزێری

کۆمپیوتەر و پێداچوونەوە: حیکمەت مەعروف

بەرگسازی: سۆران علی ئەمین

ژمارەی سپاردن: ٣٢٥

چاپ: یەکەم

چاپخانە: شڤان

لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی کوردۆلۆجی (٤)

وەك وەرگێڕیکی کورد ئارەزوومە لە دڵەوە پێزانینی خۆم بەرانبەر سیاسەتمەداری ئەمریکی، پۆڵ ولفۆڤیتس دەرببڕم، چونکە هەوڵ و تێکۆشانی ئەو بووە مایەی ئەوەی کە ئیدارەی ئەمریکی لە کاتی گەورەترین تەنگ و چەڵەمەدا لە دوای جەنگی ساردەوە بڕیاڕ لەسەر دروست کردنی ناوچەی ( No fly zone )ی کوردستان یان (پەناگە) پێگەی پارێزراو بدات ، ئەمەش هۆکارێك بوو تا کورد هەلی زیاتری بۆ بڕەخسێت و بتوانێ دوور لە زوڵمی سەدام هەڵبژاردن بکات و دەزگە دیموکراتییەکانی خۆی دابمەزرێنێت.

ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە:

ناسك ، ماردین و میران ...

ع. عوزێری

وەك وەرگێڕیكی كورد ئارەزوومە لە دڵەوە پێزانینی خۆم بەرانبەر سیاسەتمەداری ئەمریكی، پۆڵ ولفۆڤیتس دەربڕم، چونكە هەوڵ و تێكۆشانی ئەو بووە مایەی ئەوەی كە ئیدارەی ئەمریكی لە كاتی گەورەترین تەنگ و چەڵەمەدا لە دوای جەنگی ساردەوە بڕیاڕ لەسەر دروست كردنی ناوچەی ( No fly zone )ی كوردستان یان (پەناگە) پێگەی پارێزراو بدات ، ئەمەش هۆكارێك بوو تا كورد هەلی زیاتری بۆ بڕەخسێت و بتوانێ دوور لە زوڵمی سەدام هەڵبژاردن بكات و دەزگە دیمۆكراتییەكانی خۆی دابمەزرێنێت.

# ناوەرۆك

## پەیامی ئەمریکی

## هەندێك بیروڕای جیاواز سەبارەت بەم كتێبە

**هەركەسێك گومانی لەوە هەبێت كە گۆڕینی ڕژێمی عێراقی**
**لە ئاستی بەرژەوەندی زیندووی ئاسایشی ویلایەتە یەكگرتووەكانە،**
**با ئەم كتێبە بخوێنێتەوە.**

**سیناتۆر: جۆن ماككەین**

**بلیمەتانە و یەك لاییكەرەوە، كریستۆل و كاپلان سەر لە ( واقیعە تەسكە )كەی بۆشی یەكەم و ویستی لیبڕاڵەكان هەموو گرێكان دەكەنەوە. هەر دوارۆژی عێراق نییە كە دەكەوێتە مەترسییەوە، بەڵكو لێرەوە نووسەرانی ئەم كتێبە ئەوەمان پیشان دەدەن كە چۆن لە سەردەمی تیرۆر و دەوڵەتانی زیانبەخش و چەكی كۆمەڵكوژدا، جیهان پڕ ئاسایشتر بكەین و بەرەو دیموٚكراتی بەرین و ڕێگەی دیموٚكراتیكردنی جیهان تاسەر بەرنەدەین.**

جیمس وولتری – بەڕێوەبەری ئاژانس
هەواڵگری مەركەزی ۱۹۹۳ – ۱۹۹۵

جەنگی عێراق، لە هەموو دۆکۆمێنتێکی تر زیاتر کێشەی سەرۆك بۆش دژی سەدام روون دەکاتەوە. وەك سەرەتایەك باشترین نووسینە لەسەر مشتومڕە چڕەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا. ئەمریکا نیازی چییە؟ ئەم پێکدادانە لە بابەت چییەوەیە؟ ئەوەی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە، لە بێ بەزەیی سەدام، دڵی دەتۆقێت. لە لاوازی رێگەچارەی ئیدارەی ئەمریکی و وەڵامدانەوەی لە ئاستی هەڕەشەی عێراق رق ئەستوور دەبێت و دەگاتە ئاستی ئەوەی کە ئەم جارەیان دەبێت گۆڕانکاری بکرێت.

داڤید برووك لە ( The Weekly standard ) ەوە.

## پێشەکی وەرگێڕ

لە نێوان کۆمەڵە کتێبێتێکدا لە گۆشەی ئەمریکی ( American Corner ) سەر بە تەلاری پرشنگداری کتێبخانەی گشتی سلێمانی، ئەم کتێبە زیاتر لە هەموویان جێگەی سەرنجم بوو و ناچاری کردم کە لەوانی تر زیاتر پەسەندی بکەم. ئەم کتێبە ئەوەندەی لە باردایە کە وەڵامی گەلێك پرسیاری سەرسوڕهێنەری خەڵکانی کوردستان و عێراق بداتەوە; لەوانە سەدام چۆن هات و چۆن هێنرایە سەر حوکم؟ کێ ئەم هەموو دەستەڵاتەی پێبەخشی؟ چۆن ئەم هەموو کاڵا و ئامێر و تەکنەلۆژیای چەکی کۆمەڵکوژەی لە هەر چوار گۆشەی جیهانەوە بۆ کۆکرایەوە؟ بۆچی بەلای کەسەوە گرنگ نەبوو، چی لە دانیشتوانی عێراق بە تایبەتی ( کورد و شیعە ) دەکات؟ بۆچی ڕێکخراوە بەسۆزەکانی مرۆڤایەتی و ئایینی و هەستیارەکانی ژینگە و ئاژەڵ، هەموو لە ئاستی تاوانە بێ وێنەکانی سەدام بەرانبەر بە مرۆڤ و ژیان و ژینگە و سروشت و جوانی و پرنسیپی رەوشت بەرزی، بێ هەڵوێست بوون؟

کاتێك عەلی کیمیاوی پڕ بە دەنگ دەیقیڕاند و دەیووت: چۆنم بوێت وا لە کوردەکان دەکەم! کێ دەتوانێت فزەی لێوە بێت؟! ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ لە کوێ بوون؟! بۆچوونەکەی هاتەدی و ئەم ڕێکخراوانە مێش میوانیان نەبوو!

بۆچی دوا بەدوای جەنگی رزگارکردنی کوەیت سەربازە تایبەتییەکانی سەدام بە بێ ئەوەی تۆزی جەنگیان لێ بنشێت ڕێگەیان پێدرا بەرەو بەغدا بگەڕێنەوە؟ هەر لە وێشەوە، واتە لە بەغداوە هێرشی قەڵاچۆکردنی کورد و شیعە بە بەرچاوی هێزە هاوپەیمانە پڕ چەکەکانەوە جارێکی تر ئەنجام درا. هەر

لەوێشەوە بەڵێنەکەی سەرۆك بۆشی یەکەم کە ( داوای لە هەموو عێراقییەکان کرد بە پاڵپشتی ئەمریکا دژی رژێم راپەڕن ) شان بەشانی مافی مرۆڤ پێشێل کرا.

هەردوو نووسەر رۆژنامەوان و نووسەری شارەزا و کارامەن، بەبێ ماندووناسین بە دووی راستیدا گەڕاون. زانیاری ورد و بەرفراوانیان لەسەر رژێم و خودی سەدام خۆی کۆکردۆتەوە. لێزانانە سەرجەم تاوانەکانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و چەوساندنەوە و کۆمەڵکوژی لە ناوەوە و دەرەوەی عێراقدا خستۆتەروو. بە چڕ و پڕیش باسی ئەوە دەکەن کە ئەم رژێمە خاوەنی هیچ جۆرە بەهایەکی رەوشتبەرزی و بەڵێن بردنەسەر نەبووە. لەوەش ئاگادار بوون کە ئەم تاقمە بە هیچ شێوەیەك خۆشەویستیی خاك و گەلیان تێدا نەبووە. نووسەران بە روونی باس لە چۆنێتی دەرکردنی بڕیار لە لایەن ئیدارەی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە دەکەن، چۆن ئەم بڕیارانە ئاوێتەی سیاسەتی دەرەوەی ئەم وڵاتە دەبێت؟ هەروەها چۆن سیاسەتی دەرەوەش لەگەڵ ئاسایشی نیشتمانی و بەرژەوەندییەکانیدا دەگونجێنن؟ جگە لەمانەش گەلێك رێباز و فەرمایشت و راو بۆچوون دەخەنەروو کە باش وایە خوێندەواری کورد بیانزانێت. کاپلان و کریستۆڵ پشتیان بە دەیان دۆکۆمێنت و وتاری رۆژنامەی باوەڕپێکرا و وتەی خاوەن پەیوەندی و کتێب بەستووە. ماندوو نەناسانە کەڵکیان لە سەد و بیست و چوار سەرچاوە و شێوە سەرچاوە و دۆکۆمێنت و بۆچوونی شارەزایان وەرگرتووە و لە کۆتایی کتێبەکەشدا ئاماژەیان پێداوە.

پێمخۆشە، لە دڵەوە سوپاسی مەڵبەندی کوردۆلۆجی بکەم کە هانیان دام ئەم کتێبە وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی .و هەڵوێستی کارمەندانی گۆشەی ئەمریکی لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی بەرز رابگرم، کە یارمەتی دام لە بەکارهێنانی کتێب و سەرچاوە و فەرهەنگەکاندا. هەروەها سوپاسی مامۆستا حیکمەت مەعروف دەکەم، بۆ ئەو هەموو شەونخوونی و ماندووبوونەی کە لە چاپ

کردن و پێداچوونەوە و هەڵەبڕی ئەم کتێبەدا کردی، هەروەها سوپاسی گەلەری هونەری بابان و هونەرمەند ماموستا عەلی کەمال دەکەم بۆ ڕێنمایی و ئامۆژگارییان لە کاتی وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا. دووبارە سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی کە لە دوور و نزیکەوە هاوکارییان کردم. بە هیوام خوێنەری کورد، سوودمەند بن و بە ڕەخنە گرتنیان سوورترم دەکەن لەسەر بەرهەم هێنانی کارەکانی داهاتووم.

وەرگێڕ

## پێشەکی نووسەران

دوای چل ساڵێك لە جەنگی سارد و دە ساڵێك ئاشتی و خۆشگوزەرانیی رێژەیی، لە کەناری سەردەمێکی مێژووی نوێدا رادەوەستین. نە چل ساڵەی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤێتدا و نە دە ساڵی حەوانەوە و خۆشگوزەرانی دوای هەرەس هێنانی سۆڤێت ئامادەی کردین بۆ قۆستنەوەی ئەم هەلە بۆ ئەو هەموو ململانێیەی کە کراوە و ئەو رووداوانەی کە بوونەتە هێمای مێژووی ئەو سەردەمە. جەنگی سارد – سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکایان خستە بەرانبەر تەحەدایەکی گەورەوە. کاتێك لە ساڵەکانی ١٩٩٠ دا هەستمان بە نەمانی ئەم تەحەدایە کرد، داوای پشوومان لە مێژوو کرد. وامان خەمڵاند کە دەتوانین پشت بە بازرگانی و جیهانیبوون ( گلۆبالیزم ) بۆ بە دەستهێنانی ئاشتی و ئارامی ببەستین. بەڵام تام وچێژی کۆتاییهاتنی جەنگی سارد، لە ( ١١ )ی ئەیلوولدا لەناوچوو. ئەو رۆژە، ئێمەی خستەڕووی سەردەمێکی نوێوە، بۆ ئەوەش، پێویستمان بە " نەخشەڕێ "یەکی تازەیە.

ئەم کاتە تازەیە، هێشتا سەقامگیر و خۆڕاگر نەبوو بوو کە کەوتەبەر چەپۆکی زەمانەوە، ئەو کاتە دیاری دەکات کە چەرخێك دەڕوا و چەرخێك دێتە جێگەی. ئەگەر ئەمریکا نەتوانێت شێواز بۆ ئەم چەرخە دابنێت، ئەوساکە لەوە دڵنیا دەبین کە خەڵکی تر بۆمان دادەنێت بە شێوەیەك کە نەخزمەتی بەرژەوەندییەکانمان دەکات و نە نموونەییەکانمان ( بەهاکانمان ) دەخاتەڕوو. ئێستەش بەش بەحاڵی ویلایەتە یەککگرتووەکان خۆی، ئەمە کاتی

یەکالاکردنەوەیە. لە کاتی جەنگی سارد دا، ئەمریکییەکان هەلیان بۆ دەرەخسا کە گۆڕانکاری لە چەند شوێنێکدا وەك بەرلین و کۆریا بکەن، ئەمانەش بوون بە کێشە و بۆ ماوەی چەند " دە ساڵێك " شکایەوە بەسەرماندا. ئێمە ئەم جارەش ڕوو بەرووی بڕیاردانێك – بەهەمان سەنگ و ئاکامەوە – دەبینەوە، لە چەند شوێنێکدا، لە ئەفغانستان و لە هەمووی گرنگتر لە عێراقیش. جۆری بڕیاردان لە بابەت عێراقەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە تەواو ئاشکرایە کە لە عێراق تێپەڕ دەبێت. تەنانەت لە ئاستی دوا ڕۆژی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست و جەنگی تیرۆر گەورەترە. ئەم بڕیارە لە بابەت ڕۆڵی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، لە سەدەی بیست و یەکەم دا، لە جیهاندا. لە بابەت ئەو جیهانەوەیە کە ئەمریکا دەیەوێت تێیدا لە رووی نەریتی شارستانیەتەوە گوزەران بکات بە دڵی بێت، نەوەك جیهانێك بێت کە تێیدا دیکتاتۆرەکان بێ ئەوەی بکەونە ژێر فشارەوە، چەکی کۆمەڵکوژ داپین بکەن و بەبێ ویژدانانە وڵاتی خۆیان و وڵاتانی دەرەوە دەخەنە ژێر مەترسییەوە. پشتگیری تیرۆریزم دەکەن. لێرەوە، نووسینی ئەم کتێبە ( جەنگی عێراق ) ئەو وانانە دەبەخشێت کە گرنگی تایبەتی هەیە. گرنگییەکی چارەنووسازە بۆ ڕزگارکردنی عێراق و لەناوبردنی ئەو مەترسییەی کە عێراق دەیخاتەسەر ئێمەش. بەڵام باوەڕیشمان بەوە هەیە، کە ئەو پرنسیپانەی دەبنە زەمینە بۆ هەستانی ئیدارەکەی بۆش بەم کارە، دەبێت ببێتە ڕێنشاندەری سەرجەم بۆچوونی سیاسەتی دەرەوەمان. ئەم کتێبەش لە بابەت ئەم مشتومڕەوەیە.

عێراق بۆتە گۆڕەپانی تاقیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی لە ( دە ساڵە )کانی رابردوودا. هەریەك لە سێ سەرۆکایەتیەکەی دوای جەنگی سارد، خاوەنی جیهانبینی خۆی بووە و شێوەی مامەڵەیان لەگەڵ عێراقدا بووە بەهێمای جەوهەری لە جیهانبینیان دا. ئەمڕۆش ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئاستی ئەو هەڕەشانەی سەدام حوسێندا ناچارە کە ئامانجەکانی و ئەرکە رەوشتییەکانی بە

روونی بخاتەروو.کاتێك کە سیاسەتی تەسکبینی بەرژەوەندییە زیندووەکانی ئەمریکای خستە قاڵبی بیری ستراتیژی و سەقامگیری دەڤەرەکانەوە، ئیدارەی بۆش پاش دەرکردنی سوپای عێراق لە کوەیت، جەنگی دژی سەدام حوسین راوەستاند. ئینجا پشتی کردە دەیان هەزار عێراقی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان خۆی هانی دەدان دژی سەدام ڕاپەڕن. پشتی کردە ئەمان و سەدامی بەجێهێشت تا لە دە ساڵەی داهاتوودا ژیان لە ئێمە و خەڵکەکەی خۆی تاڵ بکات. بۆش ڕۆشت و ئیدارەی کلینتۆن هاتە پێشەوە، ئەمان سەر بە گروپی ( خوازیاری لیبیرالیزم )ی دوای جەنگی ڤێتنام بوون و چەند جارێك لە کاتی گرنگدا ڕێگەیان لە بەکارهێنانی هێزی ئەمریکی گرت. جیهانبینییەکەیان عێراقی وەك کەمێك و زیاتر لە یاری دبلۆماسی رەچاو دەکرد. ئەوی تریش لە چالاکی نامەنووسین یان بە لێدانی نووکە دەرزی مووشەکی وەلامی سەرپێچییەکانی سەدامی دەدایەوە، یان هەر لە بنەڕەتەوە دەیان خستە پشت گوێ.

تا ئەم نزیکانە، پێوەری سیاسەتی ئەمریکی بەرانبەر عێراق هەر سەرنەکەوتنی پیشان دەدا، بەڵام لە ئێستەوە دەتوانین سەرکەوتن لە ئاستی عێراق بکەین بە نموونەی سەرکەوتن بۆ خۆ قوتارکردن لەم پێوەرە سەرنەکەوتووەی پێشینەکانی، سەرۆك جۆرج دەبیلو بۆش، کێشەی عێراقی خستۆتە ئاستی جۆرە جیهانبینییەك، کە خۆی باسی دەکات ( بەهاکانمان و بەرژەوەندییەکانی نیشتمانیمان. ) بە رابردوویەکی پڕ لە شەڕفرۆشتنی دەرەوە و چەوساندنەوەی ناوخۆوە، پێناسەی سەدام لەم دوو ئاستەوە باش ناسراوە. لێرەشەوە مەبەستی سەرۆك تەنها ئیحتیوا و چەك داماڵینی عێراق نییە وەك سەرۆکەکانی پێشوو تر. لەبری ئەوە، قسەی ئەو لەسەر ئازادی عێراقە وەك وڵاتێك کە لە مێژە لە دیکتاتۆرییەت بەولاوە چیدی بە خۆیەوە نەدیوە. بە کورتی سەرۆك بۆش عێراقێکی دەوێت کە لەگەڵ پرنسیپەکانی ئەمریکادا گونجاو بێت.

لەوانەیە، بەلای گەلێك كەسەوە زیادڕەوی بێت، بەڵام بە ئەندازەی ئەو زیادڕەوییە نییە كە دەیەوێت ( دنیا ) لەگەڵ پرنسیپەكانی ئەمریكادا بگونجێنێت. لە وتارەكانیدا بۆ ستراتیژی ئاسایشی نیشتمانی و بۆ دانانی ڕێبازێك، كە لە دواییدا بە فەرمایشتی بۆش ناسرا. سەرۆك بۆش نەك هەر دەیەوێت ڕێگە لە دوژمنانی بگرێت تا نەگەنە ئاستی هێزی دەسەڵاتی ئەمریكی، بەڵكو واشی دەوێت ( بەها كولتورییەكانمان و پرنسیپەكانمان ) بنێرینە دەرەوە بەمەبەستی ئەوەی هاوسەنگی هێز لە ئاستی پەسەندكردنی مافەكانی مرۆڤ دابنێت. بە شكۆدان بە سیاسەتی فەرمی و تاكتیكی پەلاماری دەست بەجێ و ئامانجی گۆڕینی ڕژێم، شان بەشانی بوونی هێزی ئەمریكی بە شێوەیەكی تۆكمە نەك بیانووگر. بە دەستهێنانی ئەمانە هەمووی بە واتای گەشتنە بە ئامانجی ئیدارەی بۆش لە كاتی تەواوبوونی ماوەی حوكمەكەیدا. ئێمە بیرمان لەمە دەكردەوە كە دەتوانێت، بەڵام لە ( ١١ ) ئەیلوولەوە بیر لەوە دەكەینەوە كە پێویستە.

كتێبی جەنگی عێراق دڵی لەسەر زمانیەتی. ئێمە لە مشتومڕی ئازادی عێراقدا، هەوڵی ئەوە دەدەین كە بە دڵ پاكی و ڕاستگۆییەوە دۆزی جەنگ بەرەو پێشەوە بەرین. ئێمە بە وردی دڕندەیی سەدام دەخەینە بەرچاو، بەوپەڕی ڕەخنەشەوە باسی مێژووی سیاسەتی ئەمریكی بەرانبەر عێراقیش دەكەین، لەگەڵ وەسفی ئەو فەلسەفەیەی كە ئەم سیاسەتانەی لاواز و بێ پێز دەكرد. هەوڵی توێژینەوەی فەرمایشتی بۆش و مشتومڕی سەر ئەم فەرمایشتە بۆ ئەوەی ببنە بنەما بۆ بنیادنانی سیاسەتی دەرەوە. جەنگی عێراق ئاوڕێك لەوەش دەداتەوە كە چۆن ڕێگە بە دیكتاتۆری چەوسێنەر، سەدام حوسێن دراوە كە ئەوەندە دەسەڵات دابین بكات. لە هەمان كاتیشدا نەخشەڕێیەك بۆ دوا ڕۆژێكی بەختەوەرانە دادەنێن. حیكمەت لە گۆڕینی ڕژێمدا، پێوەری بڕەودانی دیموكراسی، ئارەزوومەندی بەهێز بوون و كاریگەری ئەمریكا، ئەمانە هەموو هەنگاوی گرنگ و گەورەن كە لە عێراق

تێدەپەڕێت. لێرەوە ئێمە ڕێگە بە خۆمان دەدەین کە ئاواتەخوازبین ئەم نەخشەیە دوای ئازادکردنی بەغداش هەر سوود بەخش بێت.

بۆ ئەوەی زانیاری زۆرتر ببەخشین، خۆمان پابەندی دەیان کتێب و سەدان وتاری نوسراو لە بابەت عێراقەوە و بە گشتیش لە بابەت سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاوە کردووە. بۆ بە راپۆرتکردنی تاوانەکانی سەدام کەڵکی بێ هاوتامان لەم کتێبانەی خوارەوە وەرگرتووە: سەدام حوسێن و کێشەکانی کەنداو، نووسینی جودیف میللەر و لاوری مایلۆری. کۆماری ترس، نووسینی کەنعان مەکیە. ناسینەوە، نووسینی جودیت ساندرا ماکای، هەروەها کتێبی ( لەگەڵ هاوڕێیانی ئاوا دا ) لە نووسینی بروس جیتلسۆن. بۆ دەرخستنی ڕای جیاوازیش، ئێمە ئاماژە بە کتێبە تازەکەی کینیس پۆلاک، ( گەردەلوولی مەترسیدار ) دەدەین، کە دژ بە غەزووی عێراقە. چەند دێڕێك لە نووسینەکانی کاپلان خۆی، کە بۆ ( کۆماری تازە ) م نووسیوە. هەر لێرەشەوە سوپاسی لارا ئۆبۆلۆنسکی دانەری ( کۆماری تازە ) دەکەین، کە ڕێگەی پێداین ئەو دێڕانە بڵاوبکەینەوە. کریستۆل لە ئاستی خۆیەوە چەند دێڕێك لە کتێبی قەبارەداری ( مەترسی ئێستە ) دەرهێناوە. کریستۆڵ خۆی بۆ گۆڤاری (ستانداردی هەفتانە) ئیش دەکات و لەگەڵ ڕۆبەرت کاگان کتێبی مەترسی ئێستەی نووسیوە.

ئێمە تا ڕادەیەکی بەرچاو پتشمان بە ژمارەیەکی کەم، بەڵام بە توانا، توێژەر بەستووە، لە نێو ئەوانەدا، دانیاڵ مەکیڤەرگن لە پرۆژەی سەدەی تازەی ئەمریکاوە، شان بەشانی کریستۆفەر مالێتس لە هەمان پرۆژە، لەناویشیاندا ڕەیحان سەلام لە ئەنجومەنی پەیوەندییەکانی دەرەوە. ئەم کتێبەمان بە بێ یارمەتی ئەوان بۆ تەواو نەدەکرا. هەر لە هەمان پرۆژەدا زۆر سوپاسی ئەلینا مازیانی و چێربڵ میللەر و مۆنیکا تورانیبۆ دەکەین. کاترین مانگۆ وارد، بەخۆشحاڵی و چاکییەوە لە فەرهەنگەکەدا یارمەتی داوین.

بیرۆکەی ئەم کتێبە لە بنەڕەتەوە بە یارمەتی دوو هاوڕێ و هاوکار ڕەگی داکوتا ئەوانیش: گاری شمیت، بەڕێوەبەری پرۆژەی سەدەی تازەی ئەمریکا لەگەڵ پیتەر کولیر سەرۆکی ( Encounter Book )، ئەمانە هەردووکیان یارمەتی بێ پایانیان داوین، هەر لە سەرەتای کتێبەکە تا کۆتایی هەڵەیان بۆ چاك کردووین و پەخشانیان بۆ ڕێکخستووین. زۆر سوپاسگوزاری هەردووکیانین. گرنگە لێرەشەوە ڕۆڵی کارۆلین ویمەر باس بکەین، هەر لە گۆڤاری ستانداردەوە لورانس ئیف کاپلان حەز دەکات سوپاسی پیتەر باینارت، سەرنووسەری کۆماری تازە بکات بۆ ئەو مۆڵەت و پشووەی کەپێی بەخشی، هەروەها کە دەزگەی چاپەمەنی TNR ی وەك ماڵی خۆی بۆ تەرخان کردووە. لە رووی دانان و هاندانیشەوە کاپلان سوپاسی هاوڕێیان و ڕێنمایکەران ئەندرۆ باچێڤیچ و جوشانا مورافیچ. دۆناڵدو گەیلیسکوفب، جۆن و پاتریشای میانی، بێتی ئێدمسیۆن، جوان بوسنەر، و ستیوارت کاپلان، هەموو دەستی یارمەتیدانیان بۆ درێژ کردووە. وە ك کردوویەتی بە پیشە، ساندرا کاپلان، هێشتا زۆرتر یارمەتی داوە و کاپلان وەك هەموو کاتێك پێزانینی خۆی دەردەبڕێت. بڕی سۆز و سوپاسگوزاری نییە کە بەشی پێزانینی سارا میانی بکات لە دڵ دانەوە و هانداندا لە کاتی نووسینی ئەم کتێبە دا.

## بەشی یەکەم
## ستەمکاریی ناوخۆ
## Tyranny at Home

لە نێوان ئەو هەموو ناو و ناتۆرانەی جۆرج دەبلیو بۆش بەکاریهێنان، هیچیان وەك ئەو وشە ناسازەی کە لە چوار پیت پێکهاتووە ( Evil * ) واتە شەیتان، بە نەگریسی دەنگی نەداوەتەوە. رۆناڵد ریگنیش بەم شێوەیە مەحکوم کرا، کاتێك هەمان وشەی بۆ وەسفکردنی یەکیەتی سۆڤێت بەکارهێنا. لە راپرسییەکی شارەزایاندا، بۆش کەوتەبەر رەخنە، چونکە هەمان ناتۆرەی خستەپاڵ ناحەزەکانی ئەمریکا، بەڵام وەك رووداوەکانی (١١)ی ئەیلوول نیشانی دا کە شەیتان لەم جیهانەدا هەیە و کاریگەریشی هەیە. خۆشبەختانە دەتوانرێت شەیتان ببەزێنرێت. وەك چۆن رۆناڵد ریگن هێرشی کردەسەر ( ئیمبراتۆرییەتی ئیڤڵ ) و ئەم هەڕەشەیە بوو بە کلیلی پووخاندنی کۆمۆنیزمی سۆڤێتی، بەهەمان شێوەش سەرۆك بۆش رێگەتۆڵەی دژی شەڕەنگێزەکانی ( ١١ )ی ئەیلوول، ئەوانەی ئەو رۆژە ترسناکەیان خوڵقاند، ساز کرد. (١١)ی ئەیلوول هەر وەك چۆن وەڵامدانەوەی سەربازی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ورووژاند، ئاواش سەرۆك بۆشی خستە پەلە بۆ دیاریکردنی ( میحوەری ئیڤڵ ). کە پێکهاتبوون لەو رژێمانەی بە شەڕەنگێز ناسرابوون، چەکی کوشندەیان دابین دەکرد و پشتگیری تیرۆریستیان دەکرد و دەبوونە هەڕەشەی سەر ویلایەتە یەککگرتووەکان و سەرجەم وڵاتانی تری جیهان. سەرەکیترینیان عێراقی ژێر دەستی دیکتاتۆری چەوسێنەر سەدام حوسین

* شکسپیر وتەنی ( ئیڤڵ ) بە واتای شەیتانیش دێت، لێرەشدا مەبەست لە شەیتانە. وەرگێڕ

بوو. هەتا زیاتر لە بابەت دیکتاتۆری عێراقەوە بزانرێ، زیاتر روون دەبێتەوە کە ئەمیش لە رووی چەپەڵییەوە هیچی لە ئوسامە بن لادن کەمتر نییە. بەتێکڕا سەدام ئەو کەسەیە کە رژێمێکی توندڕۆی تۆتالیتاریزمی بەسەر گەلی عێراقدا سەپاندووە. سەدام هەزارانی گرتووە و ئەشکەنجەیان دەدا و غازیان بەسەردا دەڕێژێت و بۆردوومانیان دەکات. جەنگی تەعداکردنی دژی چەند وڵاتێکی دراوسێی هەڵگیرساندووە و دەیەوێت کۆنترۆڵی رۆژهەڵاتی ناوەراست بکات. داهاتێکی زۆری بۆ برەودان بە جبەخانەی چەکی کۆمەڵکوژ خەرج کردووە. بێ گومان سەدام چەوسێنەرە، شەڕفرۆشە و ئامانجی خودی خۆیەتی کە شارستانییەت بخاتە ژێر مەترسییەوە. بەداخەوە، خەڵکێکی زۆری وڵاتانی رۆژئاوا لەوە ناچێت تاوانەکانی سەدام بە لایانەوە سەرنج ڕاکێش بێت. لە ئەورووپا ئەوانەی وڵاتەکانیان زۆربەی زۆری کاڵا کوشندەکانیان بە سەدام دەدەن، هێشتا سەرقاڵی ئەم کاڵا بازرگانییەن، لەوە دەچێت نەخۆشی ( Cynicism* ) بڵاوبووبێتەوە. هەر لە چینەوە کە خۆی لە خۆیدا دیکتاتۆرییە و دیکتاتۆرییەت نایان حەپەسێنێت. تا دەگاتە وڵاتە عەرەبییەکان، کە رژێمەکانیان سەرقاڵی چەسپاندنی دەستەڵاتی خۆیانن و لە گۆڕانکاری دەترسن.. هەرچۆنێك بێت دەبوایە وریابوونەوەیەکی تایبەت برەخسایە، کەچی خەڵکی بێ هەڵوێست بوون. مشتومڕی جەنگ لەگەڵ عێراقدا وای نیشان دا کە زۆر خاوەنی بیروڕا و هەڵبژاردراوی ڕەسمی و ئەوانی تر کە دەلیلی قەدەر و سامانی یەکە زلهێزی جیهانن، کە توانای خۆیان لە کیس داوە بۆ دەستنیشان کردن و کارکردن دژی ئیڤڵ. تەنانەت لە کاتی چاو بەچاو کەوتن و ڕوو بەڕووبوونەوەشدا. ئەو

* سینزم: وشەیەکی کۆنی یۆنانییە، بە واتای ئەوە دێت، کە خەڵکی هەر کار بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەکەن. ( وەرگێر )

چەوسێنەرەی کە زۆر کەس لە بەرهەڵستی کردنی کارە دزێوو جەردەییەکانی دوودڵ بوون، لە ٢٨ / ٤ / ١٩٣٧ هاتۆتە دنیاوە. دیکتاتۆری دوا رۆژ، لە گوندێك لە دایك بووە کە بە زۆری خانووەکانی لە قوڕ دروست کراون، لە نزیك شارۆچکەی تکریت. لە دایك بوونی سەدام وەك یەکێك لە بایۆگرافنووسەکانی خۆی دەڵێت: ( رووداوێکی پڕ شادمانی نەبوو، نە گوڵەباخ، نە رووەکی بۆن خۆش، بێشکەکەی دانەپۆشی.) مرۆڤی عێراقی، گوێ ناداتە وردە باسی گەنجێتی سەدام، ئەوە نەبێت کە خۆی بە وەچەی پێغەمبەر لە قەڵەم دەدا. سەرچاوە رۆژئاواییەکان دەڵێن: گوایە باوکی سەدام یان مردووە یان دایکی پێش لە دایك بوونی سەدام بەجێهێشتووە. هاوپۆلەکانی سەدام ئەوە دەخەنەوە یاد کە سەدام زلحۆیەك بووە و لەگەڵ شتی تردا چەکی دەهێنا بۆ قوتابخانە. ئەوەش ئاشکرایە کە مامی خیروڵڵا توڵفاح لە منداڵییەوە سەدامی خستۆتە ژێربالی خۆیەوە و لە تکریتەوە بردوویەتی بۆ بەغدا. توڵفاح نەخشە کێشی کودەتا بوو، کە مەیلە سیاسییەکانی کاردانەوەی لە ئەجێندای پارتی بەعسدا هەبووە. توڵفاح بە تێکەڵەی سۆشیالیزم و فاشیزم و نەتەوەپەرستی عەرەبی سەدامی پەروەردە کرد، ئەمانەش هێمای سیاسی حزبی بەعس بوون. توڵفاح لە نامیلکەیەکدا نووسیویەتی: ( دەبوایە خوا فارس و جوولەکە و مێشی دروست نەکردایە.)

ئەم بۆچوونانە کاردانەوەشیان هەبووە بۆ سەر سەدام، سەدام وەك هەرزەکارێك کاری خۆی لە پێڵاوەکانی خاڵیدا بەدی دەکرد. ئامادەی کۆبونەوەکانی بەعس دەبوو، سەرقاڵی شەڕی سەر جادە دەبوو لەگەڵ قوتابیانی زانکۆدا، زۆرترین کاتەکانی لە بەندیخانەدا دەبردەسەر وەك لە دەرەوە.

پەروەردەی سیاسی سەدام لە تەمەنی ( ٢٢ ) ساڵیدا هاتەبەر، کاتێك هەوڵی کوشتنی سەرۆك وەزیرانی عێراق عەبدول کەریم قاسمی دا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. ژیاننامەیەکی فەرمی سەدام دەڵێت: ( بە گوللەی یەکێك لە

برادەرەکانی خۆی پێکرا بوو، سەدام لەناو ئەو ماشێنەی پێی هەڵهاتن، بە چەقۆیەك گوللەکەی لە قاچی خۆی دەرهێنا. سەدام بەرەو سوریا هەڵهات و دوای ماوەیەکی کورت ڕووی کردە میسر، لەوێش ( ٣ ) ساڵ ژیانی بردەسەر. بەپێی قسەی خاوەنی ئەو چێشتخانەیەی کە سەدام هاتوچۆی کردووە، زۆر کەسێکی بێ دۆست و بێ یاوەر و گۆشەگیر بووە و دەڵێت: ( هەرگیز باوەڕم نەدەکرد ئەم شەڕفرۆشە زلحۆیە پێبگات و ببێت بە سەرۆکی عێراق. ) دواتر سەدام گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە* و کچی خاڵی خۆی مارەکردووە و بووە بە بەرپرسی ڕێکخراوی جووتیاران لە حزبی بەعسدا. لە ساڵی ١٩٦٣ دا حزبی بەعس بۆ ماوەیەکی کورت لە ڕێی کودەتایەکەوە دەستەڵاتی گرتەدەست و لە ناکاو لەناو بران. سەدام خرایەوە بەندیخانە، لەجیاتی ئەوەی سەرکەشی شۆڕشگێڕانەی کەم بێتەوە، کەچی لەکاتی بەندیدا زیاتر ئاگری خۆش دەکرد. تەنانەت پاسەوانانی بەندیخانەی دەهێنایە سەر ڕێی خۆی. دوو ساڵ دوای ئەوە لە بەندیخانە هەڵات و گەڕایەوە بۆ کاری نهێنی و چووەناو هێزی ئاسایشی بەعسەوە کە بە ( جیهازی حەنین ) ناسرابوو. ئەم جیهازە هاوشانی ( کراسی قاوەیی* ) هیتلەر بوو. سەدام کەیفی بە ( God father ) واتە سەرۆکی مافیا دەهات و هەروەك ئەوانیش هەڵیدەکوتایە سەر نەیارانی حزبی بەعس و لەگەڵ خێزانەکانیان قەتڵوعامی دەکردن و لاشەکانی لەسەر جادە فڕێ دەدان. دڵرەقی گەشتە رادەیەك، کاتێك بەعس لە ساڵی ١٩٦٨دا دەستەڵاتی گرتەدەست و سەدام بوو بە کەسی دووەم و بوو بە هێزی ڕاستەقینەی پشت خزمەکەی کە ژەنەڕاڵ ئەحمەد حسن بکر بوو، ئیدی تاکتیکەکانی سەدام و جیهازی حەنین بوون بە سیاسەتی فەرمی دەستەڵات.

---

* (ماڵەوە) دیارە لە جیاتی (home) ی ئینگلیزی بەکارهاتووە ، بەڵام لێرەدا مەبەست لە (عێراقە )
* شێوە جیهازێکی سەرکووتکەری هیتلەر بووە. ( وەرگێڕ )

وەك كودەتاكانی جیهانی سێهەم، كودەتاكەی ١٩٦٨ی عێراقیش گۆمی خوێنی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، بەڵام گۆمی خوێنی ئەمجارەیان بێ كۆتایی بوو. بەناو گۆڕینێك دەزگای حەنینی سەدام بوو بە هێزی موخابەرات و هەواڵگری و ئاسایش، كە هەتا ئەمڕۆش عێراقییەكان تیرۆر دەكەن. هەر دوای سێ مانگ لە هاتنە سەر حوكمیان، رژێمی تازە جاڕیدا كە بازنەیەكی جاسووسی زایۆنی كەشف كردووە، چواردە لەم جاسووسانە كە یانزەیان جوولەكەی عێراق بوون، بە پەلە لە بەرچاوی هەزاران كەس، لە گۆڕەپانێكی بەغدا هەڵواسران. رادیۆی بەغداش لە وتارێكدا وتی: ( ئێمە جاسووسمان هەڵواسی، بەڵام جوولەكە چوار مێخەی مەسیحیان كێشا. ) چەند مانگێك دوای ئەوە رژێمەكە جگە لە جوولەكە و كۆمۆنیست، بەسەدان عێراقی تری ، بە تۆمەتی پەیوەندی كردنیان لەگەڵ پلانی ( زایۆنیست )دا ئیعدام كرد ، كوشتن بە تەلەفزیۆن پیشان دەدرا و بە ستوونی كارەبادا هەڵدەواسران.

هەر ئەوەندە ئەو رژێمە تازەیە بەو شێوە تۆقێنەرە خۆی چەسپاند، سەدامیش بە هەمان شێوە دەستەڵاتی گرتە دەست. سەدام زۆر كەیفی بە دڵرەقی ستالین دەهات و توێژینەوەی تیۆرییەكانی حوكمی ستالینی دەكرد و هەر وەك ئەویش بە چەپ و راستدا كەوتە سەرنگووم كردنی هاوكارەكانی خۆی. دانەرانی كتێبی ( سەدام حوسێن و قەیرانەكانی كەنداو ) جودیت میلەرو لاوری مایلۆری دەڵێن: ( ساڵانی تەقەلادان وای لێكردبوو كە زیاتر بێ بەزەیی ببێت و سوورتر بێت لەسەر تێكشكاندنی ئەوانەی رۆژێك دژی وەستابێتن، یان لەوانەیە رۆژێك بەرەنگاری حوكمڕانی بكەن. ) سەدام وەك جێگری سەرۆك، هێزەكانی ئاسایشی

عێراقی وەك زەمینەیەك بەكارهێنا بۆ لەناوبردنی یەك لە دوای یەكی ئەو كەسانەی ئەگەری ئەوەیان لێدەكرا كە جێگەی بگرنەوە.

لە كتێبی ( عێراق لە ساڵی ١٩٥٨ ەوە ) پیتەر سلۆگلێت و ماریان فاروق سلۆگلێت بە وردی باسی ئەوە دەكەن، كە چۆن دیكتاتۆری پڕ تاسە و ئاوات ، هاوڕێیانی ئەندامانی ئەنجوومەنی فەرماندەی شۆڕشی لە دانیشتنێكی ساڵی ١٩٧٩دا لەناو بردن. یەكێك لەوانە موحی عبدول حوسێن مەشهەدی بوو كە بە فەرمانی سەدام ئەشكەنجە درا بوو، بە دانپیانان ناچار كرابوو، لە دواییدا لە بەردەم كۆنگرەی پارتی بەعس رایوەستاندن و ئەم هاوڕێیانەی خۆی بە پیلانگێڕان تاوانبار كردن. هەر ئەوەندەی ناوەكانیان دەخوێندرایەوە، ئیدی دەگوێزرانەوە بۆ هۆڵی گوللەباران كردن. دەمیشیان بەسترابوو، بۆ ئەوەی بە دوا وتەیان سەدام سەخڵەت نەكەن. هاوكات خۆیشی دانیشتبوو سیگاری دەكێشا. لەبەر ئەوەی كەسێكی تر سەرپێچی نەكات، سەدام ئەم دانپیانانەی بە ڤیدیۆ تۆماركردن و كۆپی بە سەر لقەكانی پارتی بەعسدا دابەش كرد. هەر ئەو هاوینە سەدام خزمە نزیكەكەی خۆی ( ژەنەراڵ بەكر )ی بەلادا خست. لە كۆتایی ئەو ساڵەشدا هەموو ( نوێڵ * )ەكانی دەستەلاتی خستەژێر كۆنترۆڵی خۆیەوە. حوكمی ئەنجوومەنی ناوخۆ لەناوچوو، هەروەها ماددەكانی ئایدۆلۆژی بەعسیزم لە كارخران و لە جێگەی ئەمانەدا پەرستنی كەسایەتییەك قووت بووەوە. شكۆمەندی ئەم تاكە كەسە كەوتبووە پێشبڕكێ لەگەڵ شكۆمەندی ستالین و ماودا. بەپێی تێبینی میللەرو مایلۆری: ( سەردانی عێراق وەك سەردانی وڵاتی ( Big brother ) وایە، بورجی وێنەی سەدام لە هەموو گوند و قوتابخانە و تەلار و كۆگایەك راست

---

* نوێڵ ئامێریكی كۆنە، لە كوردەواریشدا بەكاردێت بۆ هەڵكەندنی بەرد، سەریكی دەخرێتە ژێر بەردەكەوەو فشار دەخرێتەسەر سەرەكەی تری و بەردەكە مۆلەق دەكات.

کراوەتەوە. وەك مووی لووت پۆرترێتەکانی سەدام، جارێ جووتیار و جارێ سەرباز یان ئەسپسوار، سەعاتی دەست بە وێنەی سەدام بە سمێڵەوە رازاوەتەوە. بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لە نەتەوەی ( نبوخذ نصر )ە. نۆزدە بەرگی بایۆگرافی فەرمی، داڕشتنی رژێمی تۆتالیتاریزمی ئەمانە هەموو لە گاڵتەجاڕ دەچن لە عێراقدا.) ئەمانە هەرچۆنێك بێت یەك راستی دەردەخەن ئەویش ئەوەیە، ( مامە گەورە ) وەك سەدام خۆی حەز دەکات بانگی بکەن. کەسێك کە گەورەترین دەوڵەتی تیرۆری لە جیهاندا دامەزراندووە. کەنعان مەکی لە کتێبی ( کۆماری تۆقاندن )دا نووسیویەتی: ( بەعس بەدوو جۆر چەوساندنەوە عێراقی زین کردووە، رەوشتی توندوتیژی لەلایەکەوە و بیرۆکراتی لە لایەکی ترەوە. ) لە هەمووی سەرەکی تر، سەدام بەو شێوەیەی کە حوکمی جەماوەر دەکات، بە هەمان رێژەی تیرۆریش حوکمی یاریدەدەرانی نزیکی خۆی دەکات. یا وەزیرەکان بە پێی ( رێجیمی سەدام ) خۆراك دەخۆن، یان لە کاتی سەیراندا بە چەك دەیانترسێنێت. یان داوایان لێ دەکات ناوی چاپنووسەکانی زمانی بیانی خۆیان تۆمار بکەن و بیانخەنە ژێر چاودێرییەوە نەکا خیانەت بکەن، یان بەسادەیی فەرمانبەران بە خۆیان و خێزانەکانیانەوە قەتڵوعام دەکات، بۆ ئەوەی ببنە نموونە بۆ ئەوانی تر. ( پایەدار، سەرکەوتوو، خاوەن شکۆ سەدام حوسێن ) فەرمانی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ملکەچ کردن بۆی، ئەمانەش کەمێك لە زیادە مافەکانی خۆیەتی. وەك عێراقییەك لە ساڵی ١٩٩٤ دا بە نیویۆرك تایمزی وت: ( ئەمڕۆ ژمارەی ئەو عێراقییانەی کە وەك خەڵکانی تری جیهان هەست بە ژیان دەکەن، ناگەنە ملیۆنێك، ئەو کەسانەش ئەوانەن کە حوکمی سەدامیان ڕاگیر کردووە و رژێمەکەی دەپارێزن و خۆراك و پارەی زۆریان دەدرێتێ. )

لە راستیدا، ئەگەر کارمەندانی هێزە چەکدارەکان و پۆلیس و ئاسایش و هەواڵگری بەیەکەوە حساب بکەین، ژمارەی چەکداری سەدام لە ملیۆنێك تێپەڕ

دەبێت. بە روونی دەزگاکانی ئاسایش و هەواڵگری سوپا و بەشی کاروباری سەرۆکایەتی و ئاسایشی پارتی بەعس و ئەمنی ناوخۆ، جاسووسی لەسەر ئەندامانی خۆیان و هەموو هاولاتیانی عێراق دەکەن. سەدام بۆ خۆی بە شانازییەوە لە ساڵی ١٩٨٩ دا وتوویەتی: ( ئێمە ئێستە لە سەردەمی ستالیندا دەژین و دەبێت بە بازووی پۆڵاین لەو کەسانە بدەین کە تۆزێك خوار دەڕۆن یان پاشەکشە دەکەن. ) سەدام تەنانەت لە سوپاکەشی بە گومان بوو، لە جەنگی عێراق – ئێران دا، زۆر کەم رێگەی بەکاری هێزی ئاسمانی دەدا، چونکە ترسی کودەتای هەبوو. هەر لە پێناو هەمان هۆدا ئاهەنگ گێڕانی رۆژی سوپای هەڵوەشاندەوە، زۆر جاریش ئەفسەرە گەورەکانی بە تۆمەتی خیانەت کردن یان بەزین لە گۆڕەپانی شەڕدا دەکوشت. لە پنتاگۆن ژەنەراڵ تۆماس کێلی ئاماژەی بەوە دەدا کە سەدام هیچ کات حسابی بۆ شکست پێدان نەدەکرد. لە راستیدا، پارتی بەعس لێکۆڵینەوە لەسەر هەموو ئەفسەرەکان دەکات و ئەرکی ریشەکێشکردنی ئەوانەی کە گومانی هەڵگەڕانەوەیان لێ دەکرێت، خراوەتە ئەستۆی سێ دەزگای خزمەتگوزاری ئاسایش. لە ئەگەری ئەو حاڵەتەدا ئەگەر خزمەتگوزارانی ئاسایش نەیانتوانی سوپا لە دەروازەکانی کۆشکەکەی دووربخەنەوە، ئەوسا سەدام میلیشای پارتی بەعس بە چەکی دژە تانك دەخاتە کارەوە.

چەکەکانی عێراق هەرچۆنێك بێت، بەزۆری بۆ بەکارهێنان لە دژی هاولاتیان کۆکراونەتەوە. وەك سەدام بۆ خۆی لە ساڵی ١٩٨٢ دا جاڕیدا: ( بوونی سەدام حوسێن لە هەموو گۆشەیەکدا، لە هەموو شوێنێکدا، لە ژێر برۆی هەموو چاوێکدا و لە دڵی هەموو عێراقییەکدا هەیە. ) سەدام ئەم شێوە مەدح کردنەی خۆی کردبوو بە پیشە. ئەمەش تۆڕەکانی هەواڵگری سەرتاپای وڵات دەگرێتەوە و چاودێری ئەوانە دەکەن – تەنانەت ئەگەر کەسوکاری خۆشیان بێت – کە نوکتە لەسەر سەدام دەگێڕنەوە، یان خەریکی کارێك بن کە بە هەڵگەڕانەوە لە کۆمەڵگەی

عێراقی لەقەڵەم بدرێت، رسواکردنی سەدام لەناو خەڵکدا بڕیاری کوشتنی لەسەر دەدرێت.

( ئیندێکس )ێکی بەریتانی بۆ سانسۆرکردن راپۆرتێکی لەسەر حاڵەتێك نووسیوە کە ئەندامێکی بەعس دەسگیر کراوە، چونکە ئاگادری کۆمەڵە خەڵکێك بووە، کە چۆن نوکتەیان لەسەر سەدام حوسین گێڕاوەتەوە. بەڵام ( ئاگاداری دەستەڵاتی نەکردووە. ) لە بابەت ئەو نوکتانەوە لەبەرئەوە خۆی و هەموو نێرینەکانی خێزانەکەی کوژراون و خانووی ماڵەکەشی بە بلدۆزەر تەخت کراوە. لە حاڵەتێکی تردا وەك لە دۆکۆمێنتێکی ئەمنێستی نێودەوڵەتیدا هاتووە، زمانی پیاوێك بڕدراوە، چونکە بوختانی لەسەر دیکتاتۆری عێراق کردووە. دوای ئەم سزایەش بەسەر جادەدا گێڕاویانە و بە دەنگی بەرز جاڕی تاوانەکەیان داوە.

رووداوی سەرنگوون کردنی هاوڵاتیانیش بووە بە کاری رۆتین، چاودێری مافەکانی مرۆڤ لە راپۆرتێکدا لە ساڵی ١٩٩٨ دا دەڵێت: ( دەوڵەتی عێراق لە هەموو ئەندامانی تری نەتەوە یەککگرتووەکان زیاتر کێشەی چارەسەر نەکراوی لەسەرنگوون کردندا هەیە، ژمارەکەشی بەپێی راپۆرتێکی تایبەتی نەتەوە یەککگرتووەکان لە شانزە هەزار زۆرترە. بەپێی راپۆرتی چاودێری مافەکانی مرۆڤ، فەرمانی بێ بنەما و بێ پەروا، پەیتا پەیتا لە کۆشکەکانی سەدامەوە دەردەچن. لە ساڵی ١٩٩٢دا فەرمانداری عێراق واتایەکی تازەی دا بە زاراوەی ( دەستەڵاتی ئابووری ). لەو ساڵەدا ٥٠٠ گەورە بازرگانی گیران و ٤٨ کەسیان لێ کوشتن و لەبەردەم شوێنکارەکانیاندا هەڵیانواسین و لەسەریان نووسین ( بازرگانی تەماعکار ). دوو ساڵ دواتر فەرمانێکی میری دەرچوو کە دەڵێت:( هەر کەسێك شت بدزێت و نرخەکەی لە دوانزە دۆلار زیاتر بێت، دەستی دەبڕدرێتەوە، خۆ ئەگەر دووپاتی کردەوە ئەوە داخ دەکرێت. ) بەردەوامیش فەرمان لە بابەت ئایینەوە دەردەچێت. هەموو شتێك، هەر لە ناونانی شەقامەوە تا وەرگرتنی

قوتابیانی زانكۆ و ڕێكخستنی كار و بگرە مۆڵەتی خانوو دروست كردنیش لە كۆشكی سەرۆكایەتییەوە دەردەچێت. سەدام بە زۆری پشت سوری كاری تیرۆرە بۆ بن دەستەكانی خۆی، ئاشنایەتی لەگەڵ تەكنەلۆژیای سەدەی بیست و یەكەمدا پەیدا كردوو بۆ كاری نامرۆڤانەی لە شێوەی سەدەكانی ناوەراستدا بەكاردەهێنا. دەزگاكانی ئاسایش ساڵەهای ساڵە بە وردی سەرقاڵی هونەری ئەشكەنجە و بێ ئەندام كردنن. هەرچەندە ئەفسەرەكانی بە گشتی هاوئامانجن، ئەویش لەناوبردنی لە ریز دەرچووانە، بەڵام هەر یەكێك لەوانە ئازاردان و قوربانیداندا شێوەی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ نمونە ژنان بۆیە بە زۆری ئەشكەنجەدەدران تا خزمە نێرینەكانیان ناچاری دانپیانان بكرێن. خزمەتگوزاری ئاسایش هێرشی سێكسی و سووك كردن پەسەند دەكەن. بەپێی قسەی عومەر ئیسماعیل، ئەو كابتنەی موخابەرات كە ساڵی ٢٠٠٠ هەڵات، بەكرێ گیراوەكانی ئاسایش بەردەوام مێینەكانی خزمی فەرمانبەرانی حكومەت و سوپا بەنج دەكەن و فلیمی ئەتك كردن لەسەریان تۆمار دەكەن، لە دواییدا ئەم شریتە بەكاردێنن بۆ ئیبتیزازكردنی ئەو فەرمانبەرانە، تا ناچار بكرێن دان بەو رووداوەدا بنێن. ئیسماعیل فەرمانی پێدرا بوو بۆ لێكۆڵینەوە لەگەڵ تەها عەباس حەبابی دا، كە بەرێوەبەری ئاژانسی هەواڵگری بوو. ( دوای دوو مانگ هیچیان لە دژی نەدۆزییەوە، ئەوجا فلیمێكیان لەسەر كچەكەیان گرت كە سێكس لەگەڵ پیاوێكدا دەكات. ) ئیسماعیل لەسەری دەڕوات و دەڵێت: ( پێویست بوو یەكەمجار كچەكە بەنج بكەین. ) زۆری پێنەچوو دوای ناردنی فلیمەكە حەبابی گیانی لە دەست دا. بە پێی ئەمنێستی نێودەوڵەتی، ئافرەتە بەندكراوەكان ( لە كاتی بێ نوێژیدا ) سەر بەرەو خوار هەڵدەواسران، بەزۆر شت كراوە بە ڕەحمی كچاندا، بۆ ئەوەی بێ بن بكرێن. هەروەها ئەمنسیتی نێودەوڵەتی لە راپۆرتێكی دیكەیدا دەڵێت:- كاتێك دەزگاكانی ئاسایش ئەشكەنجەی

ئافرەتانیان داوە منداڵەکانیشیان بەزۆرەملێ خراونەتە ژووری ئەشکەنجەدانەوە، بۆ ئەوەی چاویان لە دایکیانەوە بێت کاتێك کە سووکایەتییان پێوە دەکەن.

هەرچەندە قەدەغەکردنی ئەشکەنجەدانی منداڵیش بە رۆتینی لەلایەن رژێمەکەی سەدامەوە پێشێل کراوە، بەڵام هەروەك چۆن دەزگەکانی ئەمن مامەڵەی ئافرەت دەکەن ئاوا و خراپتریش لەگەڵ منداڵانیشدا دەیکەن و ئازار دەدرێن، بۆ ئەوەی کەسوکاریان ناچاری دانپیانان بکەن. راپۆرتەکانی رێکخراوەکانی مافەکانی مرۆڤ، بە وردی ئیندێکسێکی لەسەر ئازاری گەنجان ئامادە کردووە. ئەمنێستی نێودەوڵەتی روونی دەکاتەوە کە تۆمەتەکان ئەمانە دەگرنەوە: ( دەرهێنانی نینۆکی پەنجە، لێدان، فەلاقە، خراپەکاری سێکسی، لێدانی شۆکی کارەبا، لە خواردن برینەوە و بێبەری کردن لە بەکارهێنانی تەوالێت. )

گروپێکی تری مافەکانی مرۆڤ ناسراو بە چاودێریکردنی رۆژهەڵاتی ناوەراست، شایەتیدانی کەسێکی تۆمار کردووە کە لەوە پێشتر بەند بووە و دەڵێت: ( هەر سەعاتێك جارێك هێزەکانی ئاسایش دەرگەیان واڵا دەکردوو سێ تا پێنج منداڵ و پیاوی بەند کراویان هەڵدەبژارد و راپێچیان دەکردن بۆ ئەشکەنجەدان، دوایی لاشەی خوێناویان دەخستەوە ناو زیندانەکەمانەوە، کە بە ئاشکرا شوێنەواری فەلاقە و لێدانی کارەبا لەسەر لەشیان دەبینرا. جارێك لە نیوەشەودا، چەند سیخورێك هاتن و سێ منداڵیان راپێچ کرد، بەڵام نەیانهێنانەوە، چونکە بە شێوەیەکی زۆر درندانە ئازار درابوون و ناچار بوون بۆ خەستەخانەی سەربازییان بەرن. ) لە راپۆرتێکی تردا هاتووە، ئەو ۲۹ منداڵەی کە لە راپۆرتی پێشوودا باسکرابوون گیانیان لە دەست دابوو، و مەیتەکانیان بە چاو هەڵکۆڵراوی درابوونەوە بە خێزانەکانیان. لە بابەت منداڵەکانی سەدام خۆیەوە وەك رۆژنامەنووسێك لە زمانی عودەی دەیگێڕێتەوە، دەڵێت: ( عودەی بە شانازییەوە باسی ئەوە دەکات کە چۆن سەدامی باوکی، خۆی و قوسەی برای بردووە بۆ

بەندیخانەکانی عێراق تا لە ئەشکەنجە و کوشتن چەشە بین.) ئەوە بەشێك لە پرۆسەی پەروەردەی بێ باکی و چاوقایمی کوڕەکانی بوو. لە کاتێکدا ژن و منداڵی گومان لێکراوان بە شێوەیەك سزا دەدران کە وەسف ناکرێت و بۆ خۆشیان دەکەوتنەبەر تاڵترین چارەنووس، لەم ساڵانەی دواییدا چەند ڕێپۆرتاژێکی ناوەوەی عێراق وای پیشان داوە، کە نێرینە باڵغەکان بە کۆمەڵ کوژراون. یەکێك لەو بەندیخانانەی کە کۆمەڵکوژی تێدا دەکرا، ئەبو غرێب بوو، کە لە ساڵی ١٩٩٨دا، بە هەزاران کەسی بە تۆمەتی چالاکی دژی میری تێدا حەشان درابوو. لە دیدارێکی ڕادیۆیی عێراقی ئازاد و ڕۆژنامەی ئۆبزێرڤەری لەندەنی کە دبلۆماسە ڕۆژئاواییەکان پاڵپشتی دەکەن، گەورە ئەفسەرێکی هەواڵگری کە وەك سەرپەرشتیاری کۆمیتەی بەندیخانە کاری کردووە وتوویەتی: (کۆمیتەکەی تەنها لە یەك ڕۆژی ساڵی ١٩٩٨ دا، ٢٠٠٠ گومان لێکراوی کوشتووە. (هەندێکیان هەڵدەواسران و هەندێکیان گوللەباران دەکران، دواتر هەر یەکە گوللەیەك لەسەری دەدرا.) کوشتن و برین بۆ چەند ساڵێك درێژەی کێشا، ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ هەر ساڵە بە دەرزەن و جارویار بە سەدان کوشتنیان کردووە بە پێشنیار. چەند جارێك لاشەکانیان لەسەر جادە فڕێ دراون و جاروباریش ئاسەواری ئەشکەنجە بە لەشیانەوە دیار بووە وەك چاو هەڵکۆڵین، پەنجەی نینۆك دەرهێنراو، ئەندامی زاوزێی قرتاو، یان برینی قووڵ و سوتاندنی ترسناك. لێرەدا فەرموون لەگەڵ ئەم شایەتی نامەیەی دایکێك کە دەڵێت: (لە ساڵی ١٩٨٢ دا بانگ کرام بۆ وەرگرتنەوەی تەرمی کوڕەکەم کە بەبێ تۆمەتبارکردن گیرابوو، لاشەی کوڕەکەم و نۆ کەسی تر لە هۆڵی مەیتخانەیەك فڕێ درابوون، هەبوو جێگەی تەشوێ سازی پێوە دیار بوو، هەبوو ئوتوویان بە لەشیدا هێنابوو. یەکێکیان وا دیار بوو کە خنکێندرابێت.

ئەگەر سەدام بۆی دەست بدات بەو شێوە بێ مروەتییە مامەڵە لەگەڵ هەموو عێراقییەکدا بکات، بە هەموو گروپە ئەتنی و ئاییینییەکانەوە بە تایبەتی کورد و شیعە، بێ گومان جینۆسایدی دەکردن. کاتێك لە ساڵی ١٩٨٠دا هێزەکانی عێراق چوونە ناو خاکی ئێرانەوە، لەبەر ئەوەی زۆربەی دانیشتوانی ئێران شیعە بوون، دەست بەجێ شیعەکانی عێراق بە گومان لێکراو لە قەڵەم دران. لێرەوە، سەدام دەستی کرد بە چۆڵ کردنی ئەو شارانەی کە شیعە نشینن. پلانی ڕاگواستنی خستەگەڕ، بە هاتنی ساڵی ١٩٨٠، سەدام ٣٥ هەزار هاوڵاتی شیعەی دەربەدەر کرد. لە هەمان ساڵیشدا دەزگەی هەواڵگری، محمد باقر سەدر کە پێشڕەوێکی مەزهەبی شیعە بوو، گرتوو ئاگری لە ڕیشی بەردا و بە بزمار ڕێژکردنی تەوقی سەری کوشتیان. لە میانەی هەشت ساڵەی شەڕی عێراق و ئێران دا، بارودۆخی شیعەکان هەر بەرەو خراپتر دەڕۆشت. بە کۆتایی هاتنی جەنگ لە ساڵی ١٩٨٨ دا، ڕژێمەکەی سەدام بە دەیان هەزار کەسی خستبووە ژێر سزای ڕاگواستن و ئەشکەنجە و ئازار. ئەم شیعانە جگە لە سۆزی ئاییینی خۆیان، هیچ تاوانێکی تریان ئەنجام نەدابوو، بەڵام خراپتر هێشتا بەڕێوەیە. سێ ساڵ لەوە دوا، لە کاتی کۆتایی پێهێنانی چالاکییەکانی گەردەلوولی بیابان دا، شیعەکانی عێراق کەوتبوونە دوای قسەی سەرۆك بۆشی یەکەم و دژی سەدام ڕاپەڕین. ( لە ٧ ی مانگی مارتدا کەمێك زیاتر لە هەفتەیەك بەسەر ڕاپەڕینەکەدا تێپەڕی بوو، بە پێی ساندرا ماکای کە لە کتێبی ( The Reckoning )دا نووسیویەتی: ( شارەکانی بەسرە و نەجەف و کەربەلا لەگەڵ شارۆچکە شیعە نشینەکانی تر بوون بە مەیدانی کوشتار. )

کاتێك سوپای ئەمریکی بێ لایەن وەستابوو، سەدام هێزە تایبەتییەکانی خۆی ناردە سەریان و شۆڕشەکەی تێکشکاند. سەربازەکانی بە خوارووی عێراقدا دەخولانەوە و هەر شیعەیەکیان دەست بکەوتایە دەیان خستەژێر مەترسی

کوشتنەوە. پیاوە ئاینییەکانیان هەڵدەواسین و پیرۆزگاکانیان تالآن دەکردن و گۆڕستانەکانیان بە بلدۆزەر تەفروتونا دەکردن. کاتێك کە میدیای عێراق شیعەکانیان بە بەشێك لە ( پیلانگێڕی پیسی بیانی ) وەسف دەکرد، سوپای عێراق دەستی دابووە کوشتار و دەست درێژی ئافرەت و تالآنکردنی ماڵ و سامانیان. شارۆچکە دوای شارۆچکە کۆنترۆڵ دەکرا و ڕەشەکوژی تێدا ئەنجام دەدرا.

ئەوانەی بەرنەدەکەوتن ڕوویان دەکردە ئێران، هەندێکی تر لە گوندییەکان خۆیان لەناو زەلکاوەکاندا حەشار دەدا، بە هیوای ئەوەی ئەم پەناگە جوگرافییە سادانە لە چەوساندنەوەی بەغدا بیانپارێزێت، بەڵام زۆری پێنەچوو سەدام ڕووبار و دوورگە و بێشەکانی ئەو ناوچانەی خواروی عێراقی کرد بە چاڵە مەیت. هەتا راپەڕینی ساڵی ١٩٩١، زەلکاوەکانی خوارووی عێراق جێگەی دەرەتانی سەدان هەزار شیعە بوون. ئەمانە ( بە عەرەبی زۆنگاوەکان ناسرابوون ) ئەم عەرەبانە لە شارۆچکەکانی ئەو دەڤەرە و لەناو زەلکاوەکاندا ژیانیان دەبردەسەر . لە کاسێتێکی ڤیدیۆدا کە لە ساڵی ١٩٩١دا تۆمار کراوە و کەوتۆتەبەر دەست نەتەوە یەکگرتووەکان، پیشانی دەدا کە چەند ژەنەڕاڵێکی سوپای عێراق فەرمانی پاکتاو کردنی دانیشتوانی ئەو دەڤەرەیان پێدراوە.

لە دۆکۆمێنتێکدا کە بەهۆی هێزەکانی سەدامەوە گەشتۆتە دەستی ئەمریکییەکان، فەرمان دراوە بە هێزەکانی عێراق کە سەرچاوەی خواردەمەنی زەوت بکەن، ماسی فرۆشتن قەدەغە بکەن، ئاو زەهراوی بکەن و گوندەکان بسووتێنن. هەر لەو ساڵەدا هەموو گوندەکانی ئەو دەڤەرە کەوتەبەر هێرشێکی بەرفراوانی سەربازی، لە ئاسمانیشەوە هەموو دانیشتوانەکان بۆمباران دەکران. راپۆرتێکی ساڵی ١٩٩٢ کە لە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچووە دەڵێت: ( خەڵکانی گوندی عادیل و ئەلسەلام و مەیمونە و ئەلمەجەڕ لە ماڵەکانی خۆیاندا

زیندانی کراون و کەوتوونەتەبەر شاڵاوی سەربازی.) دەیڤد ڕۆز لە ڕیپۆرتاژێکدا دەڵێت: ( لەوانەیە سەد هەزار کەس لەو پەلامارە قەتڵوعام کرابێت. ) گەورە کارمەندێکی عێراقی ڕاکردوو بە دیڤد ڕۆزی وتووە: ( بە پاس هێنایانن و لە لۆریدا بەجێیانهێشتن کە خوێنی لێ دەهاتە خوارەوە، هەموو لۆرییەکانی ئێمە و هێزەکانی ئاسایش پڕ کرابوون لە مەیت و بەرەو گۆڕی کۆمەڵ دەگوێزرانەوە. هەر گۆڕێکمان لێ دابێت چەند ڕۆژێك بەسەر بەتاڵی بەجێمانهێشتووە، کاتێك کە پڕ بووە لە مەیت دامانپۆشیوە و دەستمان کردووە بە هەڵکەندنی گۆڕێکی تر. ) بە پێی ڕاپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان: ( بەغدا گەمارۆی ئابووری دەخستە سەر ناوچە زەلکاوییەکان و خواردەمەنی سەرەکی و دەرمانی لێ قەدەغە دەکردن، دواتر ئاویشی لێ بڕین.

زۆربەی زۆری حکومەتەکانی جیهان، زەلکاو وشك دەکەنەوە بۆ دروست کردنی نیشتەجێ بۆ هاووڵاتیان، بەڵام حکومەتەکەی عێراق بە تەواوی بۆ مەبەستێکی تر وشکیان دەکاتەوە. رووکەش، بە ناوی دروست کردنی ئاوبارەیەکەوە بۆ ئاودانی زەوی و زاری خوێیاوی ( شۆر )ی ناوچەکەیە. لە ڕاستیدا سەدام فەرمانی هەڵکەندنی خەندەقی فراوانی دەرکرد بۆ ڕێگرتن لە ئاوەڕۆی دیجلە و فورات کە دەڕژانە زەلکاوەکانەوە. بەم کارەش بەشی زۆری زەلکاوەکانی دەکردە وشکە بیابان. کاتێك کە خێزانە شیعەکان ناچار دەبوون ماڵ و حاڵی خۆیان جێبهێڵن، سوپای عێراق لە خانووەکانیاندا نیشتەجێ دەبوون.

نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم کارەیان بە بەرنامەی میری ناو دەبرد، بۆ کۆنترۆڵی دانیشتوانی دەڤەرەکە، بەڵام ڕێکخراوەکانی ماڤی مرۆڤ، ڕوونی دەکەنەوە کە مەبەستی گرنگی ئەم بەرنامانە کاتێك دەرکەوت کە پیاوەکانی موخابەرات جۆگە و چەمەکانی ناوچەکەیان ژەهراوی کرد و بووە هۆی نەخۆش کەوتنی خەڵك و لەناو بردنی ماسی و ڕەقە و زیندەوەرانی تری ناو زەلکاوەکان.

زۆربەی زۆری شیعەی عێراق وەك ئەو رژێمە سوونەیەی کە دەیانچەوسێننەوە بە رەگەز عەرەبن، لەوانەیە هەر لەبەر ئەم هۆیە بێت کە کارەساتی ئەم شیعانە هێشتە شەرمەزار بێت بەرانبەر بە میحنەتی کوردی عێراق. کورد کەڵك لەم شێوە ئەتنیکیە وەرناگرن، پەرتوبڵاو لەناو تورکیا و ئێران و عێراق و سووریا دا دەژین. گروپێکی جیاوازن - عەرەب نین. بیّ دەوڵەتن، چەند سەدەیەکە وڵاتە خانەخوێکانیان* دەیانچەوسێننەوە، هیچ رژێمێك وەك رژێمی سەدام دڕندانە مامەڵەیان لەگەڵ ناکات. بەشێك لە کوردی عێراق لە باکوری وڵاتەکەدا دەژین و هەر لەوێدا ترسناکترین تاوان لە دوا بەشی سەدەی بیستەمدا ئەنجام دراوە. زۆر پێشتر لەوەی کە سەدام لە بەغدا دەستەڵات بگرێتە دەست، کورد بۆ بە دەستهێنانی ئۆتۆنۆمی هەوڵیان داوە، بەڵام سەدام هەر ئەوەندەی حوکمی گرتە دەست، ئیدی بە تاکتیکێکی توندتر دەیوویست جوڵانەوەی کورد خامۆش بکات وەك پارتی دیموکراتی کوردستان ڕایدەگەیەنێت: رژێم بە شێوازی رەگەزپەرستانە شەڕی جینۆساید دژ بە کورد دەکات. هێشتا ساڵێك بەسەر کودەتای حکومیدا تێنەپەڕی بوو، سەدام حوسین دەستی بە چەوساندنەوەی کورد کرد.

وەك نەتەوە یەکگرتووەکان ڕایدەگەیەنێت لە ساڵی ١٩٦٩ دا نزیکەی ٧٠ ژن و زارۆك لەناوچەیەکی سەر بە مووسڵ، بە زیندووی لە ئەشکەوتێکدا ئاگریان تێبەردراوە. زوو بە زوو رژێمی بەعس هەوڵی پاکتاوی نەژادی دەست پیّ کردووە. لە ساڵی ١٩٧١ دا ٤٠ هەزار کوردی دەربەدەر کرد و عەرەبی هێناوەتە سەر ماڵ و حاڵیان. دژایەتی سەدام بەرانبەر بە کورد ئەوەندە توند بوو، تەنانەت لە کاتی جەنگی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٧٣ دا کە عێراقیش بەشداری کردووە، سەدام

* ئەمە وتەی نوسەرانی کتێبەکەیە، دەنا ئێمە میوانی کەس نین. خۆمان خاوەن ماڵین. ( وەرگێڕ )

قەوارەی سوپاکەی بە ئامادەباشی لە عێراق هێشتۆتەوە، چونکە شەڕی دژ بە کوردی بەلاوە پەسەند بووە وەك لە شەڕی جوولەکە. ساڵێك دوای ئەوە سوپای عێراقی، پڕ چەك بە هەلیکۆپتەر و تانك و فڕۆکەی ناپاڵم هەڵگر، کەوتە بۆردوومان کردنی شارۆچکە کوردەکان. هەزار چەکداری کورد کە خۆیان تەسلیم بە ڕژێم کرد، کەوتنەبەر هەڵمەتی ڕەشەکوژی. هەموو دانیشتوانی گوندەکان بە زۆرەملێ بۆ بیابان گوێزرانەوە. بە پێی ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەی تایمزی لەندەنی، نیوەی خەڵکی کورد لە خانووبەرەی خۆیان بێبەری کران. لە ڕووداوێکی زۆر قێزەوندا لە هەڵمەتی ساڵی ١٩٧٤ دا فڕۆکە بۆمب هاوێژەکان کەوتنە گیانی ٢٥٠ هەزار کورد کە بە کۆڕەو بەرەو ئێران دەڕۆشتن. لە ڕووداوێکی تردا فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق دوو شارۆچکەی گرنگی کوردیان سوتاندو لەگەڵ زەویدا تەختیان کرد، ئەو دوو شارۆچکەیە زاخۆ و قەڵادزێ بوون. لە پرۆسە ڕەشەکوژییەکەی سەدامدا، گرتن و هەڵواسین لەبەرچاوی خەڵکی و کۆمەڵکوژی بوو بوو بەکاری ئاسایی، تەنها تروسکەی هیوای کورد لە واشنتۆنەوە دەهات، لە کاتێکدا کە ویلایەتە یەکگرتووەکان یاوەری شای ئێران بوو، چەکیان بە کورد دەدا بۆ ئەوەی شەڕ لە دژی سوپاکەی عێراق بکەن، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٥ دوای ئەوەی هینری کیسنجەر بوو بە دەڵاڵی ڕێکەوتن نامەیەك لە نێوان بەغداو شای ئێران دا، ئەمریکا ناردنی چەکی وەستاند و بەرگری کورد هەرەسی هێنا.

لە کۆتایی ساڵەکانی ١٩٧٠ دا، کاتێك کوردەکان کپ بوو بوون، سەدام سەرنجی لە ئێران دەدا. لە جەنگی هەشت ساڵەی بێ پەروا دا، سوپای عێراق کەوتە گیانەڵا، جەنگی عێراق و ئێران هیچ شەفاعەتی بۆ کورد پەیدا نەکرد. بەپێچەوانەوە بەغدا بە یەك شێوە کورد و شیعەی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە لە جەنگدا یارمەتی ئێران دەدەن. بۆ ئەو تاوانەش، کوردی خاوەن نەژادی جیاوان،

بوو بەیەکەم گروپی ئەتنی کە دوای ( پرۆسەی هۆلۆکۆست* ) لە لایەن دەستەڵاتی وڵاتەکەیانەوە بە غاز دەرمانڕێژ بکرێن. لە کاسێتێکدا کە دەست چاودێری مافەکانی مرۆڤ کەوتووە، عەلی حسن مجید کە سەرکاری هەڵمەتی قەڵاچۆکردن بوو، لەناو هەواڵنووسەکاندا سنگ دەردەپەرێنێت و دەڵێت: ( من بە چەکی کیمیایی دەیانکوژم! کێ هەیە قزەی لێوە بێت؟

کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی؟ بابڕۆن ( ..... ) بدەن ! قسەکەی هاتەدی، کاتێك کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی گوێی خۆی لێ خەواند بوو، هێزی ئاسمانی عێراقی شارۆچکەی هەڵەبجە و گۆپ تەپە و نزیکەی ٢٠٠ گوندی تری کوردی کیمیاباران کرد. چاودێری مافەکانی مرۆڤ ژمارەی قوربانییەکانی کۆتایی ساڵانی هەشتای بە ١٠٠ هەزار قوربانی حساب دەکات، بەڵام کوردەکان باسی نزیکەی ٢٠٠ هەزار کەس دەکەن. ژمارەکە هەرچەندێك بێت، ئەم پرۆسەی ئەنفالە خۆی لە کاری جێنۆساید نزیك دەخاتەوە. وەك جیفری گولدبێرگ لە ( نیویۆرکەر )دا نووسیویەتی: ( زۆربەی زۆری ئەو کوردانەی لە ئەنفالدا کوژراون بەهۆی غازی کیمیاییەوە نەبووە. جێنۆساید بە زۆری بە شێوەیەکی ترادسیۆنی ئەنجام دراوە. بە شەو کۆکراونەتەوە و بە کۆمەڵ کوژراون و بە کۆمەڵیش خراونەتە خاکەوە. ئەوانەی کە دەست بەجێ نەکوژراون، توانیویانە بە هەمان ڕێچکەدا ڕابکەن، کە دەساڵێك لەمەوبەر خۆیان لێ قوتار کردبوو. ) بەشێکیان لە کوردستان بێبەری بوو بوون، بەشێکی تریان خرانە کەمپی نانەسکییەوە. ئەو کوردانەی لە مردن ڕزگار بوون تووشی چارەنووسێکی باشتر نەبوون، ئەوانیش وەك شیعەکانی عێراق گوێڕایەڵی وتەکانی سەرۆك بۆشی یەکەم بوون لە کاتی جەنگی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١دا دژی سەدام ڕاپەڕین، بەڵام سەرۆك هەر ئەوەندە هێزەکانی عێراقی لە

---

*( هۆلۆکۆست: ئەو فڕنانە بوو کە هیتلەر جولەکەکانی بە کۆمەڵ تێدا دەسووتاندن. وەرگێڕ

کوەیت دەرپەڕاندە دەرەوە، پشتی کردە کوردەکان و بە تەنیا دووچاری رۆژی رەشی کردن. بۆ سێهەم جار لە ١٠ ساڵەی رابردوودا سەدام قەسابی هەزارەها کوردی تری کرد. ئەوانەی بە زیندوویی مابوونەوە بە رێگەی شاخاویدا بەرەو باکور بۆ ناو تورکیا رەویان کرد. ئەم جارەیان کۆڕەوی پەنابەران بە تەلەفیزیۆن پیشان دەدرا و بەرگری لێ نەدەکرا و نەدەشارایەوە. دوا بەدوای هەوڵی بەرفراوان بۆ یارمەتیدانیان ئەمریکا بڕیاری دروست کردنی پەناگەی پارێزراوی* بۆ کورد دا. بە پێی ئەم بڕیارە فڕۆکەی جەنگی عێراق بۆی نەبوو بەسەر ئەم ناوچەیەدا بفڕێت و تیرۆری کوردەکانی عێراق بکات. ئەم ناوچەیە بە ( No Fly Zone ) ناسراوە. ئەوا جارێکی تریش مێژوو خۆی دەخاتەوە ڕوو، لە کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٩٦دا سوپای عێراق بەرەو ژوور و ڕووە و شاری هەولێری کوردنشین شاڵاوی برد. ئیدارەی کلینتۆن لەوە بەدەر کە چەند مووشەکێکی کرۆزی گرتە نیشانەکانی خوارووی بەغدا هیچی تری نەکرد.

ئەفسەرەکانی ( CIA ) و کارگێڕە ئەمریکییە فەرمییەکان کە لەگەڵ فەرمانەدەی کوردا کاریان دەکرد، ڕاکێشرانە دەرەوەی هەرێمەکە. دەست بەجێ سەدان کوردی هاوکار بە ئیعدام لەناوچوون. ئەمڕۆ وەك کارێکی ئاسایی، سوپای عێراق هێرش دەکاتە سەر گوندە کوردەکان لە باکوری عێراق و پێیان چۆڵ دەکات و خێزانەکانیان بەزۆر دەردەپەڕێنێت. کوردەکان ناچار دەکات کە دەستبەرداری رەگەزنامەی خۆیان بن، سەرەڕای ئەمەش خێزانی عەرەبی هاوردە دەخاتە شوێنەکانیان.

## بەشی دووەم
## شەڕەنگێزی دەرەوەی وڵات
## Aggression Abroad

سەدام حوسێن دیکتاتۆرێکی چەوسێنەرە، بەڵام ئایا تاوانەکانی دژی گەلەکەی خۆی پاساوی ئەوە دەداتەوە چەك دژی هەڵگرن؟ کەسانێك هەن دەڵێن کێشە نییە مامەڵەی حکومەتێك چەند تۆقێنەر بێ لەگەڵ هاوڵاتیەکانیدا! هێزە دەرەکییەکان هیچ بنەمایەکی یاساییان نییە بۆ دەستێوەردانی کاروباری نەتەوەیەکی خاوەن سەروەری. تەنانەت ئەمڕۆ و دوای هۆڵۆکۆست و پۆلپۆت و ڕوواندا، چەند کەسانێکی سەر بە ( Real politick ) واتە سیاسەتی واقیعی – بەلایەنەوە ئەوەیە کە حکومەتێك، بە پێوەری ڕۆژئاوایی، شەرعی بێت یان نا، دەبێ توانای ئەوەی هەبێت چی بووێت لە ناو سنووری خۆیدا بیکات. پێشڕەوی پێشووی زۆرینەی جمهوری لە پەرلەمان، دیك ئارمی، پشتگیری ئەم هەڵوێستە دەکات و دەڵێت: ( با سەدام بقیڕێنێ و بقیژێنێ، چی دەکات با بیکات، با ئەمەش کێشەی نێوخۆی وڵاتەکەی بێت، تا ئەوەندەی هەڵسوکەوتی لە سنووری خۆیدا بێت، ئێمە نابێت باسی پەلاماردانی بکەین، یان باسی ئابلۆقەدان دژی بکەین. )

با تۆسقاڵێك خۆمان وا دەرخەین كە عێراق هۆڵەندای جیهانی عەرەبە: هاوڵاتییەكانی چەشەی مافەكانیانن، بە شێوەیەك كە لەوە پێشتر ڕوویەنەداوە، بە ئازادی دەدوێن و پێشەواكانیان هەڵدەبژێرن. كۆكوژی، ڕاگواستن، سەرنگوم كردن و هەڵكوتانە سەری نیوەشەو لە گۆڕێدا نین. ئەگەر ئەمانە هەمووی ڕاست بوونایە، هێشتا ڕژێمەكەی سەدام حوسێن دەگاتە ئاستی یەكێك لە هەرە خەتەرناكترین ڕژێمەكانی جیهان و دەبێت لەو ئاستەدا مامەڵەی لەگەڵدا بكرێت، نەك لەبەر ئەوە لە وڵاتی خۆیدا چ دەكات، بەڵكو لەبەر ئەوەی چ لە دەرەوە دەكات.

لە یاسای نێودەوڵەتیدا، پرینسیپی سەروەری نیشتمانی لە زەمینەی قەدەغەكردنی شەڕەنگێزییەوە دێت و دووركەوتنەوە لە بەكارهێنانی هێزی وڵاتێك دژی وڵاتێكی تر، ئەگەر لەسەر بنەمای خۆپاراستن نەبێت. برگەی ٢ ( ٤ ) دەستووری نەتەوەیەكگرتووەكان ( مەترسی بەكارهێنانی دژی سەلامەتی زەوی و یان دژی ئازادی سیاسەتی دەوڵەتان قەدەغە كردووە. ) سەدام لە ئاستی خۆیەوە، بەردەوام پەنا دەباتەبەر ئەم دەستوورە و لای نەتەوەیەكگرتووەكان، سكاڵا دژی ( شەڕفرۆشی ) ئەمریكا و ئێران دەكات. ( عێراق بۆ خۆی ئەندامی پرۆتۆكۆڵی جنێڤە، بۆ قەدەغەكردنی چەكی كیمیایی و ڕێكەوتننامەی كۆمەڵكوژی ساڵی ١٩٨٤، ئەمە جگە لە چەند ڕێكەوتننامەیەكی نێودەوڵەتی تر ). لە ڕاستیدا، چارتەری دژ بە تەعدای نێودەوڵەتان، تا ڕادەیەكی بەرز پەیڕەوی كراوە، لە كاتێكدا، دوا بەدوای جەنگی جیهانی دووەم، بە دەیان جەنگی ئەهلی ڕوویداوە و لە هەمان كات و شوێندا. جەنگ لە نێوان دەوڵەتەكاندا بە ڕێژە زۆر كەمتر ڕوویداوە. وەك رووشی داوە، سەدام بەرپرسی بەشێكی بەرچاوی ئەم جەنگانەیە. لە ماوەی بیست ساڵی حوكمەكەیدا، كاری شەرفرۆشی دژی ئێران و كوەیت و ئیسرائیل ئەنجامداوە وەك شا حوسێنی ئوردن دەڵێت ئاكامەكانی ( ئەهراماتی كەللەسەر بوون. )

تەنها چەند مانگێك بەسەر داگیرکردنی دەسەڵات دا تێپەڕ ببوو، لە ساڵی ١٩٧٩دا، سەدام فەرمانی بە هێزەکانی دا بچنەناو خاکی ئێرانەوە. دیکتاتۆری عێراقی بە خۆهەڵکێشانێکەوە بە شافەهدی عەرەبی سعوودی وت: ( بە مارشی سەربازی دەچمە ناو تارانەوە و ریشی خومەینی دەسکەنە دەکەم. ) ئەو پێکدادانەی دوای ئەمە هاتەدی بە یەکێك لە خوێناویترین و درێژترین جەنگی ئاسایی سەدەی بیستەم دەژمێردرێت. جەنگی ئێران – عێراق هەشت ساڵی خایاند و بوو بە هۆی گیان لە دەستدانی بەلای کەمەوە، یەك ملیۆن کەس و برینداربوونی دوو ئەوەندەی تر و کاتێك جەنگ کۆتایی هات، سەدام هیچ دەسکەوتی نەبوو. سەرەڕای ئەوەی بلیۆنەها دۆلار لە هەشت ساڵی خوێنڕێژتنندا خەرج کرا، هێڵی ڕاوەستانی شەڕ لەگەڵ دەسپێکیدا بە ئاستەم گۆڕابوو. بچووکترین ئامانجی شەڕ وەك سەدام لەسەرەتای جەنگدا جاڕی بۆ دەدا، گەڕانەوەی شەتولعەرەب بوو، کە عێراق لە ساڵی ١٩٧٥ دا تەسلیمی ئێرانی کرد. پێنج ڕۆژ بەر لە پەلاماردانی ئێران، سەدام ئاشکرای کرد کە ڕێکەوتننامەی ١٩٧٥ چیدی کاری پێ ناکرێت. وەك پێوەرێکی چاك، لەبەرچاوی کامێراکانی تەلەفیزیۆن، ڕێکەوتننامەکەی پارچە پارچە کرد. ئامانجی بەرفراوان تری سەدام وەك خۆی چەند جارێك لە قسەکانیدا کە هەر لەو ساڵەدا، باسیکرد، ڕوخاندنی رژێمی سیوکراتی – واتە ئایینی ئێران بوو. بڕیاری غەزووی ئێران وەك مایکڵ شتێمەر لە ( Foreign Affair ) لە گەرمەی جەنگدا نووسیویەتی ( دەبێ خراپترین هەڵەی ستراتیژی بێت لە رووی حساباتیدا لەم سەدەیە دا ). بە وردی حساباتی سەدام تا چ ڕادەیەك، خراپ بوو؟ لە چەند هەفتەی دەستپێکدا کەوتە ڕوو! لەسەرەتادا سوپای عێراقی کشایە ناو قوڵایی خاکی ئێرانەوە و مەلاکانی تارانی حەپەساند و چەند سەرکەوتنێکی مەیدانیان بەدەست هێنا. لە ڕاستیتدا، سەدام باوەڕی وابوو کە جەنگ لە ماوەی مانگێکدا کۆتایی پێدێت، بەڵام بەزووی

ڕوو بەرووی بەرگرییەکی چاوەڕوان نەکراو بووەوە. فەرماندەرە ئێرانییەکان سوودمەندی سێ بە یەکی زۆری مان پاوەری ئێران لە ئاستی عێراقدا بوون. ئەم زۆرینە ژمارەییەی وەك شەپۆلی ئادەمیزادی کاریگەر خستەکار بۆ داگیرکردنی شوێنگەکانی سوپای عێراق. لە ئاکامدا هێزەکانی عێراق لە شوێنی خۆیاندا چەقین. لە ساڵی ١٩٨١ دا، ئێران زنجیرە هێرشێکی پەرچدانەوە و سەرکەوتنی ئەنجامدا و هێزەکانی سەدامیان کردە دەرەوەی خاکی ئێران. لە ساڵی دوای ئەمەش ئێرانییەکان سەرکەوتنی زیاتریان وەدەست هێنا. کامپەکانیان بە دەیان هەزار سەربازی دەستگیرکراوی عێراقی پڕ کرد. میللەر و مایلور نووسیویانە و دەڵێن: ( زۆری نەمابوو سەدام بۆ خۆی دەستگیر بکرێ، کاتێك لە پشتی مەیدانی شەڕەوە کەوتە ناو بۆسەی ئێرانەوە و هاواری بۆ نزیکترین هێزی ئەو ناوە برد کە لە ژێر فەرماندەی ژەنەڕاڵ ماهیر ڕەشید بوو. ئەم ژەنەڕاڵە تکریتییە قسەی لەگەڵ سەدامدا نەبوو، چونکە مامی ئیعدام کردبوو: هەتا سەدام بەناوی ( مام )یەوە نەکەوتە پاڕانەوە، ڕەشید ڕزگاری نەکرد.

لە مانگی حوزەیرانی١٩٨٢ دا، هێزەکانی سەدام ئەوەندە لاواز بوو بوون، کە ناچار بوو بە یەك قۆڵی جاڕی شەڕ ڕاگرتن بدا و پێشنیاری هاوپەیمانی هەردوولایدا دژی ئیسرائیل. ئێرانییەکان بەچوونەناو خاکی عێراقەوە وەڵامیان دایەوە.

سەرکەوتنی ئێرانییەکان لە مەیدانی جەنگدا ناگەڕێتەوە بۆ لێهاتوویی فەرماندە ئێرانییەکان کە سەرقاڵی بە سەربازکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵك بوون، کە لە پێناو بەهەشتدا بە لەشی خۆیان ( مین ) یان دەتەقاندەوە. وەك ستراتیژناسێك لەو کاتەدا باسی کردووە: ( هۆی یەکەمی نەدۆڕاندنی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ گەوجی ستراتیژ و تاکتیکی عراقییەکان. ) ئەم تاکتیکانە لە

بەغداوە دەردەچوو، بەسەر ئەوەشەوە بەدرێژایی شەڕ، سەدام سەری لە مەیدانەکانی جەنگ دەدا و ڕێنمایی شەڕی دەکرد.

لە ڕاستیدا، سەدام نەك هەر بەرپرسی غەزووی نایاسایی ئێرانە، بەڵکو بەرپرسی تاکتیکی نامرۆیی و نایاساییە کە لە شەڕدا بەکارهێنراوە. ئەم تاکتیکانە لە خۆیاندا فەرهەنگێکی سەرپێچی کردنی ڕێکەوتننامەی جنێڤە. وەك دەستپێك، هیچ خۆی لە سەپاندنی جەنگ بەسەر خەڵکانی مەدەنییدا نەپاراستووە. وەك بەشێك لە ( جەنگی شار )ەکان، سەدام فەرمانی بەهێزەکانی دا بە هێرشی مووشەکی لە شارۆچکە و مزگەوت و قوتابخانەکان بدەن. لە ماوەی هەشت ساڵی جەنگدا، ئەو شارۆچکانەی کە بەهۆی هێرشی ڕۆکێتیەوە وێرانکران، لە ژمارە نایەن. بە پێی ڕاپۆرتەکانی هەواڵگری ویلایەتە یەککگرتووەکان، بە تەنیا لە سێ مانگی ١٩٨٨ دا، عێراق بەلای کەمەوە ( ١٨٩ ) ڕۆکێتی سکۆدی بە تارانەوە ناوە.

لەبابەت تاکتیکەوە دژی سەربازە ئێرانییەکان، سەدام لێدانی کارەبای بەلاوە پەسەند بوو. ( ئەفسەرێکی عێراقی بە سنگ دەرپەڕاندنەوە وتی: ( ئێمە وەك باینجان سوریان دەکەینەوە. ) مارك فایخان راپۆرتنووسی لۆس ئەنجلس تایمز وەسفی شەڕێکی ساڵی ١٩٨٤ دەکات، کە سوپای عێراقی دوژمنی ( سورکردەوە )و دەڵێت: ( عێراق ئەوەندە تۆپی نا بە ( پاسەوانانی شۆڕش ) ی ئێرانییەوە کە ناچار بن کەشتییەکانیان بەجێبهێڵن و کاتێ بە سەدان لەمانە بەناو زەلکاوەکاندا بێچارە بە پێ دەڕۆشتن، سویچی موەلیدەکان هەڵکران و کارەبای هەزارەها ڤۆڵتی بەناو ئاوەکەدا پەخش کرد، لە چەند چرکەیەکدا بە سەدان کەوتنەبەر شۆکی کارەبا.

سوپاکەی سەدامیش بە دەیان هەزار سەربازی بەدیل گرت. مامەڵەی بێ بەزەییانەی ئەم دیلە ئێرانیانەیان دەکرد، کە سەرنجی ڕۆژئاوایان راکێشا. دوای هاتنەدەروەی چەند راپۆرتێك لە کامپەکانی بەندیخانەکانی عێراقەوە، بوو بەهۆی

ڕایەڵ کردنی چەند تەحقیقاتێك. لە ساڵی ١٩٨٥ دا، سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان تیمێکی سازکرد، بۆ تاوتوێی ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە کامپەکانەوە هاتبوون. ( تۆمەتەکان بەزۆری لە بابەت لێدانی تەوقی سەر و لێدان بە دار و تێلاّ و کێبلّی کارەبا بووە ) دیلەکان ( باسی هەلّواسینی سەربەرەو خوار بە بنمیچەوە و بە پانکەوە دەکەن، یان بنی پییان لە ژێر لێداندا سوواوە، شۆکی کارەباییان لە گەلێ شوێنی لەشیان داون، لەوانە ئۆرگانی زاوزێ یان بە جگەرە سوتاندنیان. لە چەند حاڵەتێکدا، هەر بۆ ڕابواردن کوشتوویانن. ) لە ساڵی ١٩٩٠ دا، واتە دوو ساڵ دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ئێرانی – عێراقی، هێشتا نزیکی چواردە هەزار دیلی جەنگی لای عێراق گل درابوونەوە، تەنانەت ئەو کاتەش بە پێی شایەتی نوێنەری چاودێری ڕۆژهەلاّتی ناوەراست لە بەردەم خانەی کۆمیتەی کاروباری دەرەوەدا.

دیلەکان ( بەشێوەیەکی سیستماتیکی ئەشکەنجە دراون بۆ ئیعتراف کردن یان بۆ هاوکاری کردنی زۆرەملێ. ) درەنگ تا ساڵی ٢٠٠٢، هێشتا عێراق نزیکەی سێ هەزار دیلی لە بەندیخانەکاندا هێشتبووەوە.

بێ گومان، سەدام گازی ژەهراوی بەسەر سەرباز و خەڵکی سڤیلدا ڕشتووە. لە نێوان ١٩٨٤ و ١٩٨٨ دا، شەش تیمی جیا جیای نەتەوە یەکگرتووەکان توێژینەوەیان لەسەر حاڵەتێکی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی عێراقی دژی ئێرانییەکان کردووە. لە ساڵی١٩٨٨ دا و زیری دەرەوەی عێراق، تاریق عەزیز بە ڕاشکاوی دانی بەوەدا نا کە گازی ژەهراوی، لە سیاسەتی فەرمی جەنگی عێراقدا بایەخی پێدراوە. لە هەمان ساڵدا، ئەنجومەنی ئاسایش ڕاپۆرتێکی بلاّوکردەوە و تێیدا گلەیی لە عێراق کرد دەربارەی بەکارهێنانی گازی خرنوکە لە هێرشەکانیدا دژ بە شارەکانی ئێران. هەروەها بەکۆی دەنگ عێراقیان مەحکوم کرد، چونکە ( بە خەستی و بە بەردەوامی ) چەکی کیمیاییان وەك پێشێلکردنی

پرۆتۆکۆڵەکانی جنێڤ، بەکارهێناوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەغدا دووچاری سزادانی گەورە نەدەبوو، چونکە دوژمنەکەشی دەوڵەتێکی نەگریس بوو، بۆیە سۆزی پایتەختە رۆژئاواییەکانی زۆر کەم رادەکێشا و لە ئازاریان کەم نەدەکرایەوە. لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٤ ەوە عێراق بۆ ماوەی پێنج ساڵی تەواو، بەچەکی کیمیایی بۆمبارانی ئێرانی دەکرد. بە هەزاران کەسی دەکوشت یان بریندار دەکرد، بۆ یەکەم جار لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە، قوربانیەکانی گازی ژەهراوی بۆ چارەسەر دەنێردران بۆ خەستەخانەکانی ئەورووپای رۆژئاوا.

راپۆرتێکی نەتەوە یەکگرتووەکان بە وردی باسی ئەوە دەکات، چۆن پێش دەست پێکردنی هێرشێکی پیادە، شوێنەکە بە گازی ئەعساب و گوللە تۆپی سیانید بۆردومان کراوە. راپۆرتەکە وەسفی دەکات و دەڵێت: ( نیشانەکانی پێکهاتبوو لە سووتاندنی دەورویشتی چاو و چەند شوێنێکی تری لەش، دوا بە دوای ئەوەش پێست شین و مۆر دەبێتەوە و بلّق دەکات و دەبێت بە برین، لە دواییدا پێستەکە رەش هەڵدەگەرێت. ئەوانەی بە خەستی بەرکەوتوون، سی و گورجیلەکانیان لە کار دەکەون، چاویان کوێر نەبێت و بەدبەختەکانیش گیان لەدەست دەدەن. ) ژەنەراڵێکی عێراقی لە ساڵی ١٩٨٤ دا بە ( واشنتۆن پۆست )ی وت: ( ئەگەر دەرمانی مێش و مەگەزم بدەیتێ، دەیرێژم بەسەر ئەم جانەوەرانەدا تا دەیانکوژم. ) بە هەموو بۆچونێکەوە ئەو ژەنەراڵە ئەم کارەی لە مێژە بەئەنجامداوە.

هەرچەندە جەنگ دژی ئێران، بە پێی هەموو پێوەرێکی ماقول، دۆراندنێکی مەزن بوو، بەڵام ئەوەندە سەدامی گومرا کردبوو کە هەر چییەك بکات کەس لاقەی ناکات. دوو ساڵ دوای دوا تەقە، هێزەکانی بەرەو باشوور، بەرەو کوەیت غل کردەوە. لە کاتێکدا سوپای عێراقی لە دەوروبەری سنووری کوەیت خەریکی خۆ دامەزراندن بوو ، لە کۆتایی مانگی گەلاوێژی ١٩٩٠ دا، پێشەواکانی جیهان، لەوانە فەرمییە ئەمریکیەکان، نەیاندەویست باس لەم راستیە بکەن. لە

نێوان ئەو هۆیانەی کە بوو بوون بە داردەستی سەدام ئەوانە بوون: گوایە سەدام فشار دەخاتە سەر ئۆپیك بۆ ئەوەی نرخی نەوت بەرز بکاتەوە، یان دەیویست دوو بلیۆن دۆلار قەرزی کوەیت بسرێتەوە. دەیویست دوورگە بچکۆلەکانی کوەیتی ناو کەنداو بەکاربهێنێت. حەزی دەکرد لەگەڵ کوەیتیەکاندا لەسەر بیرە نەوتەکانی سنووری کوەیت بگەنە رێککەوتنێك کە ناکۆکی لەسەر بوو. رۆژانی پێش جەنگ، پێشکەوتن لە بابەت هەموو ئەم خاڵانەوە هاتەدی. تا لە ۲ ئابدا، سەدام غەزووی کوەیتی کرد. بە هاوبەشی چەند تیپێکی زرێپۆش، دابەزین لە وشکانی و ئاوەوە و بەیارمەتی هەلیکۆپتەر کە هێزی تایبەتی دادەبەزاندە ناو کوەیتەوە، بە سەدان هەزار سەربازی عێراقی سنووریان شکاند، لە ماوەی چەند سەعاتێکدا وڵات بوو بە هی خۆیان.

ئەمجارەیان کار کاری سۆز دەربڕین یا هەوڵی دیبلۆماسی نەبوو. کەمجار لایەنێك لە پێکدادانێکدا ئاوا بە روونی بەرپرسیار دەبێت و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئاوا بە خێرایی، یەك ریز، رادەوەستن. لە هەمان رۆژی داگیرکردندا ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارێکی یەك لایی پەسەندکرد، کە کاری شەڕەنگێزی مەحکوم کرد و داوای کرد ( کە عێراق کتوپڕ و بێ هیچ مەرجێك بێتە دەرەوە. ) چەند رۆژێك دوای ئەوەش ئەنجومەنی ئاسایش بە تێکڕا دەنگی لەسەر قەدەغەکردنی بازرگانی لەگەڵ عێراقدا دا. پێشەوا عەرەبەکان بە کۆمەڵ لەسەر ئەوە رێککەوتن کە هێز بنێرن بۆ پاراستنی عەرەبی سعودی، ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکیەتی سۆڤێتیش داوایان لە هێزەکانی عێراق دەکرد کە واز لە کوەیت بهێنن. لە کۆتاییدا، لە ۲۹ ی نۆڤەمبەردا، ئەنجومەنی ئاسایش بۆ دەرکردنی سوپاکەی سەدام بڕیاری بەکارهێنانی هێزی دا، هەر چۆنێك بێت، لەوە نەدەچوو هیچ شتێك لەمانە تۆسقاڵێك کاری کردبێتە سەر سەدام ، بە پێچەوانەوە هەموو ئەو هەوڵانەی ڕەت کردەوە، کە دەیانویست کێشەکەی لەگەڵ کوەیتدا

چارەسەر بکرێ و ئابرووی خۆشی بپارێزێت. لە جیاتی ئەوە بە ئاشکرا بانگەشەی بۆ جەنگی ( دایکی جەنگەکان ) دەکرد، ئەگەر بێتو رۆژئاوا نیازی دەستێوەردانی هەبوو. ئەمانە هەمووی لە کاتێکدا بوو کە پێشەوا عەرەبەکان چاوەڕێی کاری وایان نەدەکرد. سەدام بە شا فەهدی وتبوو: ( براکەم گوێ مەدەرێ، ئەمە کارێکی گەورە نابێت ). کاتێك کەسانی تر سەدامیان لە ئاستی قین لە دڵی ئەمریکا وریا دەکردەوە، بەڵام ئەو گوێی بە هیچ نەدەدا و لە خەیاڵدا دەژیا. لێرەوە حوسنی موبارەك دەڵێت: ( وەك بە مانگ بوەرِم وا بوو. ) سەرۆکی سوریا، حافز ئەسەد وتوویەتی: ( ئەم پیاوە شێتە، هەر لەبەر ئەوەی دژی ئێران شەڕی کردووە، لای وایە دەتوانێت ئیسرائیل و ئەمریکا بخاتەژێر مەترسییەوە! نازانێ هێزی سەربازی راستەقینە مانای چییە؟! )

هەروەك چۆن شەڕی ئێران – عێراق، هەڵسوکەوتی سەدام لە جەنگی کەنداودا نامرۆیانە بوو، هیچ جیاوازییەکی لە نێوان سەرباز و سڤیلدا نەدەکرد. بە هەمان شێوە ٧٠٠٠ پیاوی موخابەرات و ٤٣٠٠٠ سەربازی نیزامی بەرەلای کوەیت کرد و دەستیان بە تالان کردنی پایتەخت کرد. سەنتەری گرتن و ئەشکەنجەدانیان دامەزراند و کۆمیتەکانیان لەسەر شەقامەکان دانا. ( راپۆرتی میری ویلایەتە یەککگرتووەکان لە ساڵی ١٩٩٢ دا حسابی کوشتن و ئەشکەنجەدان تا مردن، لە کاتی داگیر کردنی کوەیتدا، بە زیاتر لە هەزار کوەیتی دەخەمڵێنێ. لە هەمان کاتدا، عەمیلەکانی سەدام خەڵکی شارەکەیان کۆنترۆڵ دەکرد و بە هەزاران مەدەنییان ڕاپێچ دەکرد و دەیان ناردن بۆ بەندیخانەکانی ناو عێراق. وەك لە راپۆرتێکی بڵاوکراوەی وەزارەتی دەرەوە لە ساڵی ١٩٩٣ دا ئاماژەی پێ داوە، هێزەکانی عێراق لە کوەیت دژی سڤیلە کوەیتیەکان بەرپرسی ئەم تاوانەن. ( لێدانی شۆکی کارەبا لە شوێنە هەستیارەکانی لەش وەك ( لووت، دەم و ئۆرگانی زاوزێ، مەکینەی هەڵکۆڵینی کارەبا بۆ کوونکردنی سنگ و قاچ و قۆڵ بەکار

نێوان ئەو هۆیانەی کە بوو بوون بە داردەستی سەدام ئەوانە بوون: گوایە سەدام فشار دەخاتە سەر ئۆپیك بۆ ئەوەی نرخی نەوت بەرز بکاتەوە، یان دەیویست دوو بلیۆن دۆلار قەرزی کوەیت بسڕێتەوە. دەیویست دوورگە بچکۆلەکانی کوەیتی ناو کەنداو بەکاربهێنێت. حەزی دەکرد لەگەڵ کوەیتیەکاندا لەسەر بیرە نەوتەکانی سنووری کوەیت بگەنە ڕێککەوتنێك کە ناکۆکی لەسەر بوو. ڕۆژانی پێش جەنگ، پێشکەوتن لە بابەت هەموو ئەم خاڵانەوە هاتەدی. تا لە ٢ ئابدا، سەدام غەزووی کوەیتی کرد. بە هاوبەشی چەند تیپێکی زرێپۆش، دابەزین لە وشکانی و ئاوەوە و بەیارمەتی هەلیکۆپتەر کە هێزی تایبەتی دادەبەزاندە ناو کوەیتەوە، بە سەدان هەزار سەربازی عێراقی سنووریان شکاند، لە ماوەی چەند سەعاتێکدا وڵات بوو بە هی خۆیان.

ئەمجارەیان کار کاری سۆز دەربڕین یا هەوڵی دیبلۆماسی نەبوو. کەمجار لایەنێك لە پێکدادانێکدا ئاوا بە ڕوونی بەرپرسیار دەبێت و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئاوا بە خێرایی، یەك ڕیز، ڕادەوەستن. لە هەمان ڕۆژی داگیرکردندا ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارێکی یەك لایی پەسەندکرد، کە کاری شەڕەنگێزی مەحکوم کرد و داوای کرد ( کە عێراق کتوپڕ و بێ هیچ مەرجێك بێتە دەرەوە. ) چەند ڕۆژێك دوای ئەوەش ئەنجومەنی ئاسایش بە تێکڕا دەنگی لەسەر قەدەغەکردنی بازرگانی لەگەڵ عێراقدا دا. پێشەوا عەرەبەکان بە کۆمەڵ لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە هێز بنێرن بۆ پاراستنی عەرەبی سعودی، ویلایەتە یەکگرتووەکان و یەکیەتی سۆڤێتیش داوایان لە هێزەکانی عێراق دەکرد کە واز لە کوەیت بهێنن. لە کۆتاییدا، لە ٢٩ ی نۆڤەمبەردا، ئەنجومەنی ئاسایش بۆ دەرکردنی سوپاکەی سەدام بڕیاری بەکارهێنانی هێزی دا، هەر چۆنێك بێت، لەوە نەدەچوو هیچ شتێك لەمانە تۆسقاڵێك کاری کردبێتە سەر سەدام ، بە پێچەوانەوە هەموو ئەو هەوڵانەی ڕەت کردەوە، کە دەیانویست کێشەکەی لەگەڵ کوەیتدا

چارەسەر بکرێ و ئابڕووی خۆشی بپارێزێت. لە جیاتی ئەوە بە ئاشکرا بانگەشەی بۆ جەنگی ( دایکی جەنگەکان ) دەکرد، ئەگەر بێتو رۆژئاوا نیازی دەستێوەردانی هەبوو. ئەمانە هەمووی لە کاتێکدا بوو کە پێشەوا عەرەبەکان چاوەڕێی کاری وایان نەدەکرد. سەدام بە شا فەهدی وتبوو: ( براکەم گوێ مەدەرێ، ئەمە کارێکی گەورە نابێت ). کاتێك کەسانی تر سەدامیان لە ئاستی قین لە دڵی ئەمریکا وریا دەکردەوە، بەڵام ئەو گوێی بە هیچ نەدەدا و لە خەیاڵدا دەژیا. لێرەوە حوسنی موبارەك دەڵێت: ( وەك بە مانگ بوەرم وا بوو. ) سەرۆکی سوریا، حافز ئەسەد وتوویەتی: ( ئەم پیاوە شێتە، هەر لەبەر ئەوەی دژی ئێران شەڕی کردووە، لای وایە دەتوانێت ئیسرائیل و ئەمریکا بخاتەژێر مەترسییەوە! نازانێ هێزی سەربازی راستەقینە مانای چییە؟! )

هەروەك چۆن شەڕی ئێران – عێراق، هەڵسوکەوتی سەدام لە جەنگی کەنداودا نامرۆیانە بوو، هیچ جیاوازییەکی لە نێوان سەرباز و سڤیلدا نەدەکرد. بە هەمان شێوە ٧٠٠٠ پیاوی موخابەرات و ٤٣٠٠٠ سەربازی نیزامی بەرەلای کوەیت کرد و دەستیان بە تالان کردنی پایتەخت کرد. سەنتەری گرتن و ئەشکەنجەدانیان دامەزراند و کۆمیتەکانیان لەسەر شەقامەکان دانا. ( راپۆرتی میری ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٩٢ دا حسابی کوشتن و ئەشکەنجەدان تا مردن، لە کاتی داگیر کردنی کوەیتدا، بە زیاتر لە هەزار کوەیتی دەخەملێنێ. لە هەمان کاتدا، عەمیلەکانی سەدام خەڵکی شارەکەیان کۆنترۆڵ دەکرد و بە هەزاران مەدەنییان ڕاپێچ دەکرد و دەیان ناردن بۆ بەندیخانەکانی ناو عێراق. وەك لە راپۆرتێکی بڵاوکراوەی وەزارەتی دەرەوە لە ساڵی ١٩٩٣ دا ئاماژەی پێ داوە، هێزەکانی عێراق لە کوەیت دژی سڤیلە کوەیتیەکان بەرپرسی ئەم تاوانەن. ( لێدانی شۆکی کارەبا لە شوێنە هەستیارەکانی لەش وەك ( لووت، دەم و ئۆرگانی زاوزێ، مەکینەی هەڵکۆڵینی کارەبا بۆ کوونکردنی سنگ و قاچ و قۆڵ بەکار

هاتووە. قوربانییەکان هەتا ئێسك شکاندن لەبەر لێداندا بوون، کەللەسەریان تێکشکاندوون و دەموچاویان تێکداون. چەند قوربانییەك بە حەمامی ئەسید کوژراون. سەد و پەنجاو سێ منالی تەمەن یەك سالْ بۆ سیانزە سالْ، بەهۆی جیاوازەوە کوژراون. ٥٧ ناهۆشیار هەر لەبەر هۆی کەمئەندامی لەناوبراون. ) ئەمە دەقی ئەو راپۆرتە ترسناکەیە کە ئیدارەی بۆشی یەکەم نەیدەویست بلاْوی بکاتەوە، نەوەك بکەونە بەرپرسیاری ئەوەی کە بۆچی دوای ئۆپەراسیۆنی گەردەلوولی بیابان ئەم ئیدارەیە سەدامی لەسەر حوکم لانەبرد؟ )

هەر وەك حالْەتی ئێرانییەکان بە سەدان دیلی جەنگی کوەیتیش بە تەواوی سەرنگووم کران. بڕیاری یەك کالاْ کردنەوەی ژمارە٦٨٦ ی نەتەوە یەککگرتووەکان کە لە ٢ ی مانگی مارتی ١٩٩١ دا بڕیاری لەسەر درا وەك بەشێك لە مەرجی ڕاگرتنی شەڕ جەختی لەسەر کردۆتەوە و داوا لە عێراق دەکات ( دەست بەجێ بۆ کار بەردانی هەموو دیلەکانی جەنگ بە سەرپەرشتی کۆمیتەی نێودەولْەتی سەر بە خاچی سوور بکرێ. ) لە شوباتی ١٩٩٣دا، حکومەتی کوەیتی لەو بارەیەوە دۆکۆمێنتی تەسلیم بەم کۆمیتەیە کرد. بەشێك لەم دۆکۆمێنتانە لای عێراقییەکان بووە و دەستی بەسەردا گیراوە و بە وردی باسی گرتن و ڕاگواستنی کوەیتییەکان دەکات لە لایەن عێراقییەکانەوە. وا پیشاندراوە کە عێراقیەکان ٦٠٥ دیلی جەنگی کوەیتی بردووە و تا ئێستەش چارەنووسیان دیار نییە. لەوانە لە سێ بەش دوو بەشیان مەدەنین و یان لە مالْی خۆیاندا یان لەسەرجادە گیراون. حەوتیان ئافرەتە و بیست و چواریان بە تەمەنن و سەد و بیست و چواریان قوتابی بوون. بەغدا هەتا ئێستەش ئینکاری لە بوونیان دەکات.

لە نێوان دیلەکانی جەنگدا، ئەمریکیش هەبوون. پاسەوانە عێراقیەکان بە شێوەیەکی ڕۆتینی دارکاری دیلە جەنگییە ئەمریکییەکانیان دەکرد و تفیان لێدەکردن و ناچاریان دەکردن کە میز بە بەیداخی ئەمریکیدا بکەن. سەیری

کۆئەندامی زاوزێیان دەکردن تا بزانن جوولەکەن یان نا. بۆ ئەوەی هەڵسوکەوتی سەدامان لە کاتی جەنگدا، لە رووی پەیوەندییە گشتییەکانەوە لە یاد نەچێت: سەدام سەردانی خێزانە بە بارمتە گیراوەکانی کرد و لە منداڵێکی رۆژئاوایی پرسی: تۆش شیر و کۆرن فلێکست دەست دەکەوێت؟ دیکتاتۆری عێراق بە هەزاران بارمتەی بیانی گرتبوو، لەوانە ئەمریکی مەدەنیشیان تێدابوو، بۆ ئەوەی وەك قەڵغانی شەڕ بەکاریان بهێنێت.

هەڵسوکەوتی نایاسایی عێراق لە کوەیت، باڵیشی بەسەر ژینگەشدا کێشا. بەپێی راپۆرتێکی ئاژانسی پاراستنی ژینگە، سەدام حوسێن بە رۆتینی ئاگری بەردەدایە بیرەنەوتەکان یان لەکاری دەخستن، ئەم کارە ٧٩٤ بیری گرتەوە. لە کاتی هەڵهاتنی لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٩١ دا، ئاگری بەردایە ٦١٠ بیرەنەوت. لە مانگی حوزەیراندا، رۆژانە نزیکەی دوو ملیۆن تەن گازی دووانە ئۆکسیدی کاربۆن بە ئاسماندا هەڵدەچوو. دوای تەواو بوونی جەنگ لە راپۆرتێکی گۆڤاری تایمدا هاتبوو: ( سروت وەك بەفر دەهاتەخوارەوە و دەنووسان بە جامی ئۆتۆمبیل و جلوبەرگەوە. لە ئاسمانەوە بارانی رەشی چەور دەباری، ئاویش پارچە چینێکی تەنکی نەوتاوی بە رووی کەنارەکانی کەنداودا دەدا. کەنارەکان پۆخڵ بوو بوون. ) بۆ ئەوەی کارەکە زیاتر بۆگەن بکات، سەدام بە شێوەیەك دەزگەی بەرهەمهێنانی نەوتی کوەیتی تێکشکاند، کە نزیکەی هەشت ملیۆن بەرمیل نەوت رژایە کەنداوی فارسەوە. لە ئاکامی پۆخڵی ئەم کارەدا، هەزاران باڵندەی ناو ئاو، کیسەڵ و جانەوەری ئاوی کەنارەکانی کەنداو لەناوچوون. هەروەها گۆمە ئاوەکانی خۆی و چەم و جۆگەکانی دەڤەرەکەی ژەهراوی کرد. بۆ دەرك کردنی رادەی کاولکردن، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان راستەوخۆ بەرپرسیارێتی خستەسەر عێراق. بریاری یەکلایی ئەنجومەن، ژمارە ٦٨٧ لە ٣ ی مانگی نیساندا دەڵێت: ( بە پێی یاسای نێودەوڵەتی زیانی راستەوخۆ، لە ئاکامی

**داگیرکردنی نایاسایی کوەیتدا، عێراق بەرپرسیاری تێکدانی ژینگە و لە ناوبردنی سەرچاوە ناتۆرییەکانە. ) پێویست بە باسکردن ناکات، سەدام هێشتا زەرەری نەبژاردووە و ژینگەش هێشتا نەهاتۆتەوە سەرخۆی. کوەیت تەنها دەوڵەت نەبوو کە سەدام لە کاتی جەنگی کەنداودا هێرشی بردەسەر. دیکتاتۆری عێراق، بەحرەین و عەرەبی سعودی و ئیسرائیلی دایەبەر مووشەك. لە راستیدا، دەوڵەتی جوولەکە نزیکەی ۳۹ مووشەکی بەخۆیەوە دی. هەرچەندە ئیسرائیل ئەندامی ئەو هاوپەیمانێتیەش نەبوو کە دژی بەغدا یەکیان گرتبوو، ئیدارەی بۆش قایلی کردبوون کە بەشداربوونیان دەبێتەهۆی تێکدانی هاوپەیمانێتی لەگەڵ عەرەب. هەر لەبەر هەمان هۆ ئیسرائیل تۆڵەی ئەم مووشەك بارانەی نەکردەوە. ئەم بۆردوومانەی کە تووشی هات بە هیچ جۆرێك مەتەڵ نەبوو، هەرچەندە عێراق سنووری لەگەڵ ئیسرائیلدا نییە، بەڵام بەشداری هەموو جەنگەکانی عەرەب – ئیسرائیلی کردووە. بەهەمان شێوەی رژێمەکانی تری عەرەب، سەدامیش ئیسرائیلی بەکاردەهێنا بۆ چاوبەخستن لە سەرنەکەوتنەکانی[٨] لە ناوخۆ دا. ئایدۆلۆژی شێوەی حوکمی سەدام واتە ( بەعسیزم ) رزگار کردنی فەلەستین دەگرێتەوە. وای دەخەنە بەرچاو کە مشتومڕی عەرەب – ئیسرائیل، بەرپرسیاری بوون و نەبوونە. سەدام لە ئاستی خۆیەوە بەتوندی جوولەکەی داگیرکەری مەحکوم دەکرد و بە ( شێرپەنجەی ناو فەلەستینی لەقەڵەم دەدان کە دەبێت فرێبدرێت. )**

**جیاواز لە هاوپێشەوا عەرەبەکان، سەدام ئەمەی بە راست بوو. بە یاریدەدانی فەرەنسی، زۆر بەسەر هاتنە سەر حوکمیدا تێنەپەری بوو، دەستی کرد بە بونیادنانی کارگەی هێزی ناوکی. مەبەستیشی لەمە ئاشکرابوو. ( دەبێت وڵاتە بیانییەکان یارمەتی عەرەبەکان بدەن بۆ بەدەستهێنانی بۆمبای ناوکی لە پێناو روو بە روو بوونەوەی بۆمبای ئیسرائیلی دا. ) ئەمە وتەی سەدام بوو لە**

ساڵی ١٩٨١ دا. کاتێ کە هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی کارگەی ئوسیراکی ناوکی لە هەمان ساڵدا کاول کرد. دیکتاتۆری عێراق هەڕەشەی توندی لە ڕووخاندنی دەوڵەتی جوولەکە دەکرد. لە وتەیەکی ساڵی ١٩٩١ دا، کە هەڕەشەی لە ئیسرائیل بە چەکی کیمیایی دەکرد، وتی: ( سوێند بە خوا، ئەگەر ئیسرائیل هەر شتێك دژی عێراق بکات، کارێك دەکەین کە نیوەی ئیسرائیل بسووتێ. ) بەڵام قەت ئەوەی نەکرد. تەنها لە کاتی جەنگی کەنداودا مووشەکی بە دەوڵەتی جوولەکەوە دەنا، بە هیوای ئەوەی ئیسرائیل بخاتەناو گۆڵمەزەکەوە تا هاوپەیمانی عەرەب و ئەمریکا شکست پێ بهێنێ. بە هەزار حاڵ بەرگری لە کارەساتێکی مەزن کرا، کاتێ بە قسەی پشکێنەری چەك ریچارد باتلەر، عێراق مووشەکێکی بە کارگەی ناوکی دیمۆنەی ئیسرائیلەوە نا، بەڵام شەڕی سەدام دژی ئیسرائیل تا ئەمرۆش هەر بەردەوامە. هەر لە ساڵەکانی گەردەلوولی بیابانەوە تا ئێستە، بەرپرسە عێراقییەکان باس لەوە دەکەن کە چەکی بایۆلۆژیان هەیە و دژی ئیسرائیل بەکاریدەهێنن. عودەی کوڕی سەدام بە خۆهەڵکێشانەوە وتی: ( بەغدا خاوەنی چەکی کاول کردنی بەرفراوانە، بەمەبەستی ڕازی کردنی خودا و گەڕانەوەی مافەکانی عەرەب لە فەلەستیندا، دەبێت کیانی زایۆنیست لەناو بچێت. ) سەدام بەردەوام جنێوی ناشرینی دەدا. ڕێکەوتننامەی ئاشتی عەرەب – ئیسرائیل هیچ کاری نەدەکردە سەر هەڵوێستی بەغدا، جاروبار میدیاکەی هانی کوشتنی ( خائین ) یاسر عەرەفاتی دەدا، بە هەمان شێوەی کوشتنی سەرۆکی پێشووی میسر ئەنوەر سادات. لە نێوان ئەو تاکتیکە تازانەی کە سەدام لەم دواییانەدا خستنیەگەڕ دژی پرۆسەی ئاشتی، لەم ڕووەشەوە پشتگیریکردنی خێزانەکانی ئەو کەسانە بوون کە خۆیان دەتەقاندەوە. ئەمەش لە لیستی پارە بەخشینی سەدامدا هاتووە: کە خێزانی ئەو چەکدارەی لە هێرشی دژی ئیسرائیلدا دەکوژرێت ( ١٠٠٠٠ ) دۆلار وەردەگرێت، بەڵام ئەوەی خۆی دەتەقێنێتەوە ( ٢٥٠٠٠ ) دۆلا

وەردەگرێت. بە وردی چ جۆرە خۆتەقێنەرەوەیەك ئەم برە پارەیە وەردەگرێت بۆتە هۆی ڕێککەوتن. عێراق وای داناوە کە تەنها ئەو کەسانە خۆیان بە پشتوێن دەتەقێننەوە، بە تەواوی ئەم پارەیە وەردەگرێت. بەپێی ڕۆژنامەی دەیلی تەلەگراف لەندەنی: ( ئەمە بوو بەهۆی تووڕە بوونی دایك و باوکی شەش گەنج کە چوونە شاری ( ئەفوله )ی نزیك خۆیان و دەستیان کرد بە تەقەکردن، بەڵام لە ئەنجامدا هەر خۆیان کوژران و تەنها برە پارەی شەهیدی ئاساییان بەرکەوت. )

ئیسرائیل تەنها وڵات نەبوو کە دەکەوتەبەر شاڵاوی شەڕانگێزی تایبەتی سەدام، بەڵکو وڵاتە یەککرتووەکانیش کەوتەبەر کاریگەری کاری تیرۆریستی ئەو کەسانەی کە عێراق بەخێوی دەکردن. لە هەمان کاتدا بە پێچەوانەی ئەوانەی دوودڵ بوون، بەڵگەی پەیوەندی نێوان سەدام و قائیدە لەو چاوپێکەوتنە نائاشکرایانە تێدەپەڕی کە نێردراوەکانی هەر دوولا لە پایتەختی کۆماری چیك – واتە پراگ – سازیان کردووە پێش ڕووداوەکانی یانزەی ئەیلول. فەرمییە ئەمریکییەکان دۆکۆمێنتیان لەسەر پەیوەندی عێراقییەکان لەگەڵ عەمیلەکانی قائیدەدا هەیە ، شان بە شانی ئەمەش ( بەڵگەی پتەو هەیە کە ئەندامی قاعیدە لەناو عێراقن و هەندێکیان لەناو بەغدان. ) ئەمەش بەڕێوەبەری ( CIA ) جۆرج تێنێت داکۆکی لەسەر کردووە. لە سێ ساڵی رابردوودا، باندێکی توندڕەوی ئیسلامی کە پێیان دەوترێت ئەنسار ئیسلام، لەژێر فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکانی هەواڵگری عێراقدا بوون، هەستاون بە هەڵمەتی تیرۆر دژی پێشەوا کوردەکان. بەپێی ڕاپۆرتێکی ( تایم ) ئەم گرۆپە لەلایەن قاعیدەوە مەشقیان پێکراوە و دوای شەڕی تۆرابۆرا ئەفغانستانیان بەجێهێشتووە و گەڕاونەتەوە بۆ عێراق. لە ئەنجامدا، فەرمییە ئەمریکییەکان باوەڕیان وایە کە سەدان کادری قاعیدە لە عێراقدا کاردەکەن. معقولیش نییە سەدام لە ئاستی ئەمانە چاوی نەبینێت. وەك وەزیری بەرگری دۆناڵد رامسفیلد دەڵێت: ( دەوڵەتێکی چەوسێنەری

دیکتاتۆری کە نزیکەی هەموو هاوڵاتییەکانی خۆی خستۆتە ژێر کۆنترۆڵەوە، چۆن دەبێت ئاگای لەوە نەبێت چی لە وڵاتەکەیدا روودەدات!؟ )

لەراستیدا، فاروق حجازی، باڵیۆزی عێراق لە تورکیاو کەسی نزیکی سەدام، لە ساڵی ١٩٩٨دا، سەردانی شاری قەندەهاری لە ئەفغانستان کردووە، لەوێ چاوی بە ئوسامە بن لادن کەوتووە و داوای لێ کردووە کە ببێت بە پەناهەندە لە عێراق. کاتێك بن لادن لە سوودان بوو، سەدام پارەی بۆ خۆی و رژێمە ئیسلامییە توندڕەوەکەی ئەو وڵاتەی دەنارد. ستانلی بێدلینگتۆن، گەورە بەرپرسیاری ( CIA ) دەڵێت: ( ئێمە لەوە دڵنیایین کە عێراق پارەی بۆ بن لادن دەنارد و ئەویش دەیگەیاندە ئەو شوێنانەی کە بۆی دەچن. ) بێدلینگتۆن، هەواڵی زانیوە کە یەکێك لەو شوێنانەی پارەی بۆ دەچوو جەزائیر بوو. ئەو وڵاتەی کە عێراق لە رێی بن لادنەوە، پارەی دەدا بە تیرۆریستە ئیسلامییەکان بۆ لابردنی حکومەتی جەزائیر. لە ئۆکتۆبەری ساڵی ٢٠٠٢ دا، ، بە پێی راپۆرتێکی باوەڕ پێکراو جۆرج تێنێت ئەوەی ئاشکرا کردووە کە ( کە عێراق مەشقی بە ئەندامانی قاعیدە کردووە لەسەر ژەهرەکان و گازەکان بۆ دروستکردنی بۆمبای ئاسایی )

رەنگە ئێمە هەرگیز بە تەواوی نەزانین کە پەیوەندی سەدام و بن لادن تاچی ئەندازەیەك بووە، بەڵام ئەوە دەزانین کە سەدام تیرۆریستە. ئۆپەراسیۆنی سەدام بوو لە ساڵی ١٩٩٣دا، نەك بن لادن، کە هەوڵی کوشتنی سەرۆکی پێشوو جۆرج بۆشی دا. لە ١٤ ی نیسانی هەمان ساڵدا، دوو کەسی بە رەگەز عێراقی، رەعد ئەلئەسەدی و وەلی ئەلغەزالی، پلانیان بۆ کوشتنی بۆش لە کاتی سەردانەکەی کوەیتیدا دانا بوو. کوەیتییەکان ئەم جووتەیان گرت و تەسلیمی ( FBI )یان کردن. لە وەڵامدانەوەی پرسیارکردندا، دانیان بەوەدا نا کە پیاوەکانی هەواڵگری عێراق ئۆتۆمبیلێکی بۆمب ڕێژکراویان پێداون بۆ ئەوەی سەرۆکی پێ بکوژن. لە راستیدا بەڵگەکان ئەوەندە پتەو بوون کە ئیدارەی کلینتۆن قایل بکەن بۆ

ئەوەی بە هێرشی ساروخی بۆ سەر دەزگەی هەواڵگری وەڵامیان بداتەوە. هەر لە ساڵی ١٩٩٣ دا بوو، کە هەوڵی یەکەم درا بۆ کاول کردنی سەنتەری بازرگانی جیهانی و لە راستیتیشدا ئەوە رووشی دا. پێشڕەوی گروپەکە، رەمزی یوسف بوو، کە بە پاسپۆرتی عێراقی تەزویرەوە گەیشتە نیویۆرك، بە هەمان شێوەش ناسنامەکەشی تەزویر بوو. شارەزاکانی توێژینەوە باوەڕیان وا بوو، کە عێراقییەکان لە ساڵانی ١٩٩٠ – ١٩٩١ دا لە کوەیت تەزویریان کرد بوو. گومان لێکراوێکی تری ئەم سەنتەرە عەبدول یاسین بوو، کە باوەڕ وایە دوای بۆمبا رێژەکە، رایکردووە بۆ عێراق و هێشتا لەوێ خۆی شاردۆتەوە.

لەوانەیە گرنگترین بەڵگەی قایلکەر کە عێراق سەرقاڵی کاری تیرۆریزم بوو، ئەوەیە کە ئەم وڵاتە بووە بە خانەخوێی تیرۆریستە بەناوبانگەکان. مردنی تیرۆریستی نەگریس ئەبو نیزاڵ لە بەغدا، بوو بە بیرهێنەرەوەیەکی بە کەڵك کە عێراق بۆتە دوا پەناگەی کۆمەڵگەی تیرۆریستی نێودەوڵەتی. هەروەك وتەبێژی کۆشکی سپی، لە کاتی بڵاوبوونەوەی باسی مردنی دا، ئاماژەی پێ دا. ( ئەو راستیەی کە عێراق پەنای تیرۆریستی وەك ئەبو نیزاڵ دەدا، ئەوە دەگەیەنێت تاچ رادەیەك ئەم رژێمە ئاوێنەی تیرۆری جیهانیە. جگە لە تیرۆریستە ناسراوەکانی وەك ئەبو نیزاڵ، سەدام میوانداری وڵاتەکەی خستە بەردەم تێکەڵەی زۆربەی زۆری رێکخراوە تیرۆریستییەکان. بە پێی تازەترین راپۆرتی تیرۆریزمی سەر بە وەزارەتی دەرەوە، ساڵی رابردوو ( عێراق بنکەی بۆ چەند گروپێکی تیرۆریستی سازکردووە لەوانە: موجاهیدینی خەلق ( MEK )، پارتی کرێکارنی کوردستان ( PKK )، جەبهەی ڕزگارکردنی فەلەستین( PLEP ) و رێکخراوەکەی ئەبو نیزاڵ ناسراو بە ( ANO ).

لەساڵی ٢٠٠١ دا، جەبهەی شەعبی رزگاریخوازی فەلەستین، پرۆفایلی خۆی بەرزتر کردەوە لە قەراغی رۆژئاوا و غەزەدا کاری تیرۆریستی سەرکەوتوویان

دژی ئیسرائیل ئەنجامدا. بۆ ئەمەش، رژێمی عێراق پاداشتی ئاشکرای ( PLEP ) کرد و لەلایەن کەسایەتی وەك جێگری سەرۆك، جێگری سەرۆك وەزیرانەوە پێشوازییان لیّ کرا. هەروەها حەماس، کەڵکی لە بەخشندەیی سەدام وەرگرت، وا دەرکەوت کە مەشقی چەك و خۆتەقاندنەوەیان لە کامپی عێراقی تایبەت بە تیرۆریست لە سەلمان پاك پێکراون.

ئەو کامپە قوتابخانەی تیرۆریستانە، پۆلی تێدایە بۆ کوشتن، ڕفاندنی فڕۆکە و خەڵك لەگەڵ پیلان گێڕاندا. عێراقییەکی پلەبەرزی هەڵهاتوو بە نیویۆرك تایمزی وتووە: ( مەشق بە خەڵکی دەکەین بۆ ئەوەی پەلاماری دەزگە گرنگەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بدەن. ) سەلمان پاك بە باشی بەو فڕۆکە ( بۆینگە ٧٠٧ )ە ناسراوە، کە لە ئەرزی کامپەکەدا ڕاوەستاوە و میدیای رۆژئاوا ئاگاداری مەشقکردنی سەر ئەم فڕۆکەیەیە. هەڵهاتوویەکی زۆر وەسفی ئەم فڕۆکەیەیان وەك قوتابخانەیەکی تیرۆریستان کردووە، لە نێوانیاندا ئیسلامە توندڕۆکانی پانتایی جیهانی عەرەب، بۆ چۆنێتی دەستگرتن بەسەر فڕۆکەی بازرگانیدا. هەڵهاتوویەکی تر بە گۆڤاری هەفتەیی تێکنۆلۆژی فرین و بۆشایی ( فەزا ) ی ڕاگەیاندووە کە تەنانەت ( مەشق لەسەر نان خواردن بە چەقۆ و چەتاڵ دەکرێت. فێری ئەوەش کراون چۆن سەرنشینەکانی ناو فڕۆکەکە بتۆقێنن. ) چیرۆکەکانی سەر بە فڕۆکەی ٧٠٧ ی ئەم کامپە لەلایەن خەڵکی ترەوە و لەم ساڵانەی دواییدا باسکراوە. لەوانە جێگری سەرۆکی دەستەپشکنەرەکانی چەك لە عێراق، چارلس دوفلەر کە چەند جارێك ئەم فڕۆکەیەی لە هەمان شوێندا وەك هەڵهاتووەکان وەسفیان کردووە، بینویەتی. وێنەکێشی بۆشایی، کە فێرمایەکی [*]سەتەلایتی بازرگانییە، لە ٢٥ ی نیسانی ٢٠٠٥ دا وێنەی ئەم فڕۆکەیەی لە هەمان شوێنی باسکراودا گرتووە. لە

[*] فێرما: وشەیەکی ئەڵمانییە بە واتای ( کۆمپانیا ) دێت. وەرگێڕ

پاڵ لیستی تۆمارکراوی کاری شەڕەنگێزی و تیرۆری سەدامدا هیچ کام لەمانە نابنە هۆی سەرسوڕمان.

## بەشی سێیەم
## چەکی کۆمەڵکوژ
## Weapons of Mass Destruction

دیکتاتۆرێك کە خەڵکی وڵاتەکەی خۆی بکوژێت، ڕەنگە کاری ئەمریکا نەبێت. دیکتاتۆرێك هەڕەشە لە دراوسێکانی بکات، ڕەنگە کاری ئەمریکا نەبێت. تەنانەت ئەگەر دیکتاتۆرێك پشتگیری تیرۆریزم بکات، ڕەنگە کاری ئەمریکا نەبێت. بەڵام ئەگەر دیکتاتۆرێك هەموو ئەم کارانە بکات، نەك هەر خاوەنی چەکی کۆمەڵکوژ بێت، بەڵکو بەکاریشی بهێنێت. ئەوا بە دڵنیاییەوە کاری ئەمریکایە و دەبێت تەمێیی بکات. بیل کلینتۆن لە وریاکردنەوەیەکی هاکەزاییدا، لە ساڵی ١٩٩٨ دا دەڵێت: ( دڕندەکانی سەدەی بیست و یەکەم زەرەر بەخش تر دەبن، ئەگەر ڕێگەیان بدەین جبەخانەی چەکی ناوکی و کیمیایی و بایۆلۆژی لەگەڵ راکێتی راگەیاندنەکەیاندا بنیات بنێن ، نموونەیەکی ئاشکراتر نییە لە عێراقی سەدام حوسێن، لە ئاستی ئەم مەترسییەدا. )

سەدام حوسێن زۆر بە دەگمەن گوێی داوەتە شاردنەوەی ئەو مەترسییەی کە دەکەوێتە ڕوو. لە ڕاستیدا، لەوە دەچێت شانازیکردن بە هێزی کاولکردنەوە هێمای گەوهەری حوکمەکەی بێت. لە ڕابردوودا، بە دەگمەن ڕژێمێك باسی جبەخانە نایاساییەکەی بە وردی کردووە لەگەڵ سوپای بێ پایان بۆ پرۆگرامی

چەك بشكنینی سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان، واتە ( UNSCOM ) كە بۆ تۆماركردن و تێكدانی جبەخانە نایاساییەكەی عێراق، دوا بە دوای كۆتایی هاتنی جەنگی كەنداو پێك هات. بە دەگمەن وردە بابەتی ئەم جبەخانەیە، كراون بە دۆكۆمێنت و بڵاوكراونەتەوە. هەوڵدانی عێراق بۆ بەدەست هێنانی چەكی كۆمەڵكوژ، كۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ پێش جەنگی كەنداو، ئێران و كوردی لێقەوما و شایەتی ئەم راستیەن. بەپێی راپۆرتی كۆتایی( UNSCOM )، كە لە كانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۹۹ دا خراوەتە بەردەم ئەنجومەنی ئاسایش، عێراق لە ساڵانی ۱۹۷۳ یان ۱۹۷٤ دا دەستی كردووە بە هەوڵدان بۆ گەشەپێدانی چەكی بایۆلۆژی، كە لەو كاتەدا سەدام هێشتا جێگری سەرۆك بوو. عێراق خۆی دانی بەوەدا ناوە كە لە ساڵی ۱۹۷٤ ەوە بۆ ساڵی ۱۹۷۸ توێژینەوەی لەسەر مایكرۆ ئۆرگانیزم واتە ( مێكرۆب بۆ كاروباری سەربازی ) ئەنجامداوە. لە ناوەراستی ساڵانی ۱۹۷۰ دا بە هەمان شێوە هەڵمەتی برەودان و بە دەست هێنانی چەكی كیمیایی دەست پێ كردووە. كارگەی چەكی كیمیاییان بنیاد ناوە و مادە خاوە زەرووەكانیان بۆ ئەم چەكانە دابین كردووە و پێكهاتە كیمیاوییەكانیان لەسەرچاوە باوەڕ پێ كراوەكانەوە وەك ئەڵمانیا و فەرەنسا، دابین كردووە.

هەروەها فەرەنسا لە دروستكردنی كارگەی ناوكی لە ئۆسیراكدا، یارمەتی سەدامی داوە. ئیسرائیلییەكان لە ترسی ئەوەی رۆژێك ئەم دەزگەیە چەكی ناوكی لێ دروست بكرێت و دژی ئەوان بەكاربهێنرێت، لە ساڵی ۱۹۸۱دا هێرشێكی هەواییان كردەسەر و كاولیان كرد. ( لە ئاكامی ئەمەدا لە هەموو لایەكی جیهانەوە كەوتنەبەر شالاوی مەحكومكردن. ) لەدوای ئەوە سەدام خوویدایە سەرچاوەی تری چەكی كۆمەڵكوژ. بە لێشاو پارەی خەرج دەكرد، بە بەهای دەیان بلیۆن دۆلار كەرەستەی سەربازی لە ئەوروپاییەكان دەكڕی، كۆمپانیای رووكەشی بۆ دروستكردنی وردەواتی چەك بەرهەمهێنانی دادەمەزراند و گوری بە

توێژینەوەکانی ناوخۆی عێراق دەدا. لە میانەی ساڵەکانی ۱۹۸۰دا، عێراق گەورەترین کڕیاری چەك بوو لە هەموو جیهاندا. بە پێی راپۆرتی نەتەوە یەکگرتووەکان، عێراق ۸۱۹ مووشەکی مەودا دووری مەیدانی هێناوە و لە دوایشدا دەستکاری نیوەی زیاتری کردوون، بۆ ئەوەی نیشانەی دوور بپێکن. لەناو دەزگە دەوڵەتییەکانی بەرهەم هێنانی دەرمانی لە ناوبردنی مێش و مەگەز، وا رێککەوت کە بەشی بەڕێوەبەراتیەکان هەر لە هەمان سەلمان پاك بێت، کە تیرۆریستەکان مەشقیان لێ دەکرد.لەم کارانەوە مادەی زۆری بایۆلۆژی دابینکرد. بە پێی قسەی ژەنەڕاڵ نزار، زانیاری کەمی لەم بارەیەوە بە نەتەوە یەکگرتووەکان وتووە. سەدام بۆ خۆی سەرۆکی بەشی توێژینەوە و پرۆگرامی گەشەپێدانی بایۆلۆژی بووە. عێراق پلانی ئەوەی هەبووە لە ساڵی ۱۹۸٦ دا چەك لەم ماددە کوشندانە دروست بکات: ( Anthrax , Botulinm Brucellosis , , Tularemia). تاقیکردنەوەی مەیدانی ماددەکانی چەکسازی بایۆلۆژی لە کۆتایی ساڵی ۱۹۸۷ و سەرەتای ساڵی ۱۹۸۸دەستی پێ کردەوە و لە ساڵی ۱۹۸۹ دا ماددەکانی بایۆلۆژی لە بواری ( بۆمبای هەوایی ، ڕۆکێت و زەخیرەی تر ) تاقی کرانەوە. لە نێوان ئەو شتانەی تر کە پشکنەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دۆزیویانەتەوە، رژێم ئەم ماددانەی سازکردووە بۆ ( بڵاوکردنەوەی لە هەوادا و دیراسەکردنی )، ژەهریان بەسەر مەیموون و ئاژەڵی وردتر دا بڵاوکردۆتەوە. بە کۆتایی ئەو دە ساڵە، عێراق بوو بەخاوەنی دووسەد هەزار ( زەخیرەی تایبەت)،لەمانە سەد هەزاریان بە مادەی کیمیایی یان بایۆلۆژی پاك کرابوونەوە.

لە ئاستی مەیدانی ناوکیدا، بۆ ئۆنسکۆم دەرکەوت کە بە درێژایی ساڵانی ۱۹۹۰ لە کۆکردنەوەی کەرەستەی دروستکردنی بومبادا بەردەوام بووە. بەپێی(داڤید. کەی) کە دوای جەنگی کەنداو سەرپەرشتیاری پشکنینی چەك بوو.( بەغداد، راستەوخۆ دوای هێرشەکەی ئوسیراك، بە پەلە هەوڵیداوە بۆ بە دەست

هێنانی چەکی ناوکی. وەك ( کەی ) نووسیویەتی: لە کاتی جەنگی کەنداو دا عێراق ستۆکێکی بەرچاوی یۆرانیۆمی پیتێندراو لەگەڵ ( دیزاین و کەرەستەی تاقیکردنەوە و مەوادی دروستکردنی دەزگەی بەرهەمهێنانی بۆمبی راستەقینە )ی هەبوو، بڕیاریش درا بوو کە زیاتر لە بیست هەزار کەرەستە لە پرۆگرامی چەکی ناوکی نهێنیدا دامەزرێنن. ئەمەش لە خۆیدا راستیەکی سەیرە کە ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی ( IAEA ) کە چاودێری پرۆگرامی ناوکی عێراقی پێسپێردرا بوو، هیچ ئاگادار نەبوو، کە پرۆگرامە زەبەلاحەکە لە ئارادایە.

لە ١٨ ی نیسانی ١٩٩١ دا وەك بەشێك لە ڕێکەوتنی ئاگربەستی جەنگی کەنداو، عێراق وردە بابەتی دەربارەی چەندایەتی و چۆنایەتی مووشەکەکانی و پرۆگرامی چەکی بایۆلۆژی و کیمیایی تەسلیم بە ( UNSCOM ) کرد. بە پێی دانپێدانانی خۆیان، عێراق، ١٠ هەزار کلاوەی جەنگی گازی ئەعساب، ١٥٠٠ یەکەی کیمیایی، ٤١٢ تەن لە مادەکانی چەکی کیمیایی، ٢٥ مووشەکی مەودا درێژ و تانکی پڕ لە مەوادی کیمیایی کە بەفڕۆکە فڕێدەدرێتە خوارەوە، هەیە. گەلێ شتی تری هەبوو، لە ١٠ ساڵی یەکەمی پشکێنەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، عێرق بە رۆتینی ئەوەی دەردەخست کە بڕێکی کەمی لە مادە ناوکی و بایۆلۆژی و کیمیاییەکانی هەیە، بەڵام راستیەکان لەدواییدا دەرکەوتن. بۆ نموونە لە پایزی ١٩٩١دا، پشکێنەرانی چەك دە ئەوەندە زیاتر چەکی کیمیایی لە جبەخانەکانی عێراقدا وەك ئەوەی بەغدا جاری بۆ دەدا دۆزییەوە. هەر کاتێك کە پشکنەرەکان لە حەشارگەیەکی چەکی تازە نزیك دەبوونەوە، ئەوا چەواشەکردن و چاوبەستنەوە دەستی پێ دەکرد. وەك بەشێك لەو راستییانە کە لە راپۆرتێکی (UNSCOM)دا هاتووە و زۆر بابەتیشە ( لە ڕاگەیاندنی یەکەمیاندا دەیانووت پێکهاتەکانی کلاوەی جەنگی مووشەکی ئەلحوسین، کە لە ئەیلوولی ١٩٩٥دا بوو،

باسی ( Aflotoxin )ی تێدا نەبوو، دوای ئەوە عێراق وتی دوانیان بەمە پڕ کراونەتەوە، لە کۆتاییدا وتیان نەخێر چواریان !

بیرۆکراتی و کەمکردنەوە لە گرنگی راپۆرتەکانی ( UNSCOM ) باڵێکی تاریکی بەسەر رێگرتن لە پشکنەرەکانی چەك و جارِس کردنیان دەکێشا ، لە کاتێکدا کە لە راستی نزیك دەبوونەوە. پشت ئەستوور بە بڕیاری یەکلایی نەتەوە یەکگرتووەکانی ژمارە ٦٨٧، کە رێگەیان دەدا بەبێ هیچ مەرج و رێگرتنێك بگەنە هەموو وردەکارییەکی مووشەك و کیمیایی و بایۆلۆژی و پرۆگرامی ناوکی. پشکنەرانی چەکی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان لە حوزەیرانی ١٩٩١ دا گەشتنە بەغدا، لەوە دەچوو کە کتوپڕ ڕوو بە ڕووی کێشە ببنەوە. لە مانگی ئەیلوولدا، عێراقیەکان تیمێکی پشکنینیان لەبەردەرگەی دەزگەیەکی ناوکیدا حەپس کرد و دەستیان گرت بەسەر دۆکۆمێنتەکانیاندا و بۆ ماوەی چوار رۆژ ئەندامانی ئەو تیمەیان لە گەراجێکدا گلدایەوە. لە هەمان ساڵدا، سەرۆکی تیمی پشکێنەرانی چەك، داڤید کەی، لە راپۆرتێکدا ئاماژە بەوە دەکات کە: ( مادەی دۆکۆمێنتی گرنگ و ئامێر، شەوێك پێش پشکنین لە دەزگەکانی ناوکیدا دەرهێنراون و گواستراونەتەوە. ) ئەمە بوو بە دەسپێکی حەوت ساڵ لە دەستی دەستی و فڕوفێڵ و شاردنەوە لەلایەن عێراقەوە. لێرەوە رۆڵف ئیکۆس، ئەرکی یونسکۆمی بە ( هاوتای جەنگ لە کۆنترۆڵکردنی چەکدا ) وەسفکرد.

ریچارد باتلەر وای دێنێتەوە یاد: ( بیانووەکانیان بۆ لابردنی داتا و دۆکۆمێنتەکان، هەر لەو چیرۆکە ساختانە دەچوو کە منداڵێك لە ماڵەوە دەیڵێت: ( سەعیم کرد بەڵام دەفتەرەکەم سەگ خواردی. ) نموونەیەکی زەق: کچی هاورێی واتە – گێرل فرێندی – یەکێك لە کرێکارەکان لە تووڕەییدا دۆکۆمێنتەکانی دڕاند. بیانوویەکی تر دەڵێت: کابرایەکی شێتەڵۆکە، کە بەو ناوەدا دەخوولایەوە، وایەری کامێراکانی چاودێری کارگەی کیمیایی قرتاند ! چونکە وا دیارە لەبەر گەمارۆی

نەتەوە یەککگرتووەکان دەرمانی لێبڕاوە. ) لە حاڵەتێکی تردا، لە بەرچاوی تیمێکی ( UNSCOM ) دا، چاوەڕێی چوونە ژوورەوەی ساباتێکی چەك بوون، لۆری عێراقی دۆکۆمێنت و سەنەدەکانیان دوور دەخستەوە. لە شوێنێکی تردا، پشکنەرێکی چەك جانتایەکی لە دەست کارمەندێکی عێراقی سەند، کە لە دەرگەی پشتەوەی تاقیگەکەوە، دەیویست خۆی قوتار بکات. کاتێ جانتاکەی کردەوە پڕ بوو لە مادەکانی تاقیکردنەوەی ئەنتراکس و ژەهری بۆتۆلینم و ئەگەر گەورە بەرپرسانی عێراق لە ساڵی ١٩٩٥ دا هەڵنەهاتنایە، ئەوا ( UNSCOM ) هەرگیز نەدەگەیشتە باشترین دۆزینەوەیان، کە بریتی بوو لەوەی کە عێراق توانیویەتی مادەی ئەعسابی ( VX ) دروست بکات و لە چەکی ببەستێت. یان دۆزینەوەی ئەوەی کە عێراق پرۆگرامی چڕوپڕی چەکسازی بایۆلۆژی هەبووە. ئەوان نەبوونایە، ئەم کردارە نایاساییانەی عێراق هەرگیز دەرنەدەکەوتن. بەپێی دۆکۆمێنتی نەتەوە یەککگرتووەکان ( بەرزترین بڕیاری شاردنەوە، لەلایەن کۆمیتەیەکی بچووکەوە دەدرا، کەپێکهاتبوو لە چەند گەورە بەرپرسێکی باڵای ڕژێم. ئەم کۆمیتەیە سەرپەرشتی چالاکی یەکەیەکی دەکرد بۆ گواستنەوە و شاردنەوە و زامنکردنی ئەو کاڵا و ( ئایتم ) انەی کە نەیاندەویست بکەوێتە بەرچاوی کۆمسیۆنی چەك دۆزینەوە.

بێ گومان بەرپرسیارێتی سزادانی سەرپێچیەکانی عێراق دەکەوێتە ئەستۆی نەتەوە یەککگرتووەکان، بەڵام هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایش هەمان بەرژەوەندی چەك داماڵینی عێراقیان وەك ئەمریکا، نەبوو. بە تایبەتی فەرەنسا و روسیا دوور لە هاوکاریکردن بوون. هەردووکیان چەشەی بازرگانی بەرفراوان بوون لەگەڵ عێراق دا. هەردووکیان حەزیان بە شکستی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا دەکرد. ریچارد باتلەر، ئەوە دێنێتەوە یاد کاتێك لە ساڵی ١٩٩٨ دا ( UNSCOM ) پێشنیاری سەلماندنی ڕێ گرتنی عێراقیان خستە بەردەست

ئەنجومەنی ئاسایش، لەوانە وێنەی فۆتۆگرافی لۆرییەکانی گاردی کۆماری بوون، کە بەڵگەکانیان دەگواستەوە. ( باڵیۆزی فەرەنسی، ئالان دێژامێنت وای لێك دایەوە کە لەوانەیە ئەم لۆرییانە بۆ سەیران چووبێتن. ) هەروەها فەرەنسا و روسیا هەموو هەڵێکیان دەقۆستەوە بۆ ئەوەی ڕۆڵی ( UNSCOM ) کەم بکەنەوە. پێشنیارەکانی عێراقیان باش دەنرخاند بۆ ئەوەی لەگەڵ تیمەکانی پشکنینی چەکدا، چەند دیبلۆماسێك هەبن، ( لەوانەیە خەڵکی ئەم دوو وڵاتەش بن ). لە هەمان کاتدا راپۆرتەکانی ( UNSCOM ) یان ڕەت دەکردەوە و داکۆکیان لەوە دەکرد، کە پشکنەرەکان دەبێت زۆر رێز لە ( کولتوور ) بگرن و لە کۆتاییدا هەوڵەکانی ئەمریکایان راستەوخۆ محکوم دەکرد، کە دەیانوویست بەپێی بڕیاری یەککلایی ٦٨٧ سزای عێراق بدەن.

هەواڵەکان گەیشتنە بەرزترین ڕادەیان کاتێك لە نۆڤەمبەری ١٩٩٧[1]دا، سەدام فەرمانیدا ئەمریکاییەکانی ئەندام لە تیمی پشکنەری ( UNSCOM ) لە عێراق بکرێنە دەرەوە. لە وەڵامدا، سەرۆك کلینتۆن فەرمانیدا بە دامەزراندنی هێزەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کەنداوی فارس دا، لێرەوە سەدام دەستی کرد بە پاشەکشێ. لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٨ دا، گرژی ڕووی دایەوە، کاتێك سەدام رێگەی لە پشکنەرانی چەك گرت، کە بچنە ناو کۆشکەکانییەوە. کۆشکەکانی بە ژمارە زۆرن، بۆیە گومانی ئەوەیان لێدەکرا کە بووبن بە مەکۆی شاردنەوەی بەڵگەکانی پرۆگرامی چەکەکانی عێراق. روسیا و فەرەنسا هەڕەشەی ئەوەیان کرد کە هەر بڕیارێك دژی ئەم رێگە گرتنەی سەدام دەربچێت، ڕەتی دەکەنەوە. لێرەوە ویلایەتە یەکگرتووەکان جارێکی تر ئامادە باشی خۆی دەربڕی کە بە تەنیا بکەوێتە کار، بۆیە جارێکی تریش عێراق تەنازوولی کرد. لە مانگی ئابی ١٩٩٨ دا، هەر چۆنێك بێت، عێراق هەموو جۆرە هاوکارییەکی لەگەڵ پشکنەرانی چەکدا ڕاوەستاند، لە نۆڤەمبەریشدا مۆنیتەری چاودێری لابرد، کە پێشتر پشکێنرابوون.

مانگێکیش دواتر، بەبێ پشتگیری روسیا و فەرەنسا یان سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ( کوفی ئەنان )، کە لە شوباتی هەمان ساڵدا وتبووی: ( سەدام پیاوێکە کە من دەتوانم بزنسی لەگەڵدا بکەم. ) ویلایەتە یەکگرتووەکانیش لە ئاستی خۆیەوە دەستی بە هەڵمەتی ڕێوی بیابان کرد و بۆ ماوەی چوار رۆژ بنکەکانی گاردی کۆماری ناو هەموو عێراقی بە خەستی مووشەك باران کرد. لە وەڵامدا، سەدام هاتنەوەی پشکنەرە ئەمریکاییەکانی ڕەت کردەوە، کە پێشتر کردبوونیە دەرەوە و جارێکیشیدا کە وەختی پشکنینی چەك کۆتایی هاتووە. ( UNSCOM ) بەهەمان شێوە لەناوچوو.

هەر چۆنێك بێت نەتەوە یەکگرتووەکان بە تەواوی دەرگەی دانەخست. لە مانگی کانوونی دووەمدا کۆمسیۆنێکی تازەی بۆ لێ پێچینەوە و پشکنین دامەزراند بەناوی ( UNMOVIC )، کە لە ڕاستیدا ( UNSCOM ) یێکی سووکەڵە بوو. بەمەرجێ ( UNMOVIC ) چیتر پێویست نەبوو کە لە عێراقدا چەکە کۆمەڵکوژەکان لەناوبەرێت، لە مەترسی گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکاندا. وە بە ئاستەمیش ناچاری دەکرد کە هاوکاری لەگەڵ ( UNMOVIC ) دا بکات. ئەم کۆمسیۆنە بە شێوەی نەخشە بۆ دانراو کە هەرەوەزی زیاتر لەگەڵ هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بکات وەك ئەندامە رۆژئاواییەکان – بە واتای ئەوەی ڕۆڵی ئەمریکی بەرانبەر لە ناوبردنی چەکەکانی سەدام کەم بکاتەوە.

لە ژێر فشاری ئەمریکادا، ( UNMOVIC ) لە ٢٠٠٢ دا کەوتەوە گوڕ، دیسانەوە سەدام کەوتەوە بەر هەڕەشەی جەنگ و بەناچاری رێگەی بە ( UNMOVIC ) دا، کە بێتەوە لە عێراق کار بکات. هەموو هێماکان ئاماژەیان بەوە دەدا کە سەدام لەو شوێنەوە کەلە ساڵی ١٩٩٨ دا وەستاوە، دەست بە گەمەیەك بکاتەوە وەك هەڵهاتوو ( خزر حەمزە ) ناوی نابوو ( چاوشارکێ ).

تەنانەت ئەگەر پشکنەرانی چەك بەڵگەی چەکی کۆمەڵکوژیان بدۆزیبایەتەوە ئەوساکە کاردانەوە وەك جێگری پێشووی ( UNSCOM ) چارلس دوفلەر وەسفی کرد بریتی بوو لە ( سەلامی ڤاژکردن. )

پشکنەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەرچیان دۆزیبێتەوە یان نەیاندۆزیبێتەوە، ئەو راستییە ناگۆڕێت کە چەکی کۆمەڵکوژی سەدام لە ساڵی ١٩٩٨ەوە بە بێ چاودێری ماوەتەوە. بەپێی زانیارییەکانی ( UNSCOM )و ئاژانسی وزەی ئەتۆمی و ریچارد باتلەر، لەگەڵ پەخشی پرۆژەی ئاژانسی چەکی ناوکی لە ساڵی ١٩٩٨ دا. ( UNSCOM ) یش نەیتوانیوە دەست بەسەر قەبارەیەکی گەورەی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی یان کەرەستەی ناوکیدا بگرێت. تەنانەت دوای حەوت ساڵ پشکنین، هێشتا سەدام ئەوەندە کاڵای چەکسازی لای خۆی گل دابووەوە، کە بەشی سڕینەوەی هەموو رۆژهەڵاتی ناوەراست لەسەر نەخشە بکات. لە نێوان ئەو کاڵایانەی کە عێراق دانی بە بوونیاندا ناوە و پشکنەرانی چەك نەیانتوانیوە بیدۆزنەوە: ٣,٩ تەن گازی عەساب، ٦٠٠ تەن پێکهاتەکانی گازی عساب، ٥٥٠ گوللە تۆپ کە بە گازی خرنووکە پڕکراونەتەوە، ١٥٧ بۆمبای میکرۆب، ٢٥ کڵاوەی جەنگی مووشەکی پڕکراو بە ئەنتراکس و ئەلفانۆکسین لەگەڵ ٥٠ کڵاوەی جەنگی مووشەکی سکود. هێشتا ئایتمی تر هەن – وەك پێکهاتەی ( بەلای کەمەوە ) سێ چەکی ئاوکی لەگەڵ ئامێری پرۆسەی گۆڕینی یۆرانیۆم بۆ ئاستی ناوکی، کە ئەمانەش عێراق نکۆڵی لە بوونیان دەکرد. بەڵام پشکنەرانی چەك هەر بۆی دەگەڕان. پشکنەری چەك سکۆت ریتەر، کە ئەمریکییە. بە کورتی باسی دۆزینەوەکانی لە ساڵی ١٩٩٨ دا دەکات و دەڵێت: ( چەکی عێراق دانەماڵراوە و عێراق بە درێژایی کات درۆ دەکات. ) هاوەڵەکەشی ریچارد باتلەر لە دوای ساڵانی پشکنین بە کۆمیتەی سیناتۆرەکانی پەیوەندی دەرەوەی وت: ( هێشتا عێراق سەرقاڵی بەرهەم هێنانی چەکی

کیمیاییە، لەوانەشە خەریکی بەرهەم هێنانی چەکی بایۆلۆژی بێت. بە بوونی ١٠ تەن یۆرانیۆم، کە تەنێکی کەمێك بە پیت کراوە و هەواڵگری ئەڵمانی داکۆکی لەسەر بوونی دەکات. عێراق ئەوەندە یۆرانیۆمی خۆشەکراوی هەیە کە لە ساڵی ٢٠٠٥ دا بەشی ٣ بۆمبای ناوکی بکات. )

لەمەش زوو تر، پشکنەرانی چەکی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆیان دەرکەوتبوو کە عێراق چەند مانگێکی مابوو بۆ دروستکردنی بۆمبای ناوکی. ئێمە ئەوە دەزانین کە سەدام وەسیلەی هەیە وەك ( UNSCOM ) خستوێتەروو، بۆ دروستکردنەوەی جبەخانەکەی. بە پێی راپۆرتی ( CIA ) لە ساڵی ٢٠٠٠ دا: ( لەوەتەی پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٨ دا ڕاوەستاوە، عێراق هەلی بۆ ڕەخساوە کە لە چەند هەفتەیەکدا بۆ چەند مانگێك، دەست بکاتەوە بە دروستکردنەوەی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی. دوا بە دوای پرۆسەی ڕێوی بیابان کە لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٨ دا لە عێراق درا، بەغدا هەوڵی دامەزراندنەوەی ئەو دەزگەیانەی داوە کە کاول کرابوون، لەوانەش چەند فێرمایەکی گرنگی بەرهەم هێنانی مووشەك و کارگەیەکی بەرهەم هێنانی چەکی کیمیایی، کە بە دوو شێوە بەکاردەهێنران.

بۆ روون کردنەوەی زیاتر لەم بارەیەوە، ولیام کۆهێن کە وەزیری بەرگرییە و ماوەکەی تەواو بووە، لە مانگی کانوونی دووەمی ٢٠٠١ دا راپۆرتێکی خستەروو، گوایە عێراق کارگەکانی بەهەرم هێنانی ( ماددەی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی ) بنیاد ناوەتەوە. لە مانگی کانوونی یەکەمی ئەو ساڵەشدا، ئەندازیارێکی عێراقی پلە بەرز کە ناوی ( عەدنان سەعید ) بوو، عێراقی بەجێهێشت و چوو بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، فەرمییە ئەمریکییەکانی ئاشنای شوێن و وردە بابەتی سایتەکانی سەدامی کرد، کە هێشتا ماددەکانی چەکی کیمیایی و بایۆلۆژی و ناوکی تێدا حەشار دەدران. بە پێی نیویۆرك تایمز، عەدنان

سەعید ڕایگەیاندووە کە کالآیەکی زۆر ( لە پەنای کۆمپانیا حکومییەکان و خانووی ئەهلی و لە گەڕەکە قەرەباڵغەکاندا، یان لە ژێر زەویدا کە بە شێوەی بیر هەڵکەندراوە و کۆنکرێت کراون و هیچ ئاوییان تێدا نییە )، شاردراونەتەوە. لە کۆتاییدا و لە ئەیلوولی ۲۰۰۲ دا، هەردوو ئیدارەی ئەمریکی و حکومەتی بەریتانیا، بەڵگەی زیاتریان خستۆتەروو کە عێراق جبەخانەکەی سەرلەنوێ دروست دەکاتەوە. لە نێوان ئەم بەڵگانەدا، وێنەی بە سەتەلایت گیراو و دۆکۆمێنت هەیە کە بە وردی باسی هەوڵی تازەی سەدام دەکەن بۆ دروستکردنی مووشەکی مەودا درێژ. لە کانوونی یەکەمی ۲۰۰۲ دا تیمی پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕاپۆرتێکی پێشکەش کردووە، کە عێراق مادەی گرنگی جبەخانەی کوشندەی نەخستۆتە بەرچاویان.

## بەشی چوارەم
## تەسکە ریالیزمی ( بۆش )ی یەکەم
## Narrow Realism ( Bush I ) *

چۆن ویلایەتە یەککگرتووەکان لە ساڵانی ١٩٩١ دا، ڕووبەرووی هەڕەشەکانی سەدام حوسێن دەبووەوە؟ بەگشتی بەرانبەر چەوسێنەرێك، کە خوولیای داگیرکردن ( غەزوو )و دابینکردنی چەکی کۆمەڵکوژ بوو هیچی نەکرد. ئیدارەی ( بۆشی یەکەم )و کلینتۆن وایان بەلاوە باش بوو کە کاری کەموکوڕی سەربازی و هەوڵی دیبلۆماسی ئاوێنەی یەکن، لە جیاتی ئەوەی سەرۆك بۆش پێدابگرێ لەسەر گۆڕینی سەدام، جەنگی بەنیوە ناچڵی ڕاوەستاند و ڕووی خۆی وەرچەرخاند. سەدامیش کەوتە قەتڵوعامکردنی ئەو عێراقییانەی کە ویلاتەیە یەککگرتووەکان خۆی هانیدابوون کە شۆڕشێك دژی ئەم رژێمە بەرپا بکەن. کلینتۆن لە ئاستی خۆیەوە، خۆی لە روو بە ڕووبوونەوەی ئەو تەحەدا ستراتیژیەیەی کە سەدام دەیخستەروو بەدوور گرت. لە جیاتی ئەوە بەهیوا بوو، کە سیاسەتی هەمیشە لاوازی – لە قەفەسنان Containment – لەگەڵ جاروبار بۆردومان بە مووشەکی کەوین، بەس دەبن بۆ ڕاگرتنی سەدام لە قەفەسەکەدا.

لە ئاستێکەوە، شیکردنەوەی وەڵامدانەوە و نەدانەوەی کاری جاڕسکردنی عێراق لە ساڵانی ١٩٩٠ دا، بەدروستی بەرەوپێشەوە ڕۆشتووە. دە ساڵەی رابردوو، بەلای کەمەوە بۆچوونێکی وەهای هێنایە ئاراوە کە سەرکەوتنی ئەمریکا

---

* واتە مەزهەبی سیاسەتێکی واقعی بێ پێز کە ئارەزووی گۆڕانکاری کەم بێت. ( وەرگێڕ )

لە جەنگی کەنداودا دەبێتە هۆی هەرەسهێنانی رژێمەکەی سەدام حوسێن، بەڵام کاتێك ئەمە نەهاتەدی، هەردوو ئیدارەی بۆش و کلینتۆن دووچاری زنجیرە بەرهەڵستییەك بوونەوە کە ئارەزوویان لە ئاوێتەبوونی نەبوو. بەڵام ناچار بوون کە بە باشترین شێوەی توانایان وەڵامی بدەنەوە. بەسادەیی، لە راستیدا هیچ کام لەم ئیدارانە خاوەنی ئەم جورئەتە نەبوون، بەڵام بارودۆخەکە زیاتر ناچاری کردبوون. جیهانبینی هەردوو تیمەکەی بۆش و کلینتۆن شێوازی مامەڵەکردنی ئەم دوو لایەنەی لەگەڵ سەدام چەسپاندبوو. ئەو راستیەیەی کە هەردوو ئیدارەکە ئەوەندە بەلاوازی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، کە ئەمەش لە خۆیدا هێمای کەموکوڕی سیاسەتی دەرەوەیان بوو لە بۆچوونەکانیاندا.

لەوەتەی جەنگی سارد کۆتایی هاتووە، زۆرترینی ئەو تەحەدایانەی کە ڕوو بەرووی ئەمریکا بوونەتەوە، لە عێراقەوە بوون ، کە بۆتە قاڵبی بۆچوونە جۆر بەجۆرەکانی ئەمریکا لە ئاستی جیهاندا. لە نێوان راستیەکاندا، سەما ناقۆڵاکەمان بوو لەگەڵ سەدامدا، ئەم کارە وای پیشان دەدا کە سیاسەتی دەرەوەمان لەو قاڵبە هەڵوەشاوەیە دوور بووە، کە رەخنەگران بە رۆتینی وەسفیان بۆ کردووە. بەپێچەوانەوە، هەر یەك لە سێ سەرۆکەکەی دوای جەنگی سارد، جیهانبینیەکی چەسپاوی خۆیان هەبووە و ڕەنگی لە مامەڵەکردنیاندا لەگەڵ عێراق داوەتەوە.

ئیدارەی بۆشی یەکەم، جیهانبینیەکی ئەوتۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا هەبوو، کە گوڕی پێدان تا بە پەرۆشەوە، بەرژەوەندە زیندووەکانمان لە کوەیت بپارێزێن. بەڵام لە هەمان کاتدا گۆڕینی رژێمی بەغدای خستە ئەو لاوەو گوێی نەدایە چارەنووسی قوربانییەکانی سەدام لەناو عێراقدا. ئەم ریالیزمە تەسکە وەچەی سیاسەتی واقعی – واتە Real Politick – ڕێنماییکردنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکییەکە، لەسەر بنەمای پاراستنی بەرژەوەندییەکانی هەڵچنراوە. ئەم ڕێنماییە بەفراوانی روون نەبووە و باش لێی حاڵی نەبوون. بەڵام تیمەکەی

کلینتۆن بە جیهانبینییەکی زۆر جیاوازترەوە هاتنەسەر حوکم و بەوە قایلبوون کە ئەمریکا دوا بەدوای جەنگی سارد، دەتوانێ ئامانجەکانی لە رێی بازرگانی و دبلۆماسی و گفتوگۆکردنەوە بەدەستبهێنێ. لەم ڕووەوە ئیدارەی کلینتۆن، جۆرە ئارەزووخوازییەکی لیبڕالیزمی گرتە ئامێز، کە سەبارەت بەو بارودۆخەی عێراق پێشڕەوایەتیەکەی بدەنە دەست کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان. هێزەکانی ئەمریکی جارێك تۆکمە بێت و جارێکیتر بەبیانوو بێت و بەگشتی گوێ نەداتە تەحەداکانی سەدام. لە کۆتایشدا بوو بە بەرپرسی یەکەمی لاوازی گەمارۆ و چەك پشکنین لە عێراقدا.

لە مانگەکانی سەرەتای ئیدارەی ئێستەدا، جۆرج دەبلیو بۆش، وا دیار بووە کە هاوسەنگییەکان لە نێوان سیاسەتی پێشینەکانی خۆی بە هاندانی عێراق بۆ هەڵسوکەوتێکی باشتر، رۆژێك بە هەرەشە لێکردن بە سزادانی لە رۆژی دواییدا. پاشان ئەلقاعیدە هێرشی کرد و لە ماوەی چەند مانگێکدا تیمەکەی بۆش بۆچونێکی جیاوازی لە هەردوو تیمەکەی تر گرتەبەر. ستراتیژی تازەی ئەمریکا بە شێوەیەك بوو، کە کەللەرەقی ئیدارەی بۆشی یەکەم لەگەڵ رەوشتخوازی کلینتۆندا بەیەکەوە گرێبدات. شێوە رەنگدانەوەیەك کە وەك سەرۆك بۆش خۆی باسی دەکات (( یەکبوونی بەهاکانمان لەگەڵ بەرژەوەندی وڵاتەکەماندایە. )) سەرۆك زاراوەیەکی نوێی بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردنی خۆی پەخساند بوو بەناوی ( ئێنتەرناسیۆنالیزمی ئەمریکی بەرچاو )ەوە ولەم ڕووەشەوە دەستیکرد بە پەیڕەوکردنی. هەڵبەت بەهەمان شێوەی ریالیزمی تەسك و لیبرالیزمی ئارەزووخوازی تیمەکانی پێش خۆی، ئێنتەرناسیۆناله بەرچاوەکەی ئەمیش لە سیاسەتی نەتەوە یەکگرتووەکان دا بەرانبەر عێراق دەکەوێتەبەر تاقیکردنەوەوە.

ئێمە باش نایانناسین، ئەمە راست بوو یان بەلای کەمەوە بیانووی بەرپرسە ئەمریکییەکان بوو، کاتێ سەدام حوسێن بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٩٠ دا

کەوتەبەر سەرنجی گەلی ئەمریکا. ئەمە هەرچۆنێك بێت کەمێك راستی تێدایە، بەڵام بۆ لەمەودوا نا. هەرچەندە سەدام یاریزانی سیاسەتی عێراقی بووە لە ساڵی ١٩٦٨ ەوە تا لە ساڵی ١٩٧٩ دا حوکمی گرتەدەست. بەر لە ساڵەکانی ١٩٨٠ کە بەرپرسە ئەمریکییەکان لەگەڵ دیکتاتۆری عێراقدا ئاشنایەتیان پەیدا کرد. عێراق پاش هەموو شتێك، دوا بەدوای جەنگی شەش رۆژەی ١٩٦٧، پەیوەندییەکانی لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتووەکاندا، بە تۆمەتی ئەوەی کە زیاد لە پێویست پشتگیری ئیسرائیل بوو، بڕی. هەروەها عێراق وەك گەورەترین هاوپەیمانی یەکیەتی سۆڤێت قووت بووەوە. لە پاڵ ئەمانەشدا، ناحەزی سەرەکی عێراق، کە ئێران بوو – تا لابردنی شا – ش دۆستی نزیکی ویلایەتە یەککگرتووەکان بوو.

ئەمانە هەموو بە دەسپێکردنی جەنگی ئێران – عێراق لە ساڵی ١٩٨٠ دا گۆڕان. لە سەرەتاوە هەڵوێستی ئەمریکی بەرانبەر ئەم پێکدادانە بە دیراسەکراوی بیلایەن بوو. لە راستیدا گەلێك سیاسەتمەداری ئەمریکی خۆشحاڵی خۆیان بۆ نەدەشاردرایەوە لەم مشتومڕە، لەلایەکەوە هاوپەیمانێکی یەکییەتی سۆڤێت شەڕی دژی دەوڵەتێکی ئیسلامی ڕادیکاڵی سیۆکراس هەڵگیرساندووە، کە بارمتە ئەمریکییەکانی گلدابووەوە، لە لاکەی ترەوە، دانایی پەسەندکراوی ئەو کاتە لە تێبینییەکەی هێزی کیسنجەردا بەرجەستە دەبێت، کە دەڵێت: (( زۆر خراپە کە هیچیان ناتوانن بدۆڕێن. )) ئەم جۆرە سۆزە، لە ساڵەکانی یەکەمی ئیدارەی ریگندا ڕووەو لایەنگری عێراق وەرچەرخا. لە ئاستی ئێرانی خومەینیدا، لۆژیکی (( دوژمنی دوژمنم دۆستمە. )) بەرەنگاری لێنەدەکرا و ئیدارەی ریگن بەتەمای ئەوەش بوو کە عێراق لە یەکییەتی سۆڤێت دووربخاتەوە و بەهیواش بوو کە سەدام پەیوەندی خۆی لەگەڵ مۆسکۆدا کەم بکاتەوە.

لەساڵی ١٩٨٢ دا و رچەرخانی ئەمریکی بەلای قازانجی پتەوی عێراقدا شکایەوە، بەو شێوەیەی کە تیمەکەی ریگن ناوی عێراقیان لە لیستی

پشتگیریکەرانی تیرۆریستان سڕیەوە. ساڵێك دوای ئەوەش، جێگری وەزیری دەرەوە لۆرانس ئیتگلورگەر، نامەیەکی بۆ سەرۆکی بانکی هاوردە و هەناردە ( EXIMO )، ولیام داریەر نارد، کە تێیدا قەرزدانی بە عێراق بەم شێوەیە نرخاندبوو (( سەرنجت بۆ گرنگی ڕۆڵی بانکی ( EXIM ) ڕادەکێشم، کە چەند گرنگە لە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری مەودا درێژی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، ( لەو کاتەشدا جێگری سەرۆك بۆش ئەمەشی خستەپاڵ ( Exim Bank ) دەتوانێت ڕۆڵێکی گرنگ بە دەستبهێنێت لە هەوڵەکانماندا لەو دەڤەرەدا. )) لە کۆتایی ئەو ساڵەدا ویلایەتەیە کگرتووەکان بە شێوەی قەرز بە سەدان ملیۆن دۆلار بوو، کە لە ساڵی ١٩٨٧ دا، پارەدان بە عێراق ساڵانە گەیشتە نیو بلیۆن دۆلار، ئەمانە هێشتا هەمووی نەبوون. لە ساڵی ١٩٨٣ دا، ئەنجومەنی ئاسایش لە توێژینەوەیەکیدا کە دەست نیویۆرك تایمز کەوتبوو، پێشنیاری دابوو ( کە وڵاتە ڕۆژئاواییەکانی تر بە چەك و پارە پشتگیری ئەرکی جەنگی عێراق بکەن. ) لە ساڵی ١٩٨٤ دا ویلایەتە یەکگرتووەکان و عێراق پەیوەندی دبلۆماسییان زیندوو کردەوە. لیستی ئەو کاڵایانەی کە ئەمریکا بۆ عێراقی دەنارد بەرفراوان بوو، تا تەکنەلۆژیا و ماددەی ئەوتۆی گرتەخۆی کە گەلێ کەس ترسی لەوە دەکرد کە بۆ چەکی کۆمەڵکوژ بەکاربهێنرێت. گوێدانە کەڵکی سەربازی ئەم کەلوپەلانە زۆر کۆشکی سپی سەغڵەت نەکرد.

بەپێی قسەی بروس جێنێلسۆن، ئەو خاڵانە بۆ چاوپێکەوتنەکەی نێوان جێگری سەرۆك بۆش و باڵیۆزی عێراق لە ساڵی ١٩٨٧ دا ئامادەکرابوون، داکۆکی بوون لەسەر دوانەخستنی ناردنی ماددەکان بۆ عێراق و هەوڵی تایبەتی بدرێ بۆ لابردنی هۆکارەکانی دواخستنیان. لە نێوان ئەو شتانەی کە تیمەکەی ڕیگن دەیانویست بۆ عێراقی بنێرن بریتی بوو لە: بەکتریا، پێکهاتەکەی سیستمی مووشەك و تەکنەلۆژیای تەقاندنەوە.

پەیوەندییەکانی نێوان بەغدا و واشنتۆن بەدەگمەن هاوسەنگ بوون، سەدام زۆر بە چاکی لە کاری قێزەوندا لە ناوخۆ و لە دەرەوەی وڵاتەکەیدا ناسرا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا فشاری ئەمریکی کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبوو بۆ هێورکردنەوەی. ئیدارەی ریگن هەوڵی وا تۆکمەی نەدا بۆ ئەم گۆڕانکارییە. هەرچەندە فەرمییەکانی ئەم ئیدارەیە، با بڵێین زەلمای خلیل زاد و ریچار پێرل، لەوەی کە ( عێراق وڵاتی سەر بەکێشەیە ) وریابوونەوەیان دەخستەروو و دەیانگووت کە ئەم وڵاتە سەرقاڵی بەدەستهێنانی چەکی ناوکییە کەچی هێشتا کەینوبەینی لەگەڵ سەدامدا بەردەوام دەمایەوە. سەرەڕای رەزامەندی عێراق بە میوانداری ئەبو عەباس، فەرمانەدەی ئەو گروپەی کە کەشتی ( ئەچیلی لارۆیان فڕاندوو، تیرۆریستان کەمئەندامێکی ئەمریکیان بە کورسییەکەیەوە بەستەوە و لەوێوە فرێیاندایە ناو دەریاوە. بەڵێ سەرەڕای ئەمەش جۆرج شولتز وەزیری دەرەوە داکۆکی لەوە دەکرد کە ( عێراق خۆی لە تیرۆریسزمی نێودەوڵەتی جیاکردۆتەوە ) و ئیدارەکەشی بەرگری لە فشاری کۆنگرێس دەکرد دژی گەڕانەوەی عێراق بۆ لیستی تیرۆریستان. هەرچەندە بەڵگەی مەزن هەبوو کە عێراق گاز بەسەر کوردەکاندا دەڕێژێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئیدارەی ریگن دژی هەوڵ و تەقەلای کۆنگریس دەوەستا کە دەیویست ئابلۆقە بخاتەسەر عێراق. لە کۆتاییدا سەرەڕای ئەوەی عێراق بەپەلاماری مووشەکی ( USS Stark)ی نوقمکرد و لە ئاکامدا سی وحەوت دەریاوانی ئەمریکی گیانیان لەدەست دا، ئیدارە بە ئامادەباشییەوە بیانووی عێراقیان پەسەند کرد کە ئەمە کاری هەڵە بووە. لەمانە و لە هەوڵی تریشتدا ئەم ئیدارەیە لەلایەن گەلێ لایەنی ترەوە پاڵپشت دەکرا وەك ژووری بازرگانی ویلایەتە یەککگرتووەکان کە مشتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد کە

دیکتاتۆری عێراق ( دوور لەبۆچوونی عاتیفی ) چاوەڕێی ( پیرۆسترۆیکا* )ی عیراقی لێدەکرێت.

سەرۆك جۆرج ئێچ دەبلیو بۆش واتە ( بۆشی یەکەم ) لە میانەی دوو ساڵی سەرەتای ئیدارەکەیدا، لەسەر هەمان سیاسەتی ریگن لە ئاستی عێراقدا دەڕۆیشت، کە ئەویش بریتی بوو لە مامەڵەکردنی بێ مەرج، بێ گوێدانە ئەنجام لەگەڵ سەدام حوسیندا. بە تەواوبوونی جەنگی ئێران – عێراق، پەرۆشی پاڵپشتی سەدام لەسەر بنەمای ( دوژمنی دوژمنم دۆسمە ) دەبووایە بەرەوکزی بڕۆشتایە، بەڵام پێچەوانەوە تیمەکەی بۆش هەر بەردەوام بوو لەم پشتگیریکردنەدا چونکە بەلایانەوە وابوو تەبایکردن لەگەڵ ئەم دیکتاتۆرەدا، لەوانەیە عێراق بخاتە نێو ( خێزانی نەتەوەکانی ترەوە )و ببێتە دەوڵەتێك کە بەرپرسیار بێت لە ئاست رووداوەکاندا و ئارامگیری لە دەڤەرەکەدا رەچاو بکات. لەم ئاستەوە بۆش درێژەیدا بە ناردنی ماددەو کاڵای کشتوکاڵی و تەکنەلۆژی بۆ عێراق بەنرخی داشکاو. ( ئەمەش دژ بە هەڵوێستی وەزارەتی بازرگانی ئیدارەکەی بوو ) کاتێك لە ساڵی ١٩٨٩ دا ئەم وەزارەتە و وەزارەتی دارایی و خەزێنەی فیدڕاڵ پێشنیاری وەستاندنی ئەم یارمەتیانەیان کرد و زیری دەرەوە جیمس بەیکەر و جێگرەکەی لۆرانس راوێژکاری ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی برنت سکاوکروفت، بەهەموو هێزیانەوە دژی ئەم پێشنیارە وەستان. لە ئاستی ئەو پرسیارەی ئایا ویلایەتە یەکگرتووەکان چ ( رێگەیەك ) بەکاربهێنێت تا بتوانێت هەڵسوکەوتی سەدام بخاتە دۆخی مۆدرێنەوە؟ ئیدارەکەی بۆش هیچ جۆرە بۆچوونێکی نەبوو. سیاسەتی کۆشکی سپی لەسەر ئەوە سوور بوو کە ( دەبێت هەوڵەکانمان جەخت بخاتەسەر

---

*:Perestroik ئەو پرۆگرامە چاکسازییە بوو کە گۆرباچۆف لە یەکیەتی سۆڤێت لە ناوەندی ساڵەکانی ١٩٨٠ دا، دایمەزراندو کتێبێکی لەسەر دەرکرد. ( وەرگێڕ )

فشاری لەسەرخۆ و بەردەوام و ماقوولانە نووکەکەی تری نوێڵەکە بەرز بکەینەوە ... دەبێت واقعی بین، چی لە دراوسێکانی عێراق داوا دەکەین هەر ئەوەش لەمان داوا بکەین لە پێناو پەتکردنی و کردنە هاوپەیمانێکی خاوەن مەسئولییەت لە سیاسەتی دەرەوەماندا ) سیاسەتی کۆشکی سپی بەرانبەر کوردەکان کەلەو ساتەدا قەسابی دەکران دەڵێت: ( نابێت بە هیچ شێوەیەك خۆمان ئاوێتەی یاخیبوونێك لەناو عێراقدا بکەین کە تەمەنی ٦٠ ساڵە یان نەیاری هەڵمەتەکانی لەناوبردنی بین )

بۆ ئەوەی کەسێك لەم بیرۆکراسییەدا بە هەڵە لە ڕەوشی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان تێنەگات، سەرۆك بۆش لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٩ دا، ڕێنمایی ژمارە ٢٦ ی سەربەستی ئاسایشی نیشتمانی دەرکرد، کە ئەویش بریتی بوو لە پەرەپێدانی هەموو بەشەکانی حکومەتی فیدراڵی کە پەیوەندییە سیاسی و ئابوورییەکانی ئەمریکا لەگەڵ بەغدا فراوانتر بکەن. بەڵام تەنها پاش ئەوە بە مانگێك، راپۆرتی ئاشکرا بووی وەزارەتی دەرەوە ڕایگەیاند کە: بەرپرسە هەواڵگرییەکان زانیارییان لەسەر ئەوە دەستکەوتووە کە عێراق بەدووسەرە یارمەتی ئەمریکا بەکاردەهێنێت، واتە بۆ پرۆژەی سەربازی. وە بەهۆی کۆمپانیای ڕووکەشەوە سەرقاڵی دابینکردنی تەکنەلۆژیای ناوکییە. کۆڵنەدەرانی وەزارەتەکەی بەیکەر و ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی ( NSC ) سکۆوکرۆفت، هەر ئەو مانگە یەك بلیۆن دۆلاریان بە شێوەی قەرز بۆ عێراق دابینکرد. لە ساڵی داهاتوودا، کاتی کە رادیۆی دەنگی ئەمریکایە لە سەروتارێکدا تیشکی خستەسەر پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لەلایەن سەدامەوە، بەیکەر تەریق بووەوە و فەرمانیدا هەموو سەروتارەکانی بەسەرپەرشتی دەوڵەت دەرچێت و بروسکەیەکی بۆ باڵیۆزی ئەمریکا لە عێراق ( April glaspie ) نارد، بۆ ئەوەی ئەو ڕاستییە روون بکاتەوە کە ( حکومەتی ئەمریکا پێشنیاری وا ناکات کە گوایە حکومەتی عێراق

نایاساییە، یان هانی ئەوە بدات کە دەبوایە، یان گوایە دەبێ گەلی عێراق دژی حکومەتی عێراق هەستێت. ) گلاسپی راستەوخۆ نامەیەکی بۆ وەزیری دەرەوەی عێراق نارد و داکۆکی لەسەر ئەوە کردکە ( سەرۆك ئارەزوومەندی پەیوەندی باشە لەگەڵ عێراقدا، پەیوەندییەك کە لەسەر باوەڕ بەخۆبوون بە یەکتری بەرجەستە بوو بێ، لێرەوە دەتوانین چەندەها مەسەلە بە روونی و بە شێوەی بەرهەمهێنەر باس بکەین، من لەوەنیگەرانم کە حکومەتی عێراق زۆر بەخێرایی، پەستبوونی خۆی دەربارەی ئەو وتارە پێڕاگەیاندووم هەتا بتوانم پەشیمانی فەرمی حکومەتەکەم دەرببڕم بەبێ دواکەوتن. ) مانگێك دواتر، شاندێکی سیناتۆرەکان کە رۆبەرت دۆل و ئالان سیمیسۆنی تێدا بوون روویان لە بەغدا کرد، لە رووی دڵنیاکردنەوەوە سیمسۆن بەلالانەوەوە وتی: ( من لەو باوەڕەدام کێشەی ئێوە لەگەڵ میدیای رۆژئاوادایە نەك لەگەڵ حکومەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان، رۆژنامەگەری بەنازە و لە خۆیان باییبوون، نایانەوێت هیچ شتێك بەسەرکەوتووی ببینن. نایانەوێت بگەنە ئامانجەکانی، ئامۆژگاری من وایە کە رێگە بەم زۆڵانە بدەن و بێن بۆ ئێرە و راستییەکان بەچاوی خۆیان ببینن. ) سیمیسۆن نەگەڕایەوە بۆ واشنتۆن و لەوێوە خەتی ئیدارەی بە زوڵالی ڕاگەیاند. وە بەرەنگاری لە یاسای کۆنگرێس کرد بۆ سەپاندنی ئابڵوقە دژی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لەلایەن سەدامەوە.

هەتا ئێوارەی جەنگی کەنداو، تیمەکەی بۆش خولیای کارکردن بوو لەگەڵ سەدامدا. نەهەڕەشەکانی سەدام بە سوتاندنی ئیسرائیل و نە سمکۆڵانەکەی دژی کوەیت و تەنانەت هەڵوێستی روونی دژ بە ئەمریکا نەبوونە هۆی ئەوەی کە تۆزقاڵێك لە ئومێدی سەرۆك بە دیکتاتۆری عێراق کەم بکاتەوە. بەپێچەوانەشەوە لە وەڵامدانەوەی جموجوڵی سوپای عێراق لەسەر سنووری کوەیت و زارەتی دەرەوە باڵیۆز گلاسپی بۆ دڵدانەوەی سەدام نارد. لە ٢٥ ی گەلاوێژی ١٩٩٠ دا، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گلاسپیدا پێشەوای عێراق وای خەملاند کە ئەمریکا

نایەوێت دژی ئامانجەکانی بوەستێت، چونکە ( ئێوە و کۆمەڵگە ناتوانن ۱۰ هەزار کوژرا و لەیەك شەڕدا قبوڵ بکەن. ) گلاسپی وەڵامیدایەوە ( ئێمە هەڵوێستمان نییە بەرانبەر کێشەی عەرەب – عەرەب، لەوانە ڕێنەکەوتنتان لە بابەت سنوورەوە لەگەڵ کوەیتدا .... وەزیری دەرەوە جمیس بەیکەر زانیاری بە هەموو وتەبێژە فەرمییەکان داوە کە پەیوەندی ئەم راسپاردەیە بکەن. )

لە واشنتۆن، تەنانەت فەرمییەکانی وەزارەتی دەرەوە تۆقی بوون، لەبەر ئەوە ئیدارەکە جارێکی دی هەوڵیدایەوە، بەڵام هەر چۆنێك بێت وەڵامی هەڵچوونی سەدام دەکەوتەسەر فەرمییەکانی وەزارەتی دەرەوە و ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانی، ئەمانەش هێشتا باوەڕیان بە دیکتاتۆری عێراق مابوو. لەوانە، بە تایبەتی ریچارد هاس کە شارەزای رۆژهەڵاتی ناوەراست بوو لە ( NSC ) دا. سەرەڕای ئەو راستییەی کە عێراق پەیتا پەیتا هێزی لەسەر سنووری کوەیت کۆدەکردەوە وەك مایکل گوردن و بێرنارد ترینۆر لە کتێبی ( جەنگی ژەنەڕاڵەکاندا ) دەیگێڕنەوە: ( هاس پەیامەکەی سەرۆك بۆشی بە هەلێکی گونجاو زانی بۆ هەوڵدان لە پێناو کەمکردنەوەی گرژی و چەسپاندنی سیاسەتی میانڕەوی. ) هاس توانی پەیامێك بهۆنێتەوە، ئەم پەیامە بوو بە نامەیەك و سەرۆك بۆش لە ۲۸ ی گەلاوێژدا بۆ سەدامی نارد، کە ئەمەش دەقەکەیەتی: ( ڕێگەم بدە وەك باڵیۆزەکەم و سیناتۆر دولی، دڵنیات بکەمەوە کە ئیدارەکەم بەردەوام دەبێت لە ڕەخساندنی باشترین پەیوەندی لەگەڵ عێراقدا. بەردەوامیش دەبین لە پشتگیریکردنی هەموو دۆستەکانمان لە ناوچەکەدا، ئەوانەی هەر لە کۆنەوە پەیوەندی باشیان لەگەڵماندا هەیە. ئێمە هیچ ناکۆکی لە نێوان ئەم دوو ئامانجەدا نابینین. ) وەڵامەکەی سەدام چوار رۆژ درەنگتر هات، بریتی بوو لە داگیرکردنی کوەیت. بە پەلە دوا بەدوای داگیرکردنی کوەیت، بۆش جاڕی دا: ( کە شەڕەنگێزی سەدام دەبێ لەناو بچێت. ) تیمەکەی بۆش هەموو لە ژێربالی سیاسەتێکی تازەدا یەکیان گرت. باز دەتوانن

بڵێین کە هەموویان یەك ڕێز بوون. سەرۆکی ئەرکانی هاوبەش، کۆڵن پاوڵ، لای وابوو کە فەرمایشتەکانی سەرۆك هێشتا کاڵوکرچە و سکاڵای ئەوەی دەکرد کە لەم بارەیەوە پرسیان بەو نەکردووە. لەدوای وەستانی جەنگ لۆرانس نیگل بێرگەر لەسەر ئەوە داکۆکی دەکات کە ( بە شەخسی زانیویەتی، ئەگەر کۆلین ڕێگە و هەلی تری هەبووایە شەڕی دژی عێراق نەدەکرد، سەرۆك بۆش و برینت سکاوکرۆفت خزانیانە ناو جەنگەوە. )

ئەم ڕاستییە هەر لە سەرەتاوە خۆی خستەروو، یەکەم، کۆڵن پاوڵ مانۆڕێکی سەربازی لە کەنداودا ڕەتکردەوە بۆ ئەوەی سەدام بخاتە پاشەکشێ و کوەیت داگیر نەکات، بەڵام کاتێك کە داگیری کرد، پاوڵ بەرهەڵستی ڕزگارکردنی دەکرد و دەیووت: ( گەلی ئەمریکا نایانەوێت ڕۆڵەکانیان بۆ گالۆنێك ( نەوتی دۆلار و نیویی ) بکەنە قوربانی، ئێمە ناتوانین کەس قایل بکەین تا خۆیان لە پێناو کوەیتدا بە کوشت بدەن. ) سکاوکرفت دێتەوە یادی و دەڵێت: ( لە ئاستی مشتومڕی ئەوانی تردا تەواو حەپەسابووم، بۆچوون وابوو کە ئەم داگیرکردنە پشتگوێ بخرێت و لەگەڵ ئەم واقیعەدا بژین. )

سەرەڕای پێچمکێ ی سەرۆکی ئەرکانی هاوبەش دوو دڵی چوونەناو جەنگەوە، سەرۆك کەوتەکار بۆ گەڕاندنەوەی سەروەری بۆ کوەیت، بەڵام مەبەستەکانی جەنگ هەتا دەرکردنی سەدام لە کوەیت بڕیان دەکرد. بەتایبەتی کۆڵن پاوڵ حەزی بەم سنووردانانە نەدەکرد. هەر ئەو ڕۆژەی هێرشی سەرزەوی دەستی پێکرد، پاوڵ سەرقاڵی فشاری کۆتاییهانانی بوو. چوار ڕۆژ پێکدادان و کاتێك چەند یەکەیەکی سوپای ئەمریکی دەیانوویست دەووری هێزەکانی عێراق بدەن، پاوڵ سەرۆك بۆشی قایلکرد کە هێرشی زەوی ڕابگرێت. ژەنەڕاڵ جارپیشی دا: ( هێزەکانی پاسەوانی کۆماری پەرتوبڵاوکراونەتەوە. ) پاوڵ بە هەڵەدا چووبوو، ڕێچکەی هەڵهاتن لەبەردەمدا مابوو و سێ تیپی پاسەوانی کۆماری بە

ساغ و سەلامەتی گەڕانەوە ناو عێراق. لەوێشەوە کەوتنە قەتڵوعامی ئەو مەدەنییانەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان هانی دابوون بە شۆڕش هەستن. لە کۆشکی سپیدا و زیری دەرەوە، بەیکەر، لە ئاستی خۆیەوە مشتومڕی وەستانی پێشکەوتنی هێزەکانی ئەمریکا بوو لەناو خاکی عێراقدا و جاڕی دەدا کە: ( ئێمە ئیشی خۆمان تەواوکردووە، ئامانجەکانمان بەدیهێناوە و لە کوەیت دەرمانکردوون. ) لەسەرزەوی لەوە دەچوو باودۆخەکە کەمێك جیاواز بێت. ژەنەڕاڵ نۆرمان شوارسکۆف حەزی بە بەردەوامی هێرشەکانی بوو و دەیووت: ( بەلای کەمەوە رۆژێکم پێویستە بۆ ئەوەی هێزە زیرپۆشەکان تێکبشکێنم، دەنا دەکەونە گیانی کورد و شیعە. بەڵام هەرچۆنێك بێت بۆش هاتەسەر رای پاوڵ و بەیکەر، لە پاش سەد سەعات پێکدادان پەلاماری زەوی راوەستاند.

لە راستیدا، کۆتایی پێهێنانی جەنگ دوای ڕزگارکردنی کوەیت، دوو مانگ لەوەپێشتر درابوو. لە کانونی یەکەمی ١٩٩٠ داو لە دانیشتنێکی کۆشکی سپیدا وەك سکاوکروفت دەیگێڕێتەوە، ئیدارەی بۆش لەسەر ئەوە رێککەوتن کە سەدام لەسەر حوکم لانەبرێت. سکاوکروفت، راوێژکاری ئاسایش لە کتێبەکەیدا کە لەگەڵ سەرۆکدا بەناوی ( A world Transformed ) واتە ( جیهانێکی گۆڕاو ) نووسیویەتی: ( ئێمە بە تەنیا خۆمان دەخەینە گێژاوی لابردنی رژێمێکەوە و یەکێکی تر دێتە جێگەی و ئەگەر عێراقییەکان ئەم کارە نەگرنە ئەستۆی خۆیان ئەوا ئێمە بەرەو ڕووی بارێکی نائاشکراو گومانلێکراو دەبینەوە. ) ئەو ترسی ئەوەی هەبوو کە عێراق وەك لوبنانی لێبێت. پاوڵیش لە یادنامەکەی خۆیدا وتەی بەیکەر دەخاتەوە یاد و دەڵێت: ( ترسی ئەوەش هەیە ئەگەر سەدام لەسەر حوکم لابەرین ئەوسا عێراق دەبێتە قەوارەی سیاسی جیا جیای سوننە و شیعە و کورد. ) ئەوەش دێنێتەوە یاد کە ئەگەر دەستەڵات و هێزێکی ئەوتۆ بۆ بەغدا نەهێڵنەوە، ئەوساکە لەبەر مەترسی ئێراندا، کە دوژمنی ویلایەتە یەکگرتووەکانە، خۆی بۆ

ناگیرێت. بە کورتی خواستی تیمەکەی بۆش ئەوە بوو کە عێراق سەقامگیربێت، ئەگەر لە ژێر دەستی سەدامیشدا بێت.

نرخی ژیان لەدەستدانی ئادەمیزاد، لە زەلکاوەکانی باشووری عێراق و شاخەکانی باکووردا وەك ئاکامی سیاسەتی واقیعی تیمەکەی بۆش، بەزووی کەوتە بەرچاو. بە پشت بەستن بەو فیرقانەی پاسەوانی کۆماری کە لە کوەیتدا قوتار ببوون لەگەڵ هەلیکۆپتەری جەنگی کە لەبەر چەند هۆیەك تیمەکەی بۆش نەیخستنە ناو لیستی فڕۆکە قەدەغەکراوەکانەوە. سەدام دەستی بە قەتلوعامکردنی هەزاران کورد و شیعە کرد. سکاوکروفت لە دواییدا دەڵێت: ( خۆزگە ئەم راپەرینە ڕووی نەدەدا، من بەش بە حاڵی خۆم چاوەڕێی حوکمێکی عەسکەریم لە دوای وەستانی جەنگ لە عێراقدا دەکرد. سەرۆك بۆش لە ئاستی خۆیەوە دەڵێت: ( لەبەر هەموو هۆیەکی پراکتیکی ئێمە هیچ کاتێك بەڵێنمان نەداوە پشتگیری ڕاپەرین بکەین. ) بەڵام لە ڕاستیدا بە ئاشکراو بە بەردەوامی هانی عێراقییەکانی دەدا کە بە شۆڕش هەستن و کاروباری خۆیان بگرنەدەستی خۆیان و دیکتاتۆری سەدام حوسێن فڕێ بدەنە ئەو لاوە. کاتێك کە خەڵکانی عێراق، زۆر بەوردی ویستیان وابکەن وەك ویلایەتە یەکگرتووەکان پێی وتوون، پشتگوێخران و گەلێجار لەبەرچاوی زرێپۆشەکانی ئەمریکادا دووچاری قەسابی بوون.

لەیادنامەکەیدا وەك گاڵتەجاری پاوڵ دەڵێت: ( ئەگەر رژێمی سەدام بڕووخایە، ئەوا شێوە دیموکراتییەکی ( جێفرسۆن ) ی دەهاتە جێگەی، کە خەڵکی بیابان لە پاڵ رۆژنامەکانی فیدرالیدا، قورئانیان دەخوێندەوە. ) بەڵام کێشەکە ئەوە نەبوو ئایا شۆڕشگێڕەکانی عێراق کەڵك لە رۆژنامە فیدراڵییەکان وەردەگرن یان نا، بەڵکو ئەو ئەگەرە بوو، ئایا ئێمە پشتگیریان لێبکەین بۆ ڕووخاندنی رژێمی سەدام حوسێن. دوای هەموو شتێك، ئیدارەکەی هیچ ئارەزوویەکی نەخستەروو بۆ

پارمەتیدانی ئەو شۆڕشگێڕانەی کەوتنە دوای قسەی ئەم ئیدارەیە بۆ لابردنی ڕژێم، زیاتر کرانە قوربانی ئەو ( سەقامگیرییەی ) کە ئیدارەی بۆش بەپەرۆشیەوە بوو. هاندان بەناوی پرنسیپەکانی ئەمریکاوە بەرجەستە نەبوو.

جۆرە بیروبۆچوونێك، کە ئێمە پێیدەڵێن ریالیزمی بەرتەسك ( Narrow Realism ) بڕیارەکانی تیمەکەی بۆشیان بەسەرنەکەوتنەکانیشیەوە لە عێراق و شوێنانی تر رایەڵ دەکرد ، سەرۆکەکانی داهاتووش یەك لەدوای یەك کەلەپچە دەکات. بۆ ئەوەی عادیلانە بین، دەبێت ئەو راستیەش بسەلمێنین کەسیاسەتی بۆش لە ئاستی عێراقدا کاردانەوەی تەوژمێکی بەهێزی بۆچوونی سەردەمی سیاسەتی دەرەوە بوو، کە خاڵی سەرنجدان بریتی بوو لە شانازیکردن بە زاراوەی وەك ( REAL POLITIK یان REALISM )، هەرچەندە لە رووالەتدا، ریالیزم لەرووی توێژینەوەوە، ئایدۆلۆژی دووردەخاتەوە، بەڵام لە سەردەمی سەرۆکایەتی بۆشدا بوو بوو بە ئایدۆلۆژی. وە بیر و بۆچوونێك کە سیاسەتی دەرەوەی لەسەر بنەمایەك بەڕێوەدەبرد کە خزمەتی بەرژەوەندییە زیندووەکان بکات، نەك نموونییەکان یان پرنسیپە تەجریدییەکان. بۆش لەمامەڵەکردنیدا لەگەڵ چین و یەکێتیەتی سۆڤێت و یۆگۆسلافیا و بەدڵنیاییەوە لەگەڵ عێراقیشدا گرنگی بەم ڕێنماییە دەدا. ئەم جۆرە جیهانبینیە بوو بە خولیای زۆربەی زۆری دەزگەکانی سیاسەتی دەرەوە کە نامۆیی لە زیادڕەوی خۆدەرخستنی رەوشتی ئەمریکی لە شانۆی جیهاندا دەکرد. ئەم ریالیستە ماندوو نەناسە، کە خۆیان دابووە نەخشەوە ئەرکی فەرمی بەردەوام سیاسەتمەدارەکانیان لە ترسی داهێنانی سیاسەتێکی دەرەوە بە ئاگا دەهێنا کە لە زەمینەی ئەو رەوشتگەراییە واتە ( MORALISM ) بێت کە ئەوان کۆیان لێدەکردەوە.

لەیەکەم سەرنجەوە وا دەردەکەوێت، کە ئینکاریکردن لەم پرنسیپە دژی مەزاجی ئەمریکی بێت، بەڵام ئەم واقعیانە کە بەرگری خۆیان دەکەن، دەبێت ئەم

ریالیزمە بگێڕێتەوە بۆ سەردەمی گەورە پیاوانی حوکمی ئەمریکا وەك جۆن کوینس ئادەمز خاوەنی ئەو وتە ناسراوەی کە دەڵێت: ( ئەمریکا پێویستی بەوە نییە لە دەرەوە دێوو درنج ( MONSTER ) بگرێ و لەناوبەرێت، ئەمریکا لە خۆیدا ئاواتەخوازی ئازادی و سەربەستییە، خۆی لە خۆیدا، بە تەنیا پاڵەوانە و خۆپارێزە. ئەم شێوە ریالیزمەی کە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە و ئێستەش باوە، دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتمەدارە واقعیەکانی دوور لە عاتیفە کە لە ئەوروپای سەدەی نۆزدەهەمدا دەژیان وەك بسمارك و میتەریخ. وەچەکانی سەدەی بیستەمی ئەم سیاسەتمەدارانە لەسەر هەمان رێگەن، واتە لەسەر رێگەی ئەوروپییەکانن نەك باوباپیرە ئەمریکیەکانیان کە وڵاتەکەیان دامەزراندووە.

ئەویش مشتومڕ دژی گرژی رەوشتگەرایی لە سیاسەتی دەرەوەدا. ئەم خاوەنبیرانە جۆرە سیاسەتێکیان هێنایە کایەوە بەو شێوەیەی کە باوکی واقعیەت ( هانس مورگنتاو ) وەسفی کردووەو دەڵێت: ( بەرژەوەندییەکان لە هێزدا خۆیان دەدۆزنەوە. ) مۆرگنتاو و هەوڵەکانی سەپاندنی پرنسیپە نەتەوەییەکان لە دەرەوەی وڵات مەحکوم دەکات و بە نیشانەی ( کەم رەوشتی ) لە قەڵەمی دەدات. بەوردی بە نموونەی ( دیاردەی رەوشتی خاچپەرستی ئەم سەردەمەی وەسفکردووە. ڕیالیستەکان بە بۆچوونی خۆیان پێیان وایە، جەختکردنەوەی کەللەرەقەکان لەسەر هاوسەنگی هێز لە نێوان دەوڵەتەکاندا وەك لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئەوروپا هەبوو، زیاتر بوو ئەوەیە ئارەزووی شەڕانی وڵاتەکان کپ بکات وەك لەوەی چاکسازی لە جیهاندا بکات: ئەمەش لە دوایدا ڕیالیستەکانی گەیاندە پێشنیاری سەرەکییان کە دەڵێن: دەوڵەتێك دەبێ خۆی بخاتە قاوغێکەوە کە بتوانێت پەرژەوەندییەکانی خۆی بپارێزێت نەوەك تەرازووی هێز تێك بچێت.

بیرکردنەوەی ڕیالیستەکان هەرگیز بە تەواوی ئاوێتەی پێناسەی ئەمریکی بەرژەوەندی نەتەوایەتی نەبوو، کە تەنانەت لەسەردەمی دامەزرێنەرەکانی ویلایەتە

یەکگرتووەکاندا بۆچوونی زیاتری گرتۆتەخۆی، لە بابەت تەنها مادییەت یاخود ئیعتباراتی جوگرافیا. رۆماننووس جۆن دۆس پاسۆس جارێك وتی: ( خۆ جیاکردنەوە لە ئەورورپا هۆی سەرەکی بوونی ئەمریکایە. ) ئەوەی لە بیر و بۆچوونی ڕیالیستەکاندا هەیە بەتەواوی بەپێچەوانەی ناموێکردنە. لە ئەنجامدا، لە خواست و هێزی ئەمریکا بە ئاگا نەهاتن دژی، بابڵێن نموونەییەکانی سۆڤێت. ئەمەش بە تایبەتی لە کاتی حکومی نیکسۆندا کەوتەروو، کاتێ هێزی کیسنجەر کەوتە مشتومڕی دژی ( بە هەڵەداچوونی لە بۆچوونە سادەکاندا ) لە ئاستی کێشەکانی کۆمۆنیزمی سۆڤێتەوە. لە جیاتی ئەمە کیسنجەر کەوتبووە دووی ڕاگرتنی تەرازووی هێز لەگەڵ ( تەبایی ) واشنتۆن و مۆسکۆدا. بەپێی ئەوە دژی ئەو هەوڵانە وەستا کە لە پێناو باشکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادی سیاسی لە یەکیەتی سۆڤێت و بۆ ساڵەهای ساڵ ڕێنمایی ئەمریکییەکانی دەکرد، کە تا چ ڕادەیەك هەوڵدان بۆ ( گۆڕینی سیستەمی سۆڤێت لەژێر فشاردا ) بێ هوودەیە. بەڵام لە کاتێکدا کەلەوە دەچوو ویلایەتە یەکگرتووەکان دوای ئامۆژگاری کیسنجەر کەوتبێت لە بابەت ( خۆڕاگری لە ئاستی هێزی هێز و خۆ دوورخستنەوە لە هەوڵدانی کەڵك وەرگرتن لە ناسەقامگیری یان مشتومڕی ناوخۆی ناوچەکان. ) یەکیەتی سۆڤێت وەك کیسنجەر خۆی دانی پیادەنێت، وای نەدەکرد و لە بەرەو پێشچوونی ئایدۆلۆژیای جیۆگرافی یەکیەتی سۆڤێت بەبێ لادان بەردەوام بوون ئەمەش لە خۆیدا بوو بە هۆکارێکی سەرەکی کە ریالیزمی تەسك بکەوێتە ژێر هێرشی بەرفراوانی هەڵبژاردنەکەی ١٩٧٦.

لەلای چەپەوە، هەڵوێستی کیسنجەر، دەکەوتەبەر هەڵمەتی محکومکردنی لەلایەن جێمی کارتەرەوە، کە لیبراڵی سەردەمی ڤێتنام بوو، ئەوەندەش دەسەڵاتی سیاسی بەلاوە ئێسك قورس بوو، سیاسەتی دەرەوەی شەرمی لەهەموو شتێك دەکرد کە لە بەرژەوەندی نەتەوەیی بچێت. لەلای راستیشەوە ریالیزم دەوکەتەبەر ناموێ

کاندیتی هەڵمەتی هەڵبژاردن، ڕۆناڵد ریگن، دژە کۆمۆنیستێکی بەهێز بوو کە هیچ ناکۆکی بەدی نەدەکرد لە نێوان هێزی ئەمریکی و نموونەیەکانی.

یەکەم هەڵوێستی کارتەرو دوای ئەویش ریگن، باڵی کێشابەسەر دوانزە ساڵی داهاتوودا. بەڵام بە کۆتایی هاتنی جەنگی سارد کە ڕێکەوتی سەردەمی دەستەڵاتدارێتی جۆرج هێربرت ۆکەر بۆش بوو وەك داڤد هالبێرستام، ریالیزمی تەسك سەری هەڵدایەوە. ئەندامەکانی تیمەکەی بۆش، جەنگی سارديان ( وەك کێشەی نێوان دوو زلهێز ڕەچاو دەکرد. ) جیاواز لە تیمەکەی ریگن کە کێشەکەیان بە ( پێکداداانی نێوان نەگریس و ڕەسەن ) لەقەڵەم دەدا. کاتێ کە دنیا کەوتەبەر تەوژمی گۆڕانکاری، سیاسەتی دەرەوەی بۆش، کە بۆ خۆی بێزم لە ( خاچپەرستی ڕەوشتی ) دەکردەوە، بە شێوەیەك ڕەخسا کە زیاتر لەوی جیراڵد فۆرد دەچوو وەك لەوەی ڕۆناڵد ریگن، سەقامگیری لە پلەی یەکەمدا دانابوو. بەڵام یەکیەتی سۆڤێت ڕۆشت، یەکێك لە زلهێزەکان ئەم سەقامگیرییەی بە واتایەکی تر دەبەخشی کە جیا بوو لەوەی جیهانێکی دوو جەمسەری کە تێیدا ئەمریکا سەرقاڵی چاودێری یەکیەتی سۆڤێت بوو.

لەو کاتەدا، کە خوازیاری تیمەکەی بۆش ڕووەو سەقامگیری دەچوو، لە پێناو ئەم سەقامگیرییەشدا ناچار دەبوون کە پاڵپشتی جۆرە ڕژێمێك بکەن کە ئەمریکا خوازیاری ڕووخاندنی بوو. ڕاوێژکاری بۆش بۆ کاروباری ئاسایشی نیشتمانی، برینت سکاوکرۆف دێتەوە یادی کە بۆ خۆی دوودڵ بووە: ( لە دانایی قایلکردنی ئەڵمانییەکان هەتا یەکبگرنەوە، پرسیویەتی ئایا خراپی دابەشبوونی ئەڵمانیا لە چیدایە مادامێکی بارودۆخیان سەقامگیرە؟ پرۆسەی یەکبوونیان لەوانەیە زۆر سەر بەئاژاوە بێت و دەبێتەهۆی ململانێ. ) پەسەندکردنی نزام بەسەر ئازادیدا چەند وڵاتێکی تری گرتەخۆی لەوانە هەنگاریا، چیکۆسلۆفاکیا و پۆڵەندا کە لە ژێر حوکمی دیکتاتۆر یان ڕۆزسکیدا بوون. بۆش ئەم دیکتاتۆرەی بە دڵفڕێن و

قۆز تەماشا دەکرد. ئەم پەسەندکردنە، تەناتەت یەکیەتی سۆڤێتیشی گرتەوە، لەوێش تیمەکەی بۆش باوەشی بۆ پێشەوای کۆمۆنیست مایکل گۆرباچۆف گرتبووەوە و گومانیان لە بزوتنەوەی ئۆپۆزیسیۆن دەکرد کە لە ژێر فەرماندەی بۆریس یێلسندا بوو.لە راستیتدا، سکاوکروفت هەستی بە ئازار دەکرد کە دەیبینی یێلسن خشت بە خشتی یەکیەتی سۆڤێت لە دەست گۆرباچۆف دەکاتەوە. گرنگی خۆشگوزەرانی یەکیەتی سۆڤێت وای لە بۆش کرد لە ساڵی ١٩٩١دا گەلی ئۆکرانی بە ئاگا بێنێت لە وتەیەکیدا، کە لەوە دوا بە ( گارە گاری مریشکی کییێڤ ) ناوبرا و پێراگەیاندن کە ( ئەمریکا پشتگیری ئەوانە ناکات کە لە پێناوی سەربەستیدا دەیانەوێت چەوسێنەرێکی دوورە پەرێز بگۆڕن بە تاعونێکی ناوخۆ. ) بە هەرحاڵ، یەکیەتی سۆڤێت هەرەسی هێنا.

ئەوەش یەکەم رووداو نەبوو کە تێیدا ریالیزمە دوودڵیەکەی بۆش لە بۆچوونیدا گەیشتە ئەنجامێکی پڕ لە ئازار. لە چین، تیمەکەی بۆش لە ئاستی رێپێوانەکەی سەر بەدیمۆکراسی و قەتڵوعامەکەی گۆرەپانی تیانامین، بریتی بوو لە ( بێ تاوان دانانی رژێمی کۆمۆنیست لە پەکین. وەك سەرۆك بۆش بۆ خۆی مانگێك دوای رووداوەکەی تیانامین لە یادنامەکەیدا باسیکردووە دەڵێت: ( لە راستیدا هیچم لە چین نەدەویست لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی گرژبوونی پەیوەندییەکانمان ، ئەو کێشەیە بە بۆچوونی تیمەکەی بۆش ، کێشەی ئەمریکا خۆی بوو، لێرەوە بۆش و سکاوکرۆفت و جێگری وەزیری دەرەوە، ئیگلبێرگەری بە گەشتێکی نهێنی لە گەلاوێژی ١٩٨٩ دا نارد بۆ پەکین، بۆ چاککردنەوەی نێوانیان. بەدوای ئەمەشدا گەشتێکی تریش هاتەدی، لەو گەشتەدا وتاری رێزلێنانیان بەرانبەر یەك گۆڕییەوە، پاشان بۆش یاساییکردنی مانەوەی قوتابیانی چینی لە ئەمریکا ڕەتکردەوەو فشاری بۆ لابردنی ئابلۆقە بەکارهێنا ، لەگەڵ گەلێك کاری تری تەباییکردندا لەگەڵ پەکین.

لە یۆگسلافیا، لەوێوە کە سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ دەستیدایە سیاسەتی پاکتاوی نەژادی و لامدانەوەی تیمەکەی بۆش گۆڕانکاری تێدا نەبوو. لە پاساودانەوەی بێ هەڵوێستی خۆیدا، بۆش جەنگی باڵکانی بە ( نزگەرەدان ) وەسف دەکرد. یان وەك داڤید گومپێرت، کە لە دواییدا بە کارگێڕی فەرمی بۆسنیا دامەزرێنرا، وتی: ( لەدوای جەنگی کەنداو ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕۆڵی سەرەکی لە یۆگۆسلافیا بدیبایە، ئەوساکە ئەمریکا بە پۆلیسی نێودەوڵەتی ناودەبرا. ) ئەمەش کارێك بوو کە سەرۆك بۆش نەیدەویست بیکات. لێرەوە و زیری دەرەوە، جێمس بەیکەر کە چەند مانگێك لە هاتوچۆی قورمیشکراودا بوو، بۆ کاری ئاشتیخوازی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا بەبێ کەم و زیاد یەك ڕۆژی لە بەلەگراد بردەسەر بۆ هەوڵی دوورخستنەوەی کارەساتێکی تر. بەیکەر لە یادنامەکەیدا وا وەسفی میلۆسۆڤیچ دەکات کە هەمان ئیشتیهای سەدامی هەبێت. )، بەلام سربیا تواناکانی عێراقی نەبوو، لەبەر ئەوە ئەمریکا زۆر گوێی نەدایە شەڕانگێزی میلۆسۆڤیچ، لە جیاتی ئەوە کێشەی یۆگۆسلافیای بە کێشەی سەروەری خاك لەقەڵەمدا. گوێ مەدەرە ئەوەی کە سەرۆك بۆش باوەڕی وابوو کە کێشەکە کێشەی سەروەری دەوڵەتێکە کە لە راستیدا وجوودی نەماوە، بەیکەریش لە ئاستی خۆیەوە وتی: ( ئێمە سەگێکمان لەم شەڕەدا نییە. )

هەرچۆنێك بێت، لە عێراقدا بوو کە فەلسەفەی سیاسەتی دەرەوەی تیمەکەی بۆش بەئاشکرا خۆی پیشان دەدا. لێرەشدا نرخی رەوشتی لە هەموو شوێنێکیتر بەرزتر بوو. هەتا ئێستەش ئەندامانی ئەم تیمە پشتگیری لە هەڵوێستی ( REALISTIC )ی خۆیان لەگەڵ سەدامدا دەکەن. بەلام تا چ ڕادەیەك ڕیالیستیك بوون لە لاواندنەوەی دیکتاتۆرێکی شەڕەنگێزدا، بە هەفتە و بە مانگ و بەسالان پێش ئەوەی کوەیت داگیربکات و تا چ ڕادەیەك واقعی بوون کاتێك دوا بەدوای جەنگی کەنداو عێراقێکی سەقامگیری ژێردەستی سەدامیان پەسەند دەکرد بەسەر بەدیلێکی

دوور لە چەوساندنەوە. بەپێی جیهانبینی تیمەکەی بۆش هەموو بڕیارەکان تەواو ماقول بوون. ( بە لوبنان بوونی عێراق ) ( بنیاتنانی نەتەوە )، ( ئەو جۆرە دیمۆکراسییەی بیابان کە خەڵکی لەپاڵ قورئاندا رۆژنامەی فیدراڵییەکان دەخوێننەوە. ) ئەمانە ئەو زاراوانە بوون بۆ پاساوی قەناعەتکردن بە وەستاندنی جەنگی کەنداو پێش تەواوبوونی و چاوپۆشی لە قەتڵوعامی هەزار بە هەزاری عێراقییەکان کرا. دوانزە ساڵیش دوای ئەوە، سەدام دەقەرەکە و جیهانی خستۆتە ژێر مەترسی چەکی کۆمەڵکوژەوە و ئێمەش هێشتە لە ئاکامی ئەم جۆرە ( ریالیزم )ەدا دەژین.

# بەشی پێنجەم

## خوازیاری لیبرالیزم ( کلینتۆن )

## WISHFUL LIBERALISM ( CLINTON )

سەیر و سەمەرە ئەم باسەیە کە ئێستە دێتە پێشەوە، کاتێك بیل کلینتۆن خۆی بۆ پۆستی سەرۆکایەتی کاندیت کرد هێرشی بۆ سەر تیمەکەی بۆش دەکرد کە ( نەیانتوانیوە وانەیەك لە تەباییکردنەکەیان ( APPEASEMENT )* لەگەڵ سەدام حوسێندا وەربگرن و کورد و شیعەشیان بەجێهێشت تا بە دەردی خۆیانەوە بتلێنەوە. ) گوایە بە پێچەوانەی ئەوانەوە، ئیدارەکەی ئەو ( خۆی ئاوێتەی پەیوەندی ستراتیژی ناکات لەگەڵ رژێمە ترسناك و چەوسێنەرەکاندا. ) ئیدارەی تازە بەڵێنی وابوو کە بە هۆی پتەوکردنی ئابڵوقەی نەتەوە یەککگرتووەکان و یاریدەدانی بەردەوامی ئۆپۆزسیۆنی عێراق، دیکتاتۆری عێراق لە پەلوپۆ دەخات و لە قەفەسی دەنێت. لە مانگی ئابی ١٩٩١ دا، جێگری سەرۆك، ئەلگۆر، نامەیەکی بۆ کۆنگرەی نیشتمانی عێراق نارد کە تێیدا سووربوونی ئەمریکای لەسەر هاوبەشی پتەوی لەگەڵ خەباتی ئۆپۆزسیۆندا دەربڕی و بەڵێنیشیدا کە پشتیان تێنەکات، چونکە وەك بۆ خۆی دەڵێت: ( ئامانجی ئێمە روون و ئاشکرایە: ئەوەیە کە راستی ئەم رژێمە بخەینە ڕوو، کە رژێمێکی تاوانبارە و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی نایگرێتە خۆی، بە هەڵسەنگاندنی ئێمە ئەم رژێمە هەروا دەمێنێتەوە و رێگەی چارەسەری نییە. )

---

* بە ڕێکەوتنێک دەووترێت کە لەگەڵ دوژمندا سازبکرێت بەبێ گوێدانە پرنسیپی رەوشتی. ( وەرگێڕ )

بۆ ئەم مەبەستەش کاری تیمەکەی کلینتۆن وابوو کە ملیۆنەها دۆلار بە شێوەی یارمەتی بدات بە ئۆپۆزسیۆن و ( CIA ) چاوساغییان بکات. ئالگۆر و وەزیری دەرەوە وارن کریستۆفەر و راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی ئەنتۆنی لەیك بەڵێنیان دەدا کە یارمەتی زۆرتریش بەرێوە دەبێت. هێزە نەیارەکانی عێراقیش ئەم بەڵێنەیان بەدڵ نرخاند و لە بەهاری ساڵی ١٩٩٥ دا، هێرشێکی پەرچدانەوەیان کردەسەر دوو فرقەی سوپای عێراق و سەدامیان پەرێشان کرد. لە ترسی ئەوەی ئەم پێکدادانە پەرەبسێنێت و ویلایەتە یەکگرتووەکان رابکێشێتەناو گێژاوی بەرەنگاری لەگەڵ عێراق دا، لە ناکاو کۆشکی سپی فەرمانی بە ( CIA )دا کە چیتر کاری پشتگیری نەکات و پێشەوا کوردەکانی ئاگادارکردەوە کە ( ویلایەتە یەکگرتووەکان بە هیچ شێوەیەك پشتگیری ئەم ئۆپەراسیۆنانە ناکات. ) لە چاوپێکەوتنە رۆژنامەوانییەکاندا تیمەکەی کلینتۆن بیانوویان بۆ ئەم ناپاکییەی خۆیان دەدۆزیەوە و بە بڕیاری دیراسەکراویان دادەنا. گوایە ئەم هێزە نەیارانە لەسەر بنەمای گەوجێتی دروست بوون. لەم بارەیەوە یەکێکیان وتی: ( ئەم کوڕانە بێ کردەوەن و ناتوانن هەڵبکوتنە سەر ( ELEVEN - 7 ** ) گیش. ) یەکێکی تریش بەدەنگی بەرزەوە وتی: ( ئەمانە مێشوولە و مەگەزی گیانی سەدام نەبێت هیچ شتێکی تر نین. ) ئەم ڕوو وەرچەرخاندنەی ئیدارەکەی کلینتۆن گەشتە ئەو ئاستەی کە لە ساڵی ١٩٩٦ دا، کاتێك سەدام لە ( بەهەشتی پارێزراو ) دا لە باکوری عێراق پەلاماری کوردەکانی دا، ئەو بەهەشتەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەڵێنی پاراستنی دابوو. نەك هەر نەیانپاراستن بەڵکو فەرمییە ئەمریکییەکان خۆیان قوتارکرد و فەرمانده عێراقییەکانیان بەجێهێشت و بەلای کەمەوە سەد کەسیان

** زنجیرە سوپەرمارکێتێک بوو لە ئەمریکا حەوت ڕۆژ لە هەفتەیەکداو ڕۆژی ١١ کاتژمێر دەکرایەوە، زوو زوو هەڵدەکوترایە سەریان و ڕووتدەکرانەوە. ( وەرگێر )

دەست بەجێ دووچاری کوشتن بوون. لە گەرمەی ئەم قەتڵوعامەدا وەزیری بەرگری ولیام پێری لە شیکردنەوەکەیدا وتی: ( بەرژەوەندی ئێمە لە پاراستنی کوردەکاندا، بەرژەوەندی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەییمان نییە. )

بەسادەیی، بەشێك لە کێشەی سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئاستی عێراق، دوو دڵی بوو لە بەکارهێنانی هێز وەك ئامێرێکی سیاسی. لای ئەندامانی تیمەکەی کلینتۆن وا باش بوو کە ڕۆڵی هێزی ئەمریکی هەر لەوەدا بێت، کە کار بکاتە سەر سەدام و تێوەی ژەنێ و لە چەوتی ڕێگەکانی ئاگاداری بکاتەوە. بەم شێوەیە وا دەردەکەوێت، کە ئەو زاراوانەی لە دوای جەنگی ڤێتنامەوە لە لیکسیکۆنی سەربازیدا سڕابوویێتەوە وەك ( هێما ) و ( پەیام ) جارێکیتریش هێنرابێتەوە کایەوە. سەبارەت بە کاری شەڕفرۆشتنی سەدام لە ساڵی ١٩٩٦ دا بە باکوری عێراق، لە بابەت ئاشکراکردنی لێدانەکەی بەغداوە سەرۆك دەڵێت: ( مووشەکەکانمان ئەم پەیامەی خوارەوەیان بۆ سەدام دەبرد: ئەگەر خەڵکەکەی خۆت بەکاربهێنی بۆ ترساندنی دراوسێکانت، ئەوە دەبێت نرخەکەی بدەیت. ) سەرۆك لەسەر ئەم قسانە دەڕوات و دەڵێت: ( دەستێوەردانی باکوری عێراق پەسەند نەکراوە و دەبێت باش بزانیت کە کرداری نامروەتانەشت ئاکامی هەیە. )

لێدانی ئەم جارەیان ئەوەندەی لێدانەکەی ساڵی ١٩٩٣ ڕەنگی نەدایەوە، کاتێك دەزگەکانی هەواڵگری بەغدا مووشەکبارانکران لە تۆڵە سەندنی هەواڵی کوشتنی سەرۆکی پێشوو ( بۆش )، لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ کوەیت. ئەم هێرشەش، هەر وەك باڵیۆزی ئەمریکا لە نەتەوە یەکگرتووەکان، مادڵین ئۆلبرایت، باسی دەکات و دەڵێت: ( پەیامێك بوو بەرەو عێراق ڕەوانە کرا، پەیامێك بۆ دەربڕینی ئەو ڕاستییەی کە ئێمە هەرگیز ڕێگە بە تیرۆریزم نادەین. ) بەڵام جێگری سەرۆك کەوتە پەلە و وتی: ( پەیامێك نەبوو بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام حوسێن. )

پەرۆشی بۆ ڕاوەستاندنی کتوپڕی ئەم مووشەکبارانەی کلینتۆن گاڵتەجاڕی بوو، دوای هەموو شتێك، ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی تیمەکەی کلینتۆن چووە ئۆفیسەکەیەوە و وەك ( مەیلی هەمە لایەنی ) لە قەڵەم دا کە فەرمایشتێکە بۆ بەکارهێنانی هێزی ئەمریکی لەگەڵ، یان لە جیاتی، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. بەڵام ئەو ( فیاسکۆ ) یەی کە بوو بەهۆی کوشتنی پاسەوانەکانی ئەمریکا لە سۆماڵ، لەو وڵاتە تیمەکەی کلینتۆن سەربازەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی خستەوە ژێر فەرمانی نەتەوە یەکگرتووەکان و فەرمایشتەکەی پوچەڵ کردەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانە کلینتۆن کەوتەبەر رەخنەی خەڵك، کاتێ دوای شەڕە تفەنگێك پاشەکشەی بە هێزەکانی لە سۆماڵ کرد. واتە سوار بوون عەیبێك و دابەزین دوو عەیب. لە ئاکامی ئەم شکستەدا کۆشکی سپی بە ناچاری بایدایەوە سەر نموونەیەکی تری لیبراڵی لە بەکارهێنانی هێزدا: فەرمایشتێك بۆ مۆڵەتدان بە کاری سەربازی تەنها بۆ دژی ئەو نیشانانەی کە لە پەلوپۆ کەوتوون یان ئەو ئامانجانەی لە ژیاندا نەماوون.

لەگەڵ هێرشکردنە سەر عێراق بە ( نووکە دەرزی )، ئەم ئیدارەیە بانگەشەی خەڵکی ئەمریکای دەکرد کە قایلبن و شانازی بە هێزی وڵاتەکەیانەوە بکەن و ئەوەش بزانن کە مامەڵە لەگەڵ عێراقدا کاری ستراتیژ نییە. و هەر لەبەر سوارچاکی هێزی سەربازییە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان خۆی لەسەر قاڵبوون لە بابەت ئەنجام و سیاسەت دوور دەخاتەوە. لێرەوە، لەوەڵامدانەوەی هێرشەکەی عێراق لە ساڵی ١٩٩٦ دا بۆ سەر شاری هەولێری باکوور، هەڵوێستی تیمەکەی زیاتر لۆجستی بوو، کاتێك کەوتنە داپڵۆسینی جێگاکانی هێزی بەرگری ئاسمانی عێراق لە خوارووی بەغدا، چونکە ئەم هێزە لە خۆیدا پەرتوبڵاو بوو. ئەمریکا نەیتوانی بە باشی بیانپێکێت. بەهەر حاڵ، بە ٢٤ سەعات دوای ئەم لێدانە، کلینتۆن کەوتە ئیدیعا کردن، کە گوایە سەرکەوتنی مەزن بە دەست هاتووە و ( هێزەکانی عێراق

پاشەکشەیان کردووە و پەرتوبلاو بوونەتەوە. نەشکستی ستراتیژەکەی لە باکووری عێراق و نەنزیکە هەرەسهێنانی هێزە هاوپەیمانییەکان وای لەسەرۆك کلینتۆن کرد کە پاشگەزی لەم ئدیعایانە بکات. لە راستیدا، ( تەرازوو ) لە نێوان ئیدیعا و راستیدا، بوونە هێمای زۆربەی زۆری ئەو هێرشانەی ئیدارەی کلینتۆن دەیکردە سەر عێراق. هەرچەندە لێدانەکەی ساڵی ١٩٩٣ تەنها بەشێکی لە بینای پاسەوانەکان روخاند، جاری ئیدارە وابوو، کە گوایە ئەم هێرشە بە شێوەیەك کاریگەر بوو ( کە عێراق جارێکی تر نەتوانێت بیر لە پلانی تیرۆریستانە بکاتەوە. ) ئەمانە دەقی قسەکانی گۆر، جێگری سەرۆك بوون. ئەگەر درز بوونی بینایەك بە ( لێدانی کاولکەر ) باسبکرێت، لەوێشەوە، پێشنیارە کتوپڕەکەی وەزیری دەرەوە، وارن کریستۆفەر بێ بایەخ دەبێت کە دەڵێت: ( نەك هەر نەمانهێشت ئەمریکاییەکان بپێکرێن، بەڵکو ژیانی زۆربەی عێراقیەکانیشمان پاراست. ئەم لێدانە هەرچۆنێك بێت، سنووری بۆ رەفتاری سەدام دانەنا، بەڵکو بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەمریکاوە، گۆڕەپانی مانۆڕی سەدامی فراوانتر کرد و تاکتیکی زۆری تری بەکارهێنا.

ئەمە ئەو پەیامە بوو کە لە سیاسەتی ئەمریکاییەکانەوە بە سەدام گەیشت، ئەو سیاسەتەی کە بە تایبەتی لە کاتی دووەم تیمی کلینتۆندا، زیاتر ئەوە روون بوەوە، کە ئەم ئیدارەیە جەختی لەسەر ئامانجی رژێم گۆڕینی عێراق کردووە. هەر لە هەمان کاتدا لە وەڵامدانەوەی یاخیبوونی رژێمی بەغدا لە ئاستی چەك پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، کۆشکی سپی دارژاندنی هێزەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی بەشێوەی خۆهەڵکێشانەوە، لە ساڵی ١٩٩٧ و ١٩٩٨ دا دەست پێکردەوە. لەپەنای ئەمەشدا، وردە باسی هاتوچۆی فرۆکەی جەنگی بارهەڵگری چارەڕەش و جموجوڵی شەرە تەیارە دەدرکێنرا. کاتێ کە ئەم جۆرە دارشتنە

کەوتەروو، زۆری پێنەچوو ئیدارەکەی کلینتۆن کەوتە پیشاندانی ( گەلا هەنجیر [*] ) و کەوتە پشت گوێخستنی ئەرکە راستەقینەکان، کە ئەم دارژێنە سەربازییە لە پێناویدا هاتە کایەوە. لە سەرەتای ساڵی ۱۹۹۸دا بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ سەدامدا، ، بە ئاشکرایی سەر لێ تێکچوونی تیمەکەی کلینتۆن کەوتەروو، کلینتۆن لە بەرانبەر رێگرتنی بەردەوامی چەك پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کۆتایی ساڵی ۱۹۹۷دا لە لایەن سەدامەوە، تەنها هەڕەشەی ئەوە بوو: ( کە ئەگەر بێت و ئەم جارە هێز پێویست بێت، ئەوا ویلایەتە یەکگرتووەکان توانای عێراق بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کۆکوژ لەناو دەبات. هێشتا هەر دارژاندی هێز لە کەنداو بەردەوام بوو، ئیدارەکە چووەوە پێستەکەی خۆی. ئایا بۆ لەناوبردنی توانای بەرهەمهێنی چەکی کۆمەڵکوژ ویلایەتە یەکگرتووەکان هێزی زەمینی بەکاردەهێنێت؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر. ئایا هێزی ئاسمانی دەتوانێت چەکەکانی سەدام لەناو بەرێت؟ لە راستیدا ناتوانێت، چونکە سەدام بەشی زۆری جبەخانەکەی لە ژێر زەویدا شاردۆتەوە. واتە کۆشکی سپی خۆی دووچاری هەڵمەتێکی ( نەشتەرگەری ) کرد کە چوار پێنچ رۆژێك دەخایەنێت و ئەنجامەکەشی لە کەمکردنەوەی توانای عێراق، زیاتر تێنا پەڕێت.

وەك بەرپرسەکانی ئیدارەی کلینتۆن بە بەردەوامی جەماوەر و سەدامیان ئاگادار دەکردەوە، هەموو بەکارهێنانێکی سەربازی دژی عێراق، بە شێوەیەك دیزاین کراوە کە کەمترین زیانی گیانی چ بە ئەمریکی و چ بە عێراقی بگەیەنێت. وێرانکردنی لەپاڵدا نەبێت، دوور بێت لە رەوشت سووکی و داخوازییەکان بە نەرمی بە دەستبهێنرێت نەك بە سەرکەوتنی هێز، ئیدارە بە هەڵگیرسێنەری جەنگ لە قەڵەم بدرێت. بۆچوونی جەنگ کۆن بوو بوو یان باوی نەما بوو، لەم ڕووەوە مادلین

---

[*] واتە بەکاری چەواشەکردن هەستا. ( وەرگێڕ )

ئۆلبرایت دەڵێت: ( ئێمە باسی بە کارهێنانی هێزی سوپایی دەکەین، باس لە بابەت جەنگەوە ناکەین. ئەمە لە خۆیدا جیاوازییەکی گرنگە. ) بەڵام سووربوونی ئیدارەی کلینتۆن لەسەر ئەم جیاوازییە بە هاوشانی رەچاوکردنی لیستێکی بیانووی دوور و درێژ بەر لە بەکارهێنانی هێزی سەربازی بە تەواوی ئەم بە کارهێنانەی بێ بایەخ کردبوو.

دوای ئەم هەموو تووڕە بوون و فوو لەخۆکردنە ، ئۆلبرایت بەرەو نیویۆرک فڕی و داوای لە عەنان کرد کە رێگە بە ئەمریکا بدات ( شانی لێ دابدات و واز لە کاری جەنگی بهێنێت. ) لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٨دا، کاتێك کە مانۆڕکاری سەدام لە ئەندازە دەرچوو بوو، تیمەکەی کلینتۆن بە مووشەك لێدانێکی تر وەڵامی دایەوە. لەبەر تەسکی ئامانج و بوار و کات و ئاکام، هەڵمەتی رۆژێك هیچی بە دەست نەهێنا، لەوە زیاتر کە چەك پشکنین هەرەسی هێنا. لە ئاکامی ئەمانەشدا، لە کاتی نزیك بە کۆتایی حوکمی کلینتۆن، عێراق بێجگە لە عەرەبی سعودی زیاتر لە هەموو وڵاتێك نەوتی دەناردە دەرەوە و داهاتی لە کاتی پێش گەمارۆدان زیادتر بوو. ئەو داهاتەشی بۆ پڕکردنەوەی جبەخانەکەی بەکاردەهێنا.

ژەنەراڵ ئەنتۆنی زیینی، فەرماندەی هێزەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەراست، لە بەرچاوی خەڵکی، نەیارەکانی سەدامی خستەبەر هەڵمەتێکی دژوار، لە وتاردان و چاوپێکەوتنندا دەیووت: ( عێراقێکی لاوازی پارچە پارچەکراوی شڵەژاو .... لە ئێستەی سەدامێکی سنوور بۆ دانراو یان لە قەفەسنراو، خەتەرناکتر دەبێت. ) لە ئاستی خۆشیەوە، راوێژکاری کلینتۆن بۆ ئاسایشی نیشتمانی، پلانی لابردنی سەدام حوسێنی بە کێشەی ( کەنداوی بەرازەکان [*] ) لە قەڵەم دەدا.

---

[*] واتە کێشەی سەردەمی جۆن ئێف کەنەدی، کاتێ یەکیەتی سۆڤێت ساروخێکی زۆری بردە و ئەمریکا لە کەنداوی بەرازەکان، لە کوبا دامەزراند. ( وەرگێڕ )

کۆشکی سپی تەنها کەمێك لەو پارەیەی بەخشی بە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، کە کۆنگرێس بۆ بە هێزکردنی تەرخانی کردبوو. لە جیاتی ئەوە و زارەتی دەرەوە بەو بڕە پارەیە پشتگیری بەڕێوەبردنی پرۆگرامی ململانێی بە نەیارانی عێراق دەکرد، کە دانەری کتێبی ( GETTING TO YES ) دایمەزراند بوو.

لەراستیدا، ئەو فەرمانبەرانەی کە ئەرکی پشتگیریکردنی نەیارەکانی سەدام خرابووە ئەستۆیان، بەردەوام سووکایەتیان بەم نەیارانە دەکرد. بێرگەر، کە لە وتارێکدا وەسفی لابرنی سەدامی بە ( فەنتازی ) وەسفکردووە، توانی کینیت پولاك، توێژەرەوەی پێشووی ( CIA )، لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نیشتمانی دامەزرێنێت. حساباتی پولاك پێش هەڵمەتی گەردەلوولی بیابان، بە پێی قسەی واشنتۆن پۆست وابوو، کە عێراق بەرەنگارییەکی زۆر پتەو بکات. وە بە بۆچوونی خۆی کاتێك کە لە ئیدارەکەی کلینتۆندا کاری دەکرد، چاك وابوو کەس بەوە قایل نەکرێت کە ( کۆنگرەی نیشتمانی عێراق ) شایەنی یارمەتیدان بێت. هەر لەم بوارەوە، فرانك ریچاردۆن، کە ڕێکخەری کاری ڕزگارکردنی عێراق بوو، لە وەزارەتی دەرەوە وتی: ( ئێمە هیچ بە ئۆپۆسیۆنی عێراقی نادەین، ئەگەر شەڕکەری خۆبەختکەریان نەبێت. )

لەساڵی ٢٠٠٠دا، کاتێك لە بەغدا سەر لە نوێ فڕۆکەخانەی سەدامی نێودەوڵەتی کرایەوە، بە کۆمەڵ سیاسەتمەدار و بازرگان لە روسیا و فەرەنسا و ولاتە عەرەبییەکانەوە، بە گەشتی ئاسمانی نایاسایی ڕوویان دەکردە عێراق و لەم فڕۆکەخانەیە دادەبەزین. هەموویان بە مەبەستی ئیشکردنی نایاسایی هاتبوون، کە لەگەڵ ڕژێمی دوور لە یاسادا ئەنجامی بدەن. واشنتۆن نەك هەر لەوەدا سەرکەوتوو نەبوو کە ئیدانەی هەڵوەشاندنی گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات، بەڵکو کەوتیشە گفتوگۆ لەگەڵ کۆمیتەی گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی گەشتی ئاسمانی بۆ عێراق یاسایی بکات، بۆ ئەوەی وا دەرنەکەوێت کە گەمارۆ هەڵوەشاوەتەوە. لە کاتی ڕوودانی ئەم کارانەدا، ئەندامانی هاوپەیمانی جەنگی

کەنداو، یەك لەدوای یەك باڵیۆزخانەی خۆیان لە بەغدا کردەوە و خەڵکی شکۆداری وڵاتەکەی خۆیان دەنارد بۆ لای سەدام، لە پێناوی پیشاندانی هاوسۆزی و شیوەنگێران لە داخی ئەو گەمارۆ ناعادیلانە رەوشت نزمە. لەم باروودۆخەدا، کە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بە هێواشی خۆی دەدا بە دەستەوە، بەوە قایل بوو کە بڕی فرۆشتنی نەوتی عێراقی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دیاریکراو نەبێت، چونکە لەو راستیە ئاگادار بوون کە عێراق دوور لە چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان بایی دوو بلیۆن دۆلار ساڵانە نەوت بە قاچاخ دەفرۆشێت. لە گۆڕەبانی سەربازیدا هەر ئەوەندەی لێدانەکەی ساڵی ١٩٩٨ راوەستا، بێرگەر و ئۆلبرایت کەوتنە فشارکردن بۆ کەمکردنەوەی چالاکی فرۆکە جەنگییەکانی ئەمریکا کە لە کاتی جەنگی کەنداوەوە لە کاردا بوون. بەڵام فرۆکە جەنگییەکانی عێراق بەردەوام بوو لە تەحەداکردنی هێڵەکانی قەدەغەکراوی فڕین و هێزی بەرگری ئاسمانیش بەردەوام تەقەیان لە فرۆکەکانی ئەمریکا دەکرد. هەڵمەتی ئاسمانی بەردەوام بوو، بەڵام بەشێوەیەکی سەیر و زانخواز ( فضولي )، چونکە ستراتیژی خۆی گۆڕی. لە باتی ماددەی تەقینەوە، بۆمبای دووهەزار پاوەنییان بە کۆنکرێت پڕ دەرکردەوە و بۆمبارانی عێراقیان پێ دەکرد. وەك کۆلۆنێل میکائیل ۆتەرز، وتەبێژی ئۆپەراسیۆنی هێزی ئاسمانی هاوپەیمانی لە باکوری عێراق ڕایگەیاند: ( ئامێرەکانی ڕێنیشاندەر هێشتا لە جێی خۆیانن، بەڵام چیمەنتۆ لە تەقەمەنی هەرزان ترە. ) تەنها نرخ هۆ نەبوو کە ئەمریکا دەیویست بە ماددەی بیناسازی عێراق بۆردومان بکات. بە قسەی فەرمییەکی ئەمریکی: ( ئەم شێوەیەی کە ئێمە کاری پێدەکەین لە سنووری قبوڵکراو دایە، ئێمە نامانەوێت کار لە کار بترازێنین. )

بەڵام هەرچۆنێك بێت، کار لە کار ترزان و بە شێوەیەکی زەق ئەم تێکچوونە دەکەوتە بەرچاو کاتێك ئیدارەی کلینتۆن بڕیاریدا پێکدادان لەگەڵ سەدام، لە ئاستی کێشەی چەك پشکنیندا نەکات. لەم بارەیەوە پۆلاك نووسیویەتی: ( لە کاتی

گفتوگۆکانیدا لە ساڵی ٢٠٠٠دا، سەبارەت بە پلانی گۆڕینی رژێمی عێراق، کاربەدەستێکی باڵای ئیدارەی کلینتۆن وتی: ( سەرۆك وای پێ باشە کە بەر لە تەواو بوونی ماوەی سەرۆکایەتی خۆی ئاشتی لە نێوان عەرەب – ئیسرائیل پەرەبسێنێت، حەز لە شەڕی نێوان عێراق و ئەمریکا ناکات. ) ئەم حەزەی کلینتۆن لە پایزی ساڵی ٢٠٠٠دا ئاڵۆزکا، کاتێك کە سەرۆکی تازەی پشکنەرانی چەك، هانز بلیکس ئامادەباشی تیمەکەی ڕاگەیاند بۆ گەڕانەوە و کارکردن لەناو عێراق دا. ئەم گەڕانەوەیە دەبووایە زووتر ڕووی بدایە ( چونکە کاتێك کە پشکنەران لە مەیداندا نەبن، دەبێت پابەندی وەسیلەی تەکنیکی نیشتمانی خۆمان بین، ئەم وەسیلانە ناتوانن هەمان ڕێژەی کارکردن ئەنجام بدەن. ) هێشتا ئیدارەی کلینتۆن خۆی لە بەرەنگاری دەپاراست و بە پێی قسەی واشنتۆن پۆست، ئەمریکا و روسیا بە دوودڵی، پلانێکی دبلۆماسیان بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان ساز کردبوو، کە ڕێگر بێت لە گەڕانەوەی بلیکس. چونکە هیچ لایەکیان نایانەوێت. ( لە کاتێکی نەگونجاودا پێکدادانێکی تر ڕووبدات. )

لەراستیدا، ئۆلبرایت و زیری دەرەوە، بەکارهێنانی چەکی دژی سەرپێچیەکانی سەدام ڕەت دەکردەوە. بلیکس، کاتێك کە پلانەکەی گۆڕدرا وتی: ( لەوانەیە بە بۆچوونی کەسانێکی زۆر وابێت، کە هیچ ڕوودانێکی گەورە پێش هەڵبژاردنی ئەمریکا روونەدات، بۆچوونەکەشیان ڕاستە. )

نەمانزانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا چاویان بەرایی ئەوەی نەدەدا کە ئەم ئیدارەیە لە هیچ پرۆژەیەکدا، جگە لە هەڵبژاردنەکەی جاری دووەمی، تۆکمە و سەرکەوتوو بن، هەموو پێشنیارێکی یەکبوون لە ئاستی عێراق پشتگوێ دەخرا. کاتێك کە تیمەکەی بۆش، لە کانوونی دووەمی ١٩٩٣ دا ماڵئاواییان کرد، فەلسەفەی سیاسەتی دەرەوەشیان لەگەڵ خۆیاندا پێچایەوە، بیل کلینتۆن هاتەپێشەوە و ڕەخنەی ئەوەی لێگرتن کە نەیانتوانیوە دەرك بەوە بکەن: ( لە جیهانێکدا کە

سەربەستی نەك چەوساندنەوە بە پەلە و توندرۆیە و پشت بەستن تەنها بە هێز، گاڵتەجارییە و نەزۆك دەبێت. ) گوایە کلینتۆن خۆی لەم گاڵتەجاڕیە لە ئاستی سیاسەتی دەرەوەدا، دوور دەخاتەوە ، بەڵام هێشتا تازە ڕێوڕەسمی بوون بە سەرۆکی تەواو بوو بوو. دەربارەی هەڵوێستی بەرانبەر بە سەدام وتی: ( من، تا دواهەناسە باوەڕم بە گفتوگۆکردن هەیە. )

زۆر بە کورتی، پێشنیاری کلینتۆن بە پێچەوانەی ریالیزمەوە بوو، لە جیاتی ئەوە گروپێکی لیبراڵیخواز چاوساغیان دەکرد کە بە بۆچوونی ئەمانە: ( کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و دەزگەکانیان بە مەزنترین سەرچاوەی شەرعی جیهانی رەچاو دەکرد. بۆ سەر سووکی و ڕەحەتی خۆیان، وایان بە باش دەزانی کە بەکارهێنانی هێزی ئەمریکی تەنها لە ئاستی خۆیانەوە نەبێت، زیاتر مەیلی سیاسەتێکیان دەکرد کە پشت بە ( گوێزەرەکە ببەستن نەك بە گۆچانەکە ) وەك لە ڕێککەوتننامەکانی کۆنتڕۆڵی چەك و ڕێککەوتننامەکانی نێودەوڵەتی و پیاچوونەوەی بەکارهێنانی هێزدا دەریان بڕیوە. ئەم پاڵنەرە وەك پەسەندکارییەك لە سیاسەتی دەرەوەدا پەیڕەو کراوە، کە ( نموونەکەی – واتە ئایدیالیزمەکەی – بە دووسەرە وەهمی و یاساییشە. ) لە رابردووشدا کەوتبووە خانەی ( UTOPIANISM [*] )، هاوبەشیکردن – لە رووی سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، دامەزراندنی ( کۆمەڵەی نەتەوەکان ( عصبة الامم )، داهێنانی ڕێککەوتننامەی کێلوگ بریاندە، کە لە ساڵی ١٩٢٨دا بۆ نایاساییکردنی جەنگ و پتەوکردنی باوەڕ بە ڕێککەوتنەکانی کۆنتڕۆڵی چەك لە جەنگی سارد دا، بەڵام ئەم ڕێککەوتنامانە لە لایەن یەکیەتی سۆڤێتەوە بەردەوام سەرپێچی لێ دەکرا.

---

[*] یۆتۆپیانیزم: ئەو حاڵەتەیە کە هەموو شتێک بە تەواو رەچاو دەکرێت.

ئەم گرژییەی لیبرالیزم، لە میانەی ٢٠ ساڵەی جەنگی سارد دا لە ژێر چاودێری لیبراڵە ماسولکەدارەکاندا بوون. لەوانە هاری ترومان و جۆن ئێف کەنەدی، ئەوانەی گوێیان نەدەدایە ئەوەی چ لە دەرەوەی ئەمریکا ڕوودەدات، بەڵام کۆبوونەوە لە دەووری سیاسەتی دەرەوەی لیبراڵی، لە جەنگەڵەکەی ڤیێتنامدا بوو بە هەڵم و چوو بە ئاسماندا. بەلای خواستیارە لیبرالیزمەکانیشەوە وەك گەلێ کەسی تریش، هێزی ئەمریکی بە شێوەیەکی بێ چارەسەری خەڵتانی تاوانباری جەنگ بووە. گومانکردن لە هێزی ئەمریکی کە لەگەڵ لیبراڵی سەردەمیشدا سروشتییە، ئێستە بۆتە نەیاریکردن لە ئاستی بەکارهێنانی هێزی ئەمریکی لە هەر شوێنێکی جیهاندا بێت. ئەم سۆزە بوو بە بۆچوونێکی هاویەش لە نێوان گەلێك پێشەوای پارتی دیموکراتدا. لەساڵی ١٩٧٢ دا، کاندیتی دیموکرات بۆ سەرۆکایەتی، جۆرج ماك گۆڤەرن، بە تەڵفیسیەوە وەسفی هەوڵی ئەمریکی لە ڤیێتنامدا بە ( کۆمەڵکوژی ) دەکرد و داوای وابوو هەموو ئەمریکییەکان لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و شوێنی ترەوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە. ئەم گەوجێتییە لەوە دەچێت هەڵوێردن بێت نەك فۆرم. لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٧٠ دا، دانایەکی نەرێتگەری لە ئاستی سیاسەتی دەرەوەدا خوڵقا، لەوانە هەڵوێستی نێودەوڵەتییان بە تەواوی لەوەی ناحەزە کۆمۆنیستەکانیان زۆر جیاواز تر نەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە ویلایەتە یەککگرتووەکان هاوبەشی بەرپرسیارێتی بوو لە بنەچە و زێدە ڕەووی و ئاکامەکانی جەنگی سارد.

کاردانەوەی گومان لە هێزی ئەمریکی، لە پلاتفۆڕمی هەڵبژاردنی پارتی دیموکراتی ساڵی ١٩٧٢ دا روون تر خراوەتەروو و پێشوازی داوە بە ڕا و بۆچوونی سالونە سیاسیەکان بۆ بیست ساڵی دوای ئەمەش. ترسی کۆمۆنیستی زاڵ بووە و هەروەها ترسی ئەوەش نەماوە کە کشی سۆڤێت و فراوانبوونی بەرگری لێ ناکرێت، بەڵکو ئیحتیوا کراوە. لیبراڵەکان لە ساڵەکانی ١٩٧٠ دا دەیانویست کۆتایی بە

یارمەتیدانی باشووری ڤێتنام و راپەڕینەکانی ئەفریقا کە سەر بە رۆژئاوا بوون بهێنن. وە بوو بوونە سەرکاری کارەساتە یەك لە دوای یەکەکانی ئەفغانستان و ناوەراستی ئەمریکا و ئێران. لە کاتێکدا کە جەنگی سارد بەرەو کۆتایی دەڕۆشت، ئەندامە دیموکراتەکانی کۆنگرێس وەك داڤید بۆنوار، جیم ڕایت و کریستۆفەر دۆد، کە ساڵەکانی ١٩٨٠یان بردەسەر بە سەرکەوتووی پێشەوای هەڵمەتی بڕینی یارمەتی نەیارانی ساندیستا** کۆمۆنیستەکان بووە. بۆ کورتکردنەوەی باسی ئەم جۆرە هەڵوێستە فەرموو لەگەڵ ئامۆژگاری سیناتۆر ( دۆد ) کە لە ئاستی پەرەسەندنی کۆمۆنیستدا لە ئەمریکای لاتینی دەڵێت: ( ئەمریکا دەبێت زیاتر لەگەڵ شەپۆلی مێژوودا بێت وەك لەوەی بەرەنگاری بوەستێت. ) بەهەمان شێوەش کاندیدی سەرۆکایەتی، واڵتەر موندێل، لە ساڵی ١٩٨٤دا سەرۆك ریگنی خستەبەر رەخنە لەبەر ئەوەی ( وازی لە بنەمای گرنگی رەوشتی هێناوە لە ئاستی روسیا دا. ) هەروەها مایکل دوکاکی کە کاندیدی سەرۆکایەتی ١٩٨٨ بوو، سەرقاڵی هەمان هەوڵدان بوو و ئیدانەی بۆردوومانکردنی لیبیا و غەزووی گریناداى کرد.

هەرچەندە کۆمۆنیزم گیانی لەدەست دا، کەچی هێشتا ئەم گومانانەی لیبراڵەکان لە توانای ئەمریکی لەجێی خۆیەتی. ئەوەی وەك نەیاری، لە جەنگی دژی ڤێتنام دەستی پێکرد، بە کۆتایی هاتنی جەنگی سارد، پەسکاوتر بوو بە بەرهەڵستی بەکارهێنانی هێز. لیبیا، ئێران، عێراق، ئایدۆلۆژی ئەمانە کە خۆیان وەك دوژمنی ئەمریکا دەناسێنن، چیتر بە کێشە دانانرێن. جەنگی کەنداو وەك لە ساڵێك زیاتر، دوای رووخاندنی دیواری بەرلین، لە شەڕدا بوو، مشتومڕە کۆنەکانی خستەروو. بۆ نموونە سیناتۆر ڕۆبێرت کێری وەك ڕێنمایی کردن دەڵێت: ( لە

---

** ساندیستا: ئەو پارتە کۆمۆنیستە بوو لە ساڵی ١٩٧٩ لە نیکاراگوا لەڕێی هەڵبژاردنەوە حکومی گرتە دەست.

جیاتی هەڕەشەی جەنگ .... چاك وایە وا بە عێراق و جیهان بڵێین کە بڕوامان وایە، کۆی ئەو کەسانەی کە ئەمریکا و عەرەب لە دەستیان دەچێت نرخێکی زۆر قەبەیە بۆ ڕزگارکردنی کوەیت. ئەمەو تەنانەت میانڕۆکانی وەك سیناتۆر سام نەن و دانیال پاتریك هیچ بەدی ناکەن بۆ پشتگیری بەکارهێنانی هێز دژی شەرفرۆشتنی عێراق. ساڵێك دوای ئەوە سیناتۆرە دیمۆکراتەکانی وەك نێد کەنەدی و جۆزێف بایدن، بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە، ئیدانەی ئەو ڕاپۆرتەی ئیدارەی بۆشیان دەکرد کە زانیاری ئەوەی داوە، چۆن ئەمریکا دەتوانێت شکۆمەندی سەربازی بپارێزێت. سیناتۆری کالیفۆرنیا ئالان کرانستۆن مەبەستی ئەم پێشنیارەی بەوە داناوە کە ( ئەمریکا ببێتە یەکە شێفی دونیا و بەهاراتی بێ وێنەی سەر ڕووی زەوی. )

کاندیدەکانی سەرۆکایەتی ساڵی ١٩٩٢ شان بە شانی کەسایەتیەکانی ڕیزی پێشەوەی دیمۆکرات هەمان ویردە ناسراوەکانیان دەخوێندەوە، لۆل تسۆنگاس وانەی ئەوەی دەوتەوە کە ئەمریکییەکان ناتوانن ( ڕێگە بدەن کە ببنە پۆلیسی هەتا هەتایی جیهان. ) هەروەها تۆم هارکین وا ئامۆژگاری دەنگدەرانی دەکرد: ( ئەگەر دەتەوێت پارەکەت لە دەرەوەی وڵات خەسارکەیت، ئەوە دەنگ بدە بە جۆرج هیربێرت وۆکەر بۆش. ) بیل کلینتۆن لە ئاستی خۆیەوە بوو بە داهێنەری ( تازە، هێزی ئامادە و خێرای خۆبەخشی سەر بە نەتەوە یەککگرتووەکان. ) تا ئەرکەکانی ئەمریکا لە دەرەوەی وڵاتدا بگرێتە ئەستۆی خۆی. هەرچەندە، لەوانەیە کە سیاسەتی دەرەوەی سەرۆك کلینتۆن لە توێژینەوە پرنسیپەکانەوە هەڵنەقوڵا بێت، بەڵام گریمانەی تایبەتی لە ئاستی ڕۆڵی ئەمریکا لە جیهاندا دەخستەڕوو. کاتێك کلینتۆن هاتە ناو کۆشکی سپیەوە بەڵێنی وابوو کە لە بابەت ئابووری ناوخۆوە ( وەك لیزەر بەسەرنج بێت ). ئەمەش ئەرکی ڕاستەوخۆی دەخستەسەر سیاسەتی دەرەوە. وەك لەم ڕووەوە، جێگری وەزیری دەرەوەی ئیدارەی کلینتۆن باسی دەکات، ( بە سادەیی ئێمە خاوەنی نوێڵ نین، خاوەنی کارتێکردن نین،

ئارەزووی خستنەگەڕی هێزی سەربازیمان نییە بۆ دامرکاندنی کێشەکانی جیهان. ) لێرەوە خاوەخاوی ئیدارەی کلینتۆن لە کاتی دەسپێکردنی کێشەی بۆسنیا کە کاولکردن بوو بە هۆی نیگەرانی ئیدارەی کلینتۆن، بەڵام بۆ ماوەی سێ ساڵ کارێکی ئەوتۆیان نەکرد بۆ وەستاندنی. ئەم خاوەخاوە بوو بە هێمای خوڵقاندنی زەمینەیەك بۆ سیاسەتی دەرەوە، کە وەك ترانۆف باسی دەکات ( سنووردانانە بۆ ئەو ڕادەیەی کە ئەمریکا شت بگرێتە خۆی. ) تا ئەم سنوورە، ئیدارەی کلینتۆن چاوی بڕی بووە نەتەوە یەککگرتووەکان و سەپاندنی ڕێبازی کاری هەمەلایەن، چونکە وەك سەرۆك کلینتۆن ڕوونی کردۆتەوە ( بە سادەیی ئێمە دەبێت خولیای بنیادنانەوەی ئەمریکا بین. ) بۆ هەمە ئاهەنگی سەرۆك، نیویۆرك تایمز ئەم ڕێنماییەی نووسیوە: ( ئیدارەی تازە، پێویستی بە کەمکردنەوەی کولفەیە، لە جیاتی ئەوەی ویلایەتە یەککگرتووەکان ڕۆڵی پۆلیسی جیهان ببینێت، باشتر وایە نەتەوە یەککگرتووەکان و هێزە ناوخۆییەکان بگۆڕدرێن بە دەزگەی باوەڕپێکراو بۆ پاراستنی ئاسایش بۆ هەموو لایەك و هەموو شوێنێك. ئیدارەش هەنگاوی بەرەو پێشەوە دەنا بۆ ئامادەکردنی ئەم جۆرە کارە، بە بڕیاری سەرۆکایەتی سەرپەشتیاری هێزی ئەمریکی بەخشرا بە نەتەوە یەککگرتووەکان. ساڵێك دوای ئەوە و زیری بەرگری ولیام پێری بە تەواوەتی ئەوەی ڕوونکردەوە و وتی: ( ئێمە دەستەڵاتمان نییە هێزی ئاسمانی لە بۆسنیادا بخەینەگەڕ، چونکە نەتەوە یەککگرتووەکان داوای بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی نەکردووە. ئەوەی بە چەند ساڵێك دوای ئەمە ڕوویدا، هاتنی جۆرە سیاسەتێکی دەرەوە بوو کە — کلینتۆنسکی — بێ هاوتای لیبرالیزمی ناسراو بوو. لە لایەکەوە سەرۆك سەغڵەتی خۆی دەردەبڕی لە بەکارهێنانی هێزی ئەمریکی، لە لایەکی تریشەوە وای بەلاوە پەسەند بوو ئەم کارە بە هاوکاری کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بێت، باوەڕی پتەویشی بە ئازادکرنی هێزی بازرگانی و تەکنەلۆژی هەبوو. ئەم هێمایانە هەموو دەگەڕانەوە بۆ ئارەزووی نموونەیی — واتە ئایدیالیزم. کلینتۆن لە ساڵی

١٩٩٧ دا بە شادییەکەوە وتی: ( هێزە جۆشدراوەکانی جیهان هەڵچوونێکی مەزنە کە سیستمی دامەزراوی شتەکان دەشواتەوە. ) لە وتەی سەرۆك دا، کە شەپۆلی مەزن ئاڵۆزی و مەترسی بارودۆخی جیهانی کەم کردۆتەوە و گۆڕیویەتی بە چاکسازی و رەوشت و پێشکەوتنی ماددی، کەڵك و سوودی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستی تازە دا و لە راپەڕینی فیکری ئەفەریقا دا — و تەنانەت لە هاوبەشییە سترتیژییەکەی چینیشدا — بەدی دەکرێت.

لە نێوان ئەو پاشماوانەی کە جۆشدان و تێکچڕانی جیهان رایدەماڵێن ئیعتیباراتی ترادیسیونی هێز بوون کە تیمەکەی کلینتۆن، لەرووی گاڵتەجاڕییەوە ناویان نابوو ( سەرقاڵبوونی دوێنێ ) و ( ستارتۆکراپ و گلۆبالۆنی* . لە باتی گوێدانە شەڕفرۆشی و ئاژاوە و مەترسی هێز ) کلینتۆنییەکان، مەترسیەکی زۆر نزیکتر و تازەتریان هێنایە کایەوە ئەویش کاتەلۆژی سەدەی بیست و یەکەم بوو، لە کارەساتی ئەنفلۆنزا و سووکە تاوانەوە دەستی پێکرد تا دەگاتە گەرمبوونی گۆی زەوی. ئالێرەوە جێگری وەزیری دەرەوە، سترۆب تالبۆت، رووی لە ئاسایشی نیشتمانی کردبووە ( ژوورەکانی پارە گۆڕینەوە و ستۆکی سەنگاپوور و ئەو کونەی کە بووەتە ئۆزۆن. ) لە هەمان کاتیشدا، جێگری سەرۆك، ئەلگۆر، خەباتی چارەسەرکردنی کێشەی ژینگەی بەستەوە بە هەمان خەباتی ئەمریکی دژی یەکیەتی سۆڤیەت. هەموو ئەم سەر لێ تێکچوونانەی ئیدارەکە لە نێوان سووکە کێشەکان و مەترسیە گەورەکاندا لەگەڵ جیهانبینی خۆیدا ڕێك نەدەکەوتن. سەرۆك لە ساڵی ١٩٩٩دا، وای بە جەماوەر ڕاگەیاند: ( ئەگەر گەلی ئەمریکی هیچ شتێك لە بابەت منەوە نەزانێت، ئەوە دەزانن کە من حەز لە بەکارهێنانی هێز ناکەم. ) بەم جۆرە

---

* ستارتۆکراپ: وا دیارە مەبەستی لە شێوەی حوکمی سەربازییە. گلۆبەلۆنی: داڕێژراوە لە وشەی گلۆبللیزمەوە کە دەکاتە ( بە جیهانی بوون) وەرگێڕ.

لێبوردنخوازی لە کرداری پێشینەکانی لە کاتی جەنگی سارد دا و لە ئەفریقا و شوێنانی تر دەکرد و لێرەشەوە چاوپۆشی لە جینۆسایدەکەی رواندا کرد و بۆ ماوەیەکی درێژ گوێی نەدایە کۆمەڵکوژییەکەی بۆسنیا- ئەو کۆمەڵکوژیەیەی کە وەزیری دەرەوە کریستۆفەر، بە پێی قسەی نیڤیل چامبەرلەین، بە کێشەیەکی مرۆڤایەتییە لە ناوەراستی کیشوەرێکی تردا روودەدات کە لە ئەمریکاوە دوورە. بۆسنیا بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەکروزا و ئیدارەی ئەمریکا لە ترسا دەلەرزی، بۆ لەش دەرکردنی ئەم ترسە، سەرۆك کلینتۆن سەردانێکی یادەوەری هۆلۆکۆسی کرد و کاتێك لە ساڵی ١٩٩٤ دا کە هەوڵی کۆریای باکور بۆ بەرهەمهێنانی چەکی ناوکی ئەمریکای خستەبەر مەترسی جەنگەوە، تیمەکەی کلینتۆن مۆڵەتی بە سەرۆکی پێشوو کارتەر دا کە بەرتیل رێککەوتنێك لەگەڵ پیونگ یانگ ساز بکات بۆ ئەوەی واز لەم چەکانە بهێنێت. کارتەر بە داکۆکییەوە وای دەردەخست کە لە کارەکەیدا سەرکەوتوو بووە و کلینتۆن بۆ دڵنیایی بە ( موعجیزە )ی وەسفکرد و وتی: ( ئەم رێککەوتنە ئەنجامێکی بەرفراوان و گرنگی بۆ ئەمریکا بە دەستهێناوە و ترسی بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکی لە نیمچە دوورگەی کۆریا نەهێشتۆتەوە. ) لە ساڵی ٢٠٠٢ دا، ئەم موعجیزەیە چوو بە ئاسماندا، کاتێك کۆریای باکور ڕایگەیاند کە وازی لە دروستکردنی چەکی ناوکی نەهێناوە.

لەو کاتەشدا، لە وڵاتێکی دراوسێی کۆریادا، واتە چین، کلینتۆن کە هێشتا کاندیدی سەرۆکایەتی بوو و ( قەسابییەکانی پەکینی بەدی دەکرد ) هەر لەو وڵاتەدا هێزی چەکدار مۆدێرن دەکرا، مووشەك بەسەر تایواندا دەتەقێنرا، تەکنەلۆژیای سەربازی دەدزرا و دەیانفرۆشتەوە بە دەرەوە و هەڕەشەیان لە خودی ویلایەتە یەککگرتووەکان پێدەکرد. لە وەڵامی ئەمەدا سەرۆك کلینتۆن لە ئاستی دوو سەرەی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای سەربازیدا، چینی گوڵباران دەکرد و وتووێژی

دبلۆماسی لەگەڵدا دەگۆڕینەوە و بە ( هاوبەشی ستراتیژی ) ناو دەبردن و کێشەی بازرگانی ئاوێتەی کێشەی مافەکانی مرۆڤ نەدەکرد.

بە هەمان شێوە، کاردانەوەی تیمەکەی کلینتۆن بەرانبەر بە تیرۆریزم، لاواز بوو. لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ئەم تیمە سەرکەوتوو نەبوو لە وەڵامی پەلامارەکەی ( تێکشکێنەری – مدمرة )ی (یو ئێس ئێس کۆڵ – USS COLE) ، کە بەڵگەکان دەیان گەڕانەوە بۆ ئەلقاعیدە، سەرەڕای ئەوەش جەختی لەسەر ناردنی هێزی تایبەت نەکرد بۆ دۆزینەوەی ئوسامە بن لادن. لە قۆڵێکی تریشەوە، بە هیچ شێوەیەك وەڵامی پەلاماردانەکەی تەلاری سنوبەری ( عەرەبی سعودی ) نەدایەوە، کە بنکەی هێزی ئاسمانی ئەمریکی تێدا بوو، هەر چەندە بەڵگەی بەشداریکردنی ئێرانی پێوە دیار بوو. کلینتۆن لەو کاتەدا سەرقاڵی مامەڵەکردن بوو لەگەڵ ئێراندا، هەروەها کردەوەی ئەم ئیدارەیە لە ئاستی بۆمبارانکردنی باڵیۆزخانەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ئەفریقادا، بریتی بوو لە تەقاندنی چەند مووشەکێك رووەو کارگەیەکی دەرمان لە سودان، کە رێکەوتی ئێوارەی دادگاییکردنی کلینتۆنی دەکرد. ئاشکرایە کەم ئیدارە هیچ کاتێك لە رووی هێزی سەربازییەوە، کە لە دەرەوەی وڵاتیش بە توانا بێت، مامەڵەی تیرۆریستانی نەدەکرد. ئەم مامەڵە نەکردنەش دەگەڕایەوە بۆ شێوەی دارشتنی یاسای نیشتمانی کە لە دەرەوەی وڵات کاریگەر نەبوو. مادلین ئۆڵبرایت ئاماژەی بەم راستییە دابوو، تەنانەت کلینتۆن لە رووی زاراوەیشەوە پاکانەی دەکرد و ناوی ئەو وڵاتانەی کە سانسۆری تیرۆیستانیان نەدەکرد لە ( دەوڵەتانی زەرەر بەخشەوە ) گۆڕی بە ( دەوڵەتانی سەرنج ڕاکێشەر ). هێشتا، کلینتۆن، جۆرج مالگۆڤەرن نییە، لەوانەیە خاوەن سۆز و دڵ نەرم بێت، بەڵام ئەگەر ئاکامی کار نەکردن سەختتر بێت لە بەدیلەکەی، لەوانەیە چاوەڕێی ئەوەی لێ بکرێت کە بکەوێتە کار. لێرەوە داگیرکردنی هایتی، کاتێك کەوتەبەر مەحکومکردن کە کەشتییەکی پڕ لە خەڵکی هایتی نوقم بوو، لاشەی سەرنشینەکانی لە قەراغ ئاوی فلۆریدا کەوتنەروو،

ئەمەش لە ئاکامی ناڕەزایەتی دەربڕین و هەڵچوونی کۆنگرێس بوو، کە کلینتۆنی ناچارکرد ئیدانەی ئەم کارە بکات. یاریدەدەری کلینتۆن و شارەزای بالْقان، ریچارد هۆلبرووك بە هەمان شێوە بڕیاری کلینتۆن دێنێتەوە یاد کە بە هەڵمەتی ئاسمانی بۆ پاراستنی بۆسنیا هەستا. ئەم بڕیارەش لە ژێر فشاری دەوڵەتە ئەوروپییەکان کەوتەکار کە داوای بەجێهێنانی بەڵێنی ئەمریکی دەکرد، کە جێگەی هێزی ئاشتی پارێزی ئەوروپی بێ توانا بگرێتەوە. لێرەوە وا بە باش زانرا کە لە باتی ناردنی سەرباز و گیان لە دەستدانیان هێزی ئاسمانی بەکاربهێنرێت. کە زەرەری گیانی لێ ناکەوێتەوە. لە کۆسۆڤۆشدا تیمەکەی کلینتۆن هیچ نیازی ( ئەکشن )یان نەبوو. کاتێکیش کەوتنەکار، لە بەرزی ۱٥۰۰۰ هەزار پێوە بە فڕۆکەی جەنگی هێرشیان دەبرد و بۆ مەبەستی پاراستنی ئاشتی سەربازیشیان دەنارد، چاوێکیشیان بڕیبووە هەڵوێستی دەنگدەرانی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی و بەو پێیە هەڵسوکەوتیان دەکرد.

ئەم تێکەڵە سەیرەی لیبڕالیزم و سینیسیزم ( ڕەشبینی )ە بوو بە هۆی سەرنەکەوتنێکی ئاشکرا لە عێراقدا. بەپێی کارتی خاڵەکانی خودی ئیدارەی کلینتۆن کێشەکە کێشەی ئیحتوای رژێمی سەدام بوو نەك چەك دامالین. زیاتر گرنگ ئەوە بوو وەك فەرمییەکی ئیدارەکە وتی: ( باسی عێراق نەکەوێتەسەر مێزەکەی کلینتۆن. ) و لەو حاڵەتانەشدا کە باسی ئەم وڵاتە کەوتەسەر مێزەکەی، ئەم ئیدارەیە هیچ چالاکییەکی پیشان نەدا. لەمیانەی دەرخستنی ترسدا و لەبەر پاراستنی ئابڕووی خۆیان پەنایان بردەبەر نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی لە کردنەوەی ئەو گرێیانەدا یاریدەیان بدات کە خۆیان ئاڵۆزکانبوویانن. ئیدارەکە بە شێوەیەك نەیارە دیمۆکراتە عێراقییەکانی پشتگوێ دەخست کە دووچاری دوا رۆژێکی تۆقێنەر دەبوون، هەموو ئەو ئامێرانەشیان کە ئیدارەی پێشوو دایبوو بۆ ئیحتیوا و لە قەفەسنانی سەدام، هەموویان لەناو برد و کاتێ دووچاری کاری سەربازی دەبوون لە ( یەك بە یەك ) زیاتر تێنەدەپەڕین و هیچ ئاکامێکی راستکردنەوەی بارودۆخی لێنەدەوەشایەوە و

ڕیکلامکردنی ئەم ( ئۆپەراسیۆن )انەش ساختەکاری بوو و زیادەی پێوە دەنرا. ئەم کارانە هەمووی ئەو ڕەنگدانەوەیەیەی دەبەخشی، کە هیچ پێوەرێکی ئەوتۆ پەیڕەوی نەدەکرا کە لە ڕووی ستراتیژەوە کاریگەری هەبێت. لەوانەیە سیاسەتی کلینتۆن لە ڕەتکردنەوەی بەکارهێنانی هێز دژی عێراق، چەند کەسێکی هەستیاری قایل کردبێت، بەڵام کەسی ئەوەندەی سەدام قایل نەکرد. ئەو سەدامەی کاتێك کلینتۆن ئۆفیسی بەجێهێشت، ئەویش قەفەسەکەی بەجێهێشتوو و سنووریشی بۆ دانەنرابوو.

## بەشی شەشەم

## (مەزهەبی ئینتەرناسیۆنالیزمی ئەمریکی جیاوان)

## A distinctly American Internationalism ( Bush II )

لیبراڵەکان و ڕیالیستەکان لە ئاستی جیاوازەوە مامەڵەیان لەگەڵ جیهان دەکرد، بەڵام کە دەهاتنە سەر عێراق، هەردوکیان لە یەك شوێندا رادەوەستان و جبەخانەکەی سەدام هەر لە تەشەنەکردنی ترسناکداردا دەمایەوە. ئەم ئایدۆلۆژیانە دەیانوویست لەو چوارە چێوەیەدا بە کەمترین و شێوە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی مامەڵە پێ بکەن. یەکێکیان لە ئاستی مەفهومی بەرژەوەندی خۆیەوە نائارام بوو، ئەوی تریش بەرژەوەندی نیشتمانی زۆر بە تەسکی وەسف دەکرد بە تایبەت لە بەرانبەر پرسیاری ئەوەی چی بکرێت لە بابەت سەدام حوسەینەوە؟ هەمیشە هەردوو لایان بیانوویەکیان هەبوو تا کار نەکەن و سەبارەت بە بەکارهێنانی هێز چ لە عێراق و چ لە جیهاندا هەمیشە بەدیلێك هەبوو. دوای (١١)ی سێپتێمبەری ساڵی ٢٠٠١ جورج بۆش ئەم بەدیلەی لە ئامێز گرت .

ئەم بەدیلە کە سەرۆك بۆش ناوی لێ ناوە ( ئەنتەرناسیۆنالیزمی ئەمریکی جیاواز ): ئەو فەلسەفەیە کە دەیەوێت فاکتەرە هەرە سەرکەوتووەکانی

واقعی و لیبرالیزم بە یەکەوە ببەستیّ. ئەم جیهانبینییە، هەمووی بیرۆکەی ئیدارەکەی بۆش نەبووە. بە هاوبەشیکردنی هیّزی ئەمریکی و نمونەیی (واتە ئایدیالی) ئەمریکی تا ئاستیّکی کاریگەر، هەر لە سەرۆك تیّدی رۆزقیّلتەوە تا جۆن ئیّف کەندی و رۆنالّد ریگن لە کاردا بووە. لە پیّشبڕکیّیەکی هەلّمەتی سالّی ٢٠٠٠ دا سیناتۆر جۆن ماکینز داوای سیاسەتی کونترۆلّ کردنی( دەولّەتانی زیان بەخش)ی دەکرد. ئەمە لە خویّدا گەڕانەوەیەکە بۆ رایەلّکردنی ترادیسیۆنیّك لە شیّوازی بانگەشەکەی (کاندیت بۆش) بۆ سیاسەتیّکی دەرەوە کە ئایدیالیزم بگریّتە خۆ بە بیّ چەواشەکاری و هەروەها بە هەمان شیّوە ( ریالیزم ) لە ئامیّز بگریّت کە لە خزمەتی ئایدیالییە ئەمریکییەکان دابیّت.

هەر چەندە سەرۆك بۆش لە دارشتنی ریّرەویّکی لەو جۆرەدا لە ماوەی سالّی یەکەمی حوکمڕانیدا دلّنیا نەبوو، بەلاّم بەسەرهاتی ( ١١ )ی ئەیلول خستیە پەلەقاژە بۆ گەڕانەوە بۆ دروشمەکانی هەلّبژاردنەکەی. لەوە دوا بۆش گەڕایەوە بۆ نەریتەکانی ترومان و کەنەدی و بەلیّنیدا شەڕ لەبەر خاتری ئاشتی بکات. تەنها ئاشتی ( ئەو ئاشتییەی کە سەربەستی پەسەند دەکات ). ئەمەش لە ئاستی خۆیەوە، وای لە بۆش کرد کە دەست بەجیّ و بە هۆشیاری بەرەنگاری کیّشەی سەدام حوسیّن ببیّتەوە.

ئینتەرناسیۆنالیزمی ئەمریکی جیاواز یان سادە ماناى چیە؟ گەڕانەوەیە بۆ ( تایبەتمەندی ئەمریکی )، کە بریتییە لە لیّهاتوویی و داویّن پاکی سیستمی سیاسەتی ئەمریکی، کە ئەگەر تەرجومە بکریّ بۆ سیاسەتی دەرەوە بە واتای باوەرە بە سەربەستی نموونەیی هەموو جیهان، نەك ( خویّن و گلّی نەتەوە پەرستی. ) ئەمەش لە خۆیدا بیرۆکەیەکی ئەمریکییە. میّژووناس رۆبەرت تەکەر وەسفی ئەم باوەڕە بەم شیّوەیە دەکات:

**لە سەرەتای بوونمانەوە وەك نەتەوەیەك بڕوامان بەوە هێناوە كە ئاسایش و مانەوەمان، هاوسەر و هاوتای ئاسایش و مانەوەی سەربەستیە لە جیهان دا. واتە بۆیە لۆژیكی دەوڵەتمان نەك هەر لە هۆشیاری سادە بەرز و بڵندترە، بەڵكو بە بەردەوامی وا رەچاوكراوە كە لە ئاستی (چۆنایەتی)شدا جیاوازتر بێت.**

لیبڕاڵیەكان و واقعییەكانی ئەم سەردەمە جەخت لەسەر ئەوە ناكەنەوە، كە نەتەوەی ئەمریكی بە هیچ شێوەیەك نەتەوەیەكی جیاواز بێت. لیبڕاڵییەكانی ئەمڕۆ بە گومانن لەم بیرۆكەیە، چونكە مەفهومی بێ هاوتایی ئەمریكی دژوارە لەگەڵ كولتووری ڕێژەییدا و هانی ناسیۆنالیزمی ئەمریكی دەدا. واقعیەكانیش بە لایانەوە وایە كەدان نان بەم ( تایبەتمەند ) یە دا، هاندانی ئەمریكایە بۆ هەڵمەتی خاچپەرستی. لە ماوەی دوا بە دوای جەنگدا ئەم هەستی جیاوازییە، لە لایەكەوە وای لە ئەمریكییە ئینتەرناسیۆنالیستەكان كرد وەك هاری ترومان وجۆن ئێف كەندی، كە خۆیان لە خوازیارە لیبڕاڵیەكانی وەك هنری والاس وئیلانۆر رۆزڤێڵت جیا بكەنەوە. لە لایەكی تریشەوە، هاوشێوە خۆیان لە واقعییەكانی وەك جورج كینان و هێنری كیسنجەر جیا بكەنەوە. لێرەوە لیبڕاڵییەكان سوور بوون لەسەر ئەوەی كە ئاشتی و سەربەستی سیاسی دەبێ لە میانەی رێكخراوە نێودەوڵەتییەكان و بە هاوكاری نێودەوڵەتی گۆش بكرێن، بەڵام نەتەوەپەرستەكانی ئەمریكا چاویان بڕی بووە هێزی ئەمریكی و هاوپەیمانەكانی ژێر فەرماندەی ئەمریكا.

لە كاتێكدا كە بە دوو دڵییەوە حوكم بەسەر خەڵكی تردا دەسەپێنرا و لە نموونەیی بنیادنانی ئەمریكا گومانی بەردەوام دەكرا و لیبڕاڵییەكانی كەم سەنگ ( كێش ) دەكرد. ئینتەرناسیۆنالیستە ئەمریكییەكان ئەم گومانانەیان نەدەگرتە خۆیان. بۆ دڵنیا بوون، چەند كەسانێكی واقعی بەوە قایل بوون كە دەبێ ئەمریكا

ڕۆڵی پۆلیسی جیهانی ببینیّ، بەلای کەمەوە لە ئاستی ( کۆمەڵگەی جیهانیدا )، بەلاّم بە بۆچوونی ئەمریکییە ئینتەرناسیۆنالیستەکان، ئەرکی ئەمریکا لە سنوورێکی دیاری کراودا قەتیس نابێت.

ئەگەر ئەم پاشکۆیە کە بە بیرۆکەی ئەمریکاوە بەستراوە، ئینتەرناسیۆنالیستەکان و لیبڕاڵییەکانی ئەمریکا لەیەك جیا بکاتەوە، هەمان شێوەش لە واقعییەکانیشیان جیا دەکاتەوە. بۆ نموونە کاتێك هاری ترومان لە (١٩٤٧) دا بەڵێنی دا: یاریدەی گەلانی ئازادیخواز بدریّ بۆ بڕیاردانی چارەنووسی خۆیان بەو شێوەیەی کە خۆیان دەیانەویّ، واقعییەکی وەك والتەر لیپمان پێی وابوو، کە ئەمە جاڕدانی خاچپەرستییەکی خەتەرناکە لە لایەن سەرۆکەوە. ئەمریکییە ئینتەرناسیۆنالیستەکانیش لەسەر جۆرە بۆچوونێکی واقیعی ڕێکەوتبوون، لە سەرووو هەموویانەوە، ڕەچاوکردنی بارودۆخی نێودەوڵەتی وەك جێگەیەکی خەتەرناك. لێرەوە دوورێیانی هەردوو ( جیهانبینی ) لەسەر بۆچوونەکەی ناسیۆنالیستەکانە کە بەمەرجی دەزانێت بە هێز و بیرۆکەی ئەمریکا دەکریّ، چاك بکرێت.

ڕۆژی شکۆداری ئینتەرناسیۆنالی ئەمریکی، کە لە کاتی تروماندا بە لیبڕاڵی دژە کۆمۆنیست ناسراو بوون، لە جاڕدانەکەی ترومانەوە هاتەدی، کاتیّ کە وتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە بە یەکێك لە ( تۆکمەترین هێزەکانی سەر رووی زەوی ). نمایشی بە ناوبانگی سیاسەتی ئاسایشی نیشتمانی ئەمریکی کە ترومان لە ساڵی ١٩٥٠دا جەختی لەسەر کرد، سوور بوو لەسەر ئەوەی ( لە هەر شوێنێك دەزگە ئازادەکان ببەزن، بەزینێکە بۆ هەموو جیهان ) ئەمە بە ( NCS - 68 ) ناسراوە. ئینتەرناسیۆنالیستە ئەمریکییەکان لەگەڵ باوەڕ بوونیان بە دیمۆکراسی لیبڕاڵدا و ئەرکی ئەمریکی بۆ هاندان لە جیهاندا، ئەوا بە ڕەسمی ڕێزی لێنرا و هەرواش دەمێنێتەوە. لە کاتی ئیدارەی جۆن کەندی دا کە بە

ئاشکرا وتی: ( ئەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەر نرخێك بێت بیدە، هەموو ناڕەحەتییەك هەڵگرە، بەرەنگاری هەموو تەنگانەیەك ببەرەوە، پشتگیری هەموو دۆستێك بکە، روو بە رووی هەموو دوژمنێك بوەستە، بۆ چەسپاندن و سەرخستنی سەربەستی.)

بە هەرحاڵ، لەساڵی ١٩٦٨دا، ئەم شێوە ئینتەرناسیۆنالیزمەی ئەمریکا لە دارستانەکانی رۆژهەلاتی باشووری ئاسیادا کەوتە گومان لێکردنێکی بەرچاوەوە. جەنگی ڤێتنام گەلێك لیبراڵی قایل کرد، نەك هەر سیاسەتی ئەمریکی، بەڵکو رەفتاری بنەمای ویلایەتە یەکگرتووەکان لاوازە وەك فەرمییەکی پێشوی سەر بە کەندی، لەسالی ١٩٧١ دا وتی: ولاتە یەکگرتووەکان، دەبێت وەك پۆلیسی جیهانی تەماشا نەکرێ، بەڵکو وەك پێکهاتەیەکی چارەسەرکەری کێشە لێی بڕوانرێت. یان وەك سەرۆك کارتەر، چەند سالێك لەوەو دوا باسی کرد: ( ڤێتنام وای فێرکردین، کە ئەمریکا نابێت دەستێوەردانی سەربازی لە ئاستی هیچ نەتەوەیەك بەدی بێنێت، ئەگەر ڕاشکاوانە هەرەشە لە ئاسایشی ویلایەتە یەکگرتووەکان یاخود لە گەلی ئەمریکی نەکات. ( وانەکانی میونیخ* ) کە بەرەنگاری دوژمنایەتی لە دەرەوەی ولاتی پەسەند دەکرد، خرایە لاوە و وانەکانی ڤێتنام هاتنە جێگەی ).

لە راستیدا ڤێتنام، لە جیاتی وانەیەك دووانی خوڵقاند: دوو وانەی جەواشەکار، یەکێك بۆ سیاسەتی چەپڕۆ، ئەوی تر بۆ راستڕۆ. هەندێك لەواقیعییەکان دژی دەستێوەردانی ئەمریکی لەباشوری رۆژهەلاتی ئاسیا هۆشیاریان دەدا و وتیان ئاکامێکی گەورەی سەر لێ تێکچوونی لێ دەکەوێتەوە. ئاکامەکەش لەگەڵ بۆچوونی ئەماندا گونجاو بوو. وانەکەش وابوو کە دەبێ

* ئەو دەرسە بوو کە فەلەستینییەکان لە ساڵی ١٩٧٢ دا، تیپی وەرزشیی ئیسرائیلیان لە میونخ لەناوبرد(وەرگێڕ).

ئەمریکا دەستێوەردان بکات، ئەگەر ( بەرژەوەندییە زیندووەکانی ) کەوتبێتە بەر مەترسی، نەك بۆ کاری دژواری دوور بە دوور یان بۆ هۆکاری ئایدۆلۆژی. بەم شێوەیە تەنانەت سەرۆك نیکسۆن کە درێژەی بە شەڕی ڤێتنام دەدا، بۆچوونی وا بوو ( ئامانجی ئیدارەی ئەمریکی دەبێ خۆ دوور خستنەوە بێ لە چەشنی جەنگی ڤێتنام لە هەر شوێنێك بێت لە جیهاندا ). ئەمریکا ئەم کارە دەکات ئەگەر بێتو لە بەرچاوی خۆی ( نەتەوەکەی راستەوخۆ لەمەترسیدا بێت، ئەوساکە بە ئەرکی سەرەکی هەڵدەستێت و هێزی سەربازی بۆ خۆپاراستن بەکار دێنێت. ئیدارەی ئەمریکی دەبێ بەلای ئەو ئەوروپاییانەشدا مەیلان بکات، کە خاوەن سیاسەتی واقعی راستەقینەن. ئەمە لەگەڵ بۆچوونی راوێژکاری ئاسایشی وڵات، هێنری کیسنجەردا دەگونجێ و دەبێتە ئەرکێکی سەخت بۆ چاککردنی پەیوەندی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤێت و چین دا. هەر چەندە ئەم دوو زلهێزە یارمەتی دوژمنانی ئەمریکا لە باشوری رۆژهەلاتی ئاسیادا دەدەن. بەڵام ئەم کارسازیەش کرانەوەی سیاسی لێ دەکەوێتەوە و بەردەوام دەبێت.

لە ساڵانی ١٩٧٠ دا، لیبراڵییەکان و واقعییەکان لە هەوڵی هاوبەشدا بوون، بۆ خولقاندنی تەگەرە دژی بەکارهێنانی هێزی ئەمریکی. هاوکات ئەنتۆنی لەیك، یاریدەدەری دوا رۆژی کلینتۆن، بە خێرهاتنی ئەو گۆڕانکارییەی دەکرد، کە سنوور بۆ هێز و بەرپرسیارێتی ئەمریکا دادەنێت. هنری کیسنجەریش ئامۆژگاری بەربەست کردنی بەکارهێنانی هێزی ئەمریکی دەکرد. هێشتا لیبراڵییەکان و پارێزگەرەکان ( موحافزین ) وەك یەك، بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەیان پشت گوێ دەخست. بە هەمان شێوەی قۆناغی یەکەمی جەنگی سارد ئەمریکا بەرێوە دەبرا، گروپێکی بچکۆلەی دیمۆکرات و کۆمارییەکان لەسەر ئەو فەلسەفەیە مابوونەوە. دوا بە دوای دۆڕاندنەکەی ماك گوڤێرن لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٧٢ دا. گروپێکی نەتەوە پەرست – دواتر بە پارێزگارانی نوێ دەناسرێن

- سەر بە سیناتۆر هنری سکوپ جاکسۆنن، ئەمانە هاوپەیمانێتییەکیان دروست کرد کە پێکهاتبوو لە زۆرینەی دیمۆکرات ناویان نا ( CDM )، ئەم گروپە تازەیە راستەوخۆ بەرەنگاری ئەو ( دووره پەرێزی )ەیان کرد کە باڵی کێشا بوو بەسەر بەشی زۆری دیمۆکراتییەکاندا.

بە پێچەوانەی دەزگە لاوازەکانی پارتەکەیەوە، جاکسۆن و هاوبیرەکانی لە CDM سوور بوون لەسەر ئەوەی کە بەرژەوەندی خودی ئەمریکا و بەرژەوەندی ئادەمیزاد هاوشان و گونجاون. ئەمانە بۆچوونیان وابوو کە ئەم جیهانە دەبێتە شوێنگەیەکی باشتر ئەگەر هێزی ئەمریکی بە تۆکمەیی بەکار بهێنرێت. لەم رووەوە جاکسون لای وابو کە دەبێ سیاسەتێکی دەرەوەی پتەو و نمونەیی لەگەڵ دەستێوەردەر لەکاردا بێت. بە هەر حاڵ، ئەمە بۆ پارتی دیمۆکرات، لە ساڵانی حەفتا دا، کارێکی ئاسان نەبووە. پارێزگەرانیش ، بە سەرۆکایەتی جیراڵدفورد، بایەخیان بەم بۆچوونە نەدەدا، فورد خۆی بۆ سیاسەتی واقعی نەزر کردبوو. ئەمەش بە لای نەتەوەپەرستانی ئەمریکییەوە بە هەمان ئاستی تێکشکاندنی سیاسەتی دەرەوە بوو لەلایەن پارتی دیمۆکراتەوە.

بە رەتکردنەوەی ( وانەکانی ڤێتنام )، ئەمریکییە نەتەوەپەرستەکان بە شێوەی پاش کۆتایی جەنگ، خولیای بەردەوام بوونی سیاسەتی دەرەوە بوون. لەسەر هەڵوێستی خۆیان سوور بوون کە پێویستە ئەمریکا لە دەرەوە وریا بێ، بە تایبەتی لە مامەڵە کردنیدا لەگەڵ یەکیەتی سۆڤێت دا. لە بیر چوونی ئەو بۆچوونە دژوارەی ساڵەکانی ناوەند و کۆتایی حەفتاکان، کە گوایە یەکیەتی سۆڤێت لەوە خەترناکترە کە ئەمریکا دەیزانی کارێکی ئاسانە. ئەم بۆچوونە باڵی بەسەر دەزگەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا کێشابوو، بە پێچەوانەوە، پیشاندانی دانایی هەر لە نیکسونەوە بۆ کارتەر، واتە ژیان بردنەسەر بە ئاشتی بوو، هاوشێوە لەگەڵ یەکیەتی سوڤێت دا. بە هیچ شێوەیەك گەلی ئەمریکی

توانای ئەوەی نیە، هەمیشە دژی سیستەمی سوڤێتی لە بەرهەڵستی پتەودا بێت. سەرقاڵبوون لە پێشبرکێی چەکدا دەبێتە هۆی ئیفلاس بوون و شەڕی یەکتر برینەوە. بەرهەڵستی ناوەرۆکی ئایدۆلۆجی کۆمۆنیزم، بەشەڕانی و نایاسایی لە قەڵەم دانی، دونکیشۆتی دەبێ و لەوانەشە مەترسیدار بێت. دژایەتی ئەم کۆ دەنگییە لەلایەن نەتەوەپەرستەکانەوە، کاتێ کە رەخنەیان لە پرۆسەی کۆنترۆڵ کردنی چەك دەگرت و بە پەرۆشەوە بوون بۆ پتەوکردنی سەربازی و ئایدۆلۆجی بەرفراوان و چەسپاندنی ستراتیژ دژی سۆڤێتی کۆمۆنیزم. هەموو ئەم بۆچوونانەیان کەوتە پشتگوێ و بە بەسەرچوو و بێ بنەما لە قەڵەم دران. سیاسەتی دەرەکی ئەمریکا، پێویستی بە شۆرشێك هەبوو بۆ سەلماندنی راستی بۆچوونی ئەمانە، لە ئاستی رووخاندنی دیواری بەرلین و هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی سۆڤێتی.

ترادسیۆنی ئینتەرناسیۆنالیزمی جیاواز، دوای سەرسم دانیان بۆ ماوەی پانزە ساڵێك، سەر لە نوێ لە لایەن سەرۆك ریگنەوە زیندوو کرایەوە. ریگن بەڵێنیدا کە فاکتەری یەکلاکەرەوە "بۆمب و رۆکێت نابێت بەڵکو ئیرادە و بیر دەبێ " وویلایەتە یەکگرتووەکان دەبێ یارمەتی نەتەوەکانی تر بدات بۆ پتەوکردنی ژێرخانی دیمۆکراسی ".

ریگن سوپای ئەمریکی سەر لە نوێ دامەزراندەوە. رێبازی خۆی خستەکار بۆ لەناوبردنی دەستکەوتەکانی سۆڤێت، ئەمەشی بە هاوکاریکردن لەگەڵ شۆرشگێرە دژ بە کۆمۆنیستەکان کرد لە جیهاندا. هەروەها یاریدەی دروستکردنی رێکخراوی شێوە حکومی کرد وەك " ئینداومێنت Endowment ی نەتەوەیی بۆ دیمۆکراسی بۆ بە دەستهێنانی ئازادی سیاسی لە وڵاتە چەوسێنەرەکاندا. ریگن یەکیەتی سۆڤێتی بە ئیمپراتۆریەتێکی شوم وەسف کرد. بە پێی باوەڕی ریگن، دەبوایە سیستێمی سیاسی وڵاتە ناحەزەکان بگۆڕدرێن، بۆ

ئەوەی ئەمریکا سەلامەتتر بێت و جیهانیش پڕ لە ئاسایش بێت، نەك هاوسەنگی چەك یان "گفتوگۆ" بکرێت لە گەڵیاندا، بە ڕاشکاوی و بە بەردەوامی باسی پەیامی ئەمریکای لە نێو ئەو وڵاتانەدا دەکرد. ئەم کەلەپورەی ریگان، بۆ دەساڵێك زیاتر مایەوە و دوا بە دوای (١١) ی ئەیلول جۆرج دەبلیو بۆش زیندووی کردەوە.

سەیر و سەمەرەیەکی کەم نییە کە ئەرکی لابردنی سەدام بکەوێتە ئەستۆی کوڕی سەرۆکێك، ئەو سەرۆکەی لە پاڵ شتی تریشدا، بڕیاری چارەنووسسازی دەرکرد. وەك هێشتنەوەی سەدام حوسێن لەسەر حوکم. لە ڕاستیدا ئەمەش شتێکی دڵتەزێنە کە سەرۆك جورج دەبلیو بۆش بەبەڵگەوە ئاماژەی بە ڕێڕەوی جۆرج مارشاڵ دەکرد، لە خەملاندنەکەیدا کە دەڵێت ( ئاڵاکەمان لە هەموو جیهاندا بە هێمای سەربەستی دەناسرێ، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە بە ڕەمزی هێزی سەرکەوتووی بێ هاوتا دەژمێردرێت. ئەمە دوای ئەوە بوو کە بۆش وەك کاندیت بۆ پۆستی سەرۆکایەتی، گومانی دەستێوەردانی سەربازی خستبووە ناوەڕاستی ئەجێنداکەی سیاسەتی دەرەوەی. کاتێ کە ئینتەرناسیۆنالیزمەکان ئیدارەی کلینتۆنیان بە لاواز و بێ توانا لە بڕیارداندا بەدی دەکرد، ڕاوێژکاری سیاسەتی دەرەوەی بۆش، ستیڤن هادلی لەوە نیگەران بوو کە بۆش زۆر بە پەلە خۆی گەیاندە دەزگەی سەربازی، لە کاتی شیکردنەوەی هەڵمەتی هەڵبژاردندا جۆرج دەبلیو بۆش بە ڕەهاییەوە دەیوتەوە کە ئەو تەدەخول ناکات بۆ وەستاندنی ( جینۆساید لە ناو ئەو نەتەوانەدا کە لە دەرەوەی ستراتیژی بەرژەوەندیمانن). و دەبێ ولایەتە یەکگرتووەکان زیاتر ( لە جیهان بە شێوەیەکی سادەتر خۆی نزیك بکاتەوە).

بەراوردکردنی سیاسەتی دەرەوەی خۆی، لەگەڵ شێوەی ڕەفتاری کلینتۆن دا، کە گوایە بۆش خۆی زیاتر سەرنج دەداتە ( بەرژەوەندیە گرنگەکانی نەتەوەیی، ڕەخنەگرانی زیاتر پەنایان دەبردە بەر ڕسواکردنی خودی دیمۆکراسی). سەرۆك

بۆش لە بارەی کۆدەتاکەی پەرویز موشەڕەفەوە کە خۆی کرد بە سەرۆکی پاکستان، وتی ( ئەم ژەنراڵە پاکستانیە تازەیە -هەڵبژێردراوە و هەڵنەبژێردراوە- حوکمی پاکستانی گرتە دەست) . وتیشی ( وا دیارە ئەم کابرایە وڵاتەکەی ئاسوودە دەکات، لام وایە ئەمە دەنگوباسێکی باشە بۆ نیمچە کیشوەرەکە). لە راستیدا لەگەڵ ئەو هەموو خۆ بەستنەوەیە بە (ریگن) ەوە، بۆش لە هەموو خۆ نزیک کردنەوەکانیدا، بە دەستکارییەکی کۆنە سیاسەتی واقعی جیهانی و لاسایی‌کردنەوەی هەڵوێستی جیراڵد فۆرد زیاتر هیچی لە باردا نەبوو. لەم رووەوە و جۆناثان کلارک شارەزای واقعییەت، لە ( پەیمانگەی کاتۆ) دوا بە دوای هاتنە سەرحوکمی بۆش دەڵێت: ( هەڵچوونی مەزاجی گەڕانەوەیە بۆ پیشنەگەری وئیحتراف، زاڵبوونە بەسەر ئایدۆلۆژیادا ).

بۆچوونی بۆش، لە هەڵبژاردنی یاریدەدەرانی سیاسەتی دەرەوە، روون دەبێتەوە. بۆ سەلماندنی ئەمەش پێویستیان بە دیریك هەیە کە بەشێکی لە هانز مۆرگنتاو و بەشێکی تری لە ریدەر دایجێست وەرگیراوە، کە کۆلن پاوڵی تازە بە وەزیری دەرەوە دامەزرا و بە پێی سەروتاری نیۆرك تایمز لە ساڵی ١٩٩٢ لەسەر ئەوە سوور بووە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەبێ خۆی لە دەستێوەردانی بۆسنیا بە دوور بگری، چونکە ئەمە "ململانێی ئەتنی و ئاینی قوڵە و هەزار ساڵە رەگی داکوتاوە" هەروەها نابێ ئەمریکا یارمەتی شۆڕشگێرانی عێراقی بدات لە ترسی ئەوەی " کۆتایی بە هێمای شارستانیەتی دوو هەزار ساڵەی مێژوویی میسۆپۆتامیا بێنن". هەروەها پاول وتووشیەتی: ئەمریکا دەبێ کاتێ بکەوێتە کار کە حساباتی بەرژەوەندی ئەمریکا بە ئاشکرا بکەوێتە مەترسیەوە، کۆندالیزا رایس، راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی کەوتە بەرسەرنجی سەرۆك بۆش بە هەمان شێوەی برنت سکاوکرۆفت کە مامۆستای کۆندالیزا و هاوەڵی باوکی بۆش بوو. کۆندالیزاش لەسەر هەمان شێوەی سیاسەتی واقعی مامۆستاکەی دەرۆشت.

پاوڵیش بۆ خۆی قوتابییەکی تری سکاوکروفی هەڵبژارد، ئەمیش ریچارد هاس بوو، کە وەك شارەزای رۆژهەڵاتی ناوەراست لە لای خۆی دایمەزراند و کردیشی بە بەڕێوەبەری نەخشەدانانی سیاسی. لە نووسینەکانیدا. ریچارد هاس رێنمایی وابوو کە "نیزام لە دادوەری بە بنەماترە" و لێرەشەوە "هەرچەندە جیهان زیاتر باشتر دەبێ بە بێ سەدام بەڵام هەوڵی لابردنی هەڵە دەبێت".

هەروەها بۆش هەندێ پۆستی باڵای ئیدارەکەی خۆی دا بە ئینتەرناسیۆنالیستەکان" ئێمە پێویستمان بە پتەوکردنی پەیوەندیەکانمانە لەگەڵ هاوپەیمانە دیمۆکراسیەکانماندا و بەرەنگاربوونی ئەو رژێمانە بکەین کە دژی بەرژەوەندیەکان و بەهاکانمانە ". ئەمە لە ناوەرۆکی فەرمایشتێکی سیاسەتی دەرەوە دایە، کە لە لایەن وەزیری بەرگری تازەوە ئیمزا کراوە. رۆناڵد رۆزڤێڵد و گروێیل، کە لە دوا رۆژدا دەبنە یاریدەدەری بۆش. ئەم فەرمایشتە بە مەبەستی دیاریکردنی پرۆژەی سەدەی تازەی ئەمریکا، کە دوو ساڵ بەر لە هاتنە سەر حوکمی سەرۆك بۆش، ئامادەکراوە.

جێگری رامسفیلد، پۆل ولفۆویتس بە هەمان ئەندازە هاوکاری پۆڵی پرنسیپەکانی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو. ئەم پیاوە لە ساڵی ١٩٧٦دا دەرکەوت وەك ئەندامێکی ( تیمی B) ئەم تیمە گروپێکی پارێزگەران بوون لە رووی سیاسەتی دەرەوە. بەو پێشنیارە ناسراون کە کۆمیتەی هەواڵگری لەسەر سەر خولاندەوە، چونکە بە پێی هەڵوێستی نەرمی ئەم کۆمیتەیە یەکیەتی سۆڤێت بەنیەت پاك لە قەڵەم درابوو. لە ماوەی حوکمداری ریگن و بۆشدا ولفوڤیتس بە دەستوبرد لە پلە و پایەکانی وەزارەتی دەرەوە و پنتاگۆندا بەرز بووەوە. لە ساڵی ١٩٩٢دا گۆیەنی دوو سەری ( طیفي ) سیاسی ووروژاند، کاتێ وەك جێگری وەزیری بەرگری بۆ کاروباری سیاسی، هانی ئەوەی دەدا کە باڵا دەستی سەربازی ئەمریکی تەرخان بکرێ بۆ " سەرکوتکردنی ئەوانەی کە

تەنانەت ئاواتی ئەوەیان دەخواست کە ڕۆڵێکی قەبەتریان هەبێت لەناوچەکەیاندا یان لە هەچ شوێنێکی جیهاندا بن".

لە ساڵەکانی ١٩٩٠ ولفوویتس وەك پاڵەوانی ماندوو نەناس سەر بە کەمایەتیەکان لە موسڵمانەکانی بۆسنیاوە تا کوردەکانی عێراق دەرکەوت. ولفوویتس، پێش ئەوەی پلە و پایەی هەبێ، سکاڵایەکی لە ناسیۆنال ئینتەریسندا نووسیوە و دەڵێت: ( هیچ شتێك لەمە زیاتر بێ بنەما نابێ لەو بۆچوونە -واقعی- یەی سیاسەتی دەرەوە کە مافەکانی مرۆڤ پشتگوێ بخرێت، چونکە مافی مرۆڤ ئامێری گرنگی ئەم سیاسەتەن.)

دوا بە دوای ڕێ و ڕەسمی وەرگرتنی حوکم، بۆش بە تیمەکەی سیاسەتی دەرەوەی وت: ( ڕێك نەکەوتن لە ئارادایە، بە هیوام بۆچوونی جیاواز هەبێت. ) ڕێك نەکەوتن هەبوو، بەڵام لە خەتە ناسراوەکاندا نەبوو. کاتێ هاتنە سەر باسی هێزی ئەمریکی ئەکتەرە بیرۆکراسییەکانی ئەم ساڵانەی رابردوو قاڵبی دامەزراوی خۆیان هەبوو. وەزارەتی دەرەوە ڕێنمایی ڕۆڵێکی چالاکیان دەکرد لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. پینتاگۆن کە دەستی بە شەڕی ڤێتنامدا چزا بوو ئامۆژگاری ئەوەی دەرکرد کە دەست بە کڵاوی خۆیانەوە بگرن.

تەنانەت لە ناو ئیدارەکەی ڕۆناڵد ریگن دا، هەرچەندە وا دەردەکەوت کە هەموو یەکبن و هاوڕا بن، داستانی شەڕ و هەرا لە نێوان شێفی پنتاگۆن هەبوو ، کاسپەر واینیگەر و جۆرج شۆلتزی وەزیری دەرەوە کە لە سکاڵایەکدا وتی: ( ئەمریکا بۆتە هاملێتی نەتەوەکان. ) و سەری لێ تێکچووە و بە هیچ شێوەیەك نازانێت چی بکات بەرانبەر دوژمنەکانی. بە هەمان شێوە پرسیارەکەی مادلین ئۆلبرایت دێتەوە یاد، کە ئاراستەی سەرۆك ئەرکانەکانی سوپای، لە کاتی ئیدارەی کلینتۆن ، کولین پاولی کرد و دەڵێت: ( کەڵکی چییە ئەگەر خاوەنی هێزێکی باڵادەستین و بەقسەی تۆ بێت قەت بەکاری نەهێنین؟ )

لە بارەی مەسەلەی عێراقەوە، تیمەکەی بۆش هاوسەنگییەکەی هەڵگەڕانەوە، بەزەیی بە وەزارەتی دەرەوەدا دەهات، کە هۆشیاربوونەوەی دژی مەترسی بەکارهێنانی هێزی دەکرد، بەرانبەر تیمی پینتاگۆن کە باوەڕیان بە توانای خۆیان هەبوو. لە ئاستی وەزارەتی دەرەوەدا، کولن پاوڵ بابەتە واقعییە نامۆکەی خۆی هێنایەوە، لە ئاستی پنتاگۆنیشدا، ئینتەرناسیۆنالیستە تێکچراوەکانی وەك رامسفیلد ولفوڤیتس سەرنجی بەرفراوانی ڕۆڵی ئەمریکی نێو جیهانیان هێنایە بەرچاو و کاتێ کە باس دێتە سەر عێراق رێك نەکەوتنی نێوان ئەم دوو کەمپە دەگەڕێتەوە بۆ ئیدارەی بۆشی یەکەم، کە لە لایەکەوە کولن پاوڵ بە سەرکەوتوویی مشتومڕی وەستانی جەنگی دەکرد، دوای چوار رۆژ لە هەڵگیرسانی و نوکولی لە یارمەتیدانی عێراقیەکان دەکرد. لە لایەکی ترەوە ولفوڤیتس کە سەرپێچی لە بڕیاری ئیدارەکەی خۆی دەکرد و سوور بوو لەسەر لابردنی سەدام . ولفوڤیتس لە دە ساڵەی رابردوودا سەرقاڵی هەڵمەتی قایلکردن بوو، لە یارمەتیدانی چاکدارانی عێراق دژ بە سەدام، ئێستە ڕاسپاردەش وایە کە ویلایەتە کگرتووەکان، هەر ئەوەندەی ( هەلی گونجاوی بۆ هەڵسورێت) لە عێراق بدات. رامسفیلدیش لە ئاستی خۆیەوە وای رەچاو دەکرد کە گوایە (عێراق ئەمرۆ گەشتۆتە پلەیەکی باڵا بۆ ئاشووب نانەوە ).

هەرچەند تیمەکەی بۆش بەڵێنی مامەڵەی بەکارهێنانی هێزی دژی بەغدا لە مانگەکانی سەرەتای حوکمدا دابوو، وەك تیمەکەی کلینتۆنی پێش خۆیان هیچیان نەکرد. ئیدارەی بۆش نوکولی لە رێگەدانی یارمەتی کۆنگریس دەکرد کە بدرێ بە ئۆپۆزسیۆنی ناو عێراق، بۆ ئەوەی دژی رژێمی سەدام بەکاربهێنین. وێڕای ئەوەش وەزارەتی دەرەوە وردبوونەوەی حساباتی لەگەڵدا دەکردن. لە راستیدا، دوور لە گۆڕینی سیاسەتی لە پەلوپۆ خستنی سەدام بەرەو لابردنی، کۆشکی سپی کەوتە پاشگەز بوونەوە. تەنانەت، لەو داواکارییانەی کە تیمەکەی

کلینتۆن بەسەر عێراقدا سەپاندیان. تەنها دوو مانگ دوای ئەوەی پاول پۆستەکەی وەرگرت، دەستی کرد بە گەشەپێدانی نەخشەیەك بۆ لابردنی گەمارۆی دە ساڵە دژی دوژمنی ئەمریکی لە جەنگی کەنداودا بە بیانوی لابردنی ستەم لەسەر گەلانی عێراق. کوڵن، پلانی ئەوەی دادەنا کە گەمارۆی کاروباری بازرگانی ئاسانتر بکرێت و گەمارۆی ناردنی کەلوپەلی سەربازی پتەوتر بکرێت، بەم شێوەیەش رەخنە گرتن لە ئەمریکا هێمنتر دەبێتەوە.

پاوڵ لە مانگی نەورۆزی ٢٠٠١دا رووی کردە رۆژهەلاتی ناوەراست بۆ نواندنی پلانەکەی، ڕایگەیاند کە هاوەڵەکانی لەو ناوچەیەدا وتوویانە کە پلانەکەی دروستە و بەراستیان زانیوە، بەلاّم هاوەڵەکانی لە واشنتۆن، بە تایبەتی سەرۆك و جێگرەکەی و وەزیری بەرگری ئەم پلانەیان بەلاوە دروست نەبوو، بە پێچەوانەی قسەکانی پاول خۆی کە لە کاتی گەشتەکەیدا ڕایگەیاند: عێراقیەکانیش هیچ لەم کالاّ هەرزانانەیان نەکری. بەرپرسەکانی بەغداش دەستبەجێ پێشنیارەکەیان بە ( هیچ وپوچ) لە قەڵەمدا. هاوەڵە عەرەبەکانی پاولیش، هەرئەوەندەی ماڵئاوایی لێکرد دەستیانکرد بە سووکایەتی کردن بە پلانەکەی. بە هەرحاڵ و زیری دەرەوە گوری دایە خۆی و دەستی کرد بە ڕەواج پێدانی ئەم پلانە چ لە ئەمریکا و چ لە نەتەوە یەککگرتووەکان دا. لە کۆتایشدا سەرکەوتوو بوو. بەلاّم کاتێ کە نەتەوە یەککگرتووەکان سیستمی تازەی گەمارۆدانی پاولی پەسەند کرد، بەگوێزەرەکە قایل بوون وکوتەکەکەیان خستەلاوە.

کاتێ بە شادیەوە گەمارۆیان لەسەر عێراق ئاسانتر کرد، مادده سەختەکانی ئەم پلانە بەجێهێڵران، لەوانە: هاوبەشی دراوسێکانی عێراق بۆ چاودێری کردنی ناردنی نەوت بۆ دەرەوە بە شێوەی نایاسایی، لەگەڵ رێگەدان بە چاودێری نێودەوڵەتی بە درێژایی سنورەکانی عێراق. پاوڵ وایدەرخست کە

ئەمە " هەنگاوێکی بەرچاوە بۆ چاککردنی توانای رژێمی عێراق بۆ ئەوەی ڕوو بە ڕووی پێداویستیەکانی گەلەکەی ببێتەوە. سەدام هەندێ شتی بە بەلاش دەست کەوت. ئینجا (١١)ی ئەیلول هات بەسەردا. ئەم ڕۆژە، ڕەنگە، بۆچوونی ڕاوێژکارە دبلۆماتەکەی سەرۆك بۆشی نەگۆڕی بێت. لەوانەشە تەنانەت ئەو مەترسیەشی نەگۆڕیبێ کە سەدام حوسێن خوڵقاندویەتی. بەڵام سەرۆك خۆشی وسیاسەتی دەرەوەشی گۆڕی.

بە وردی تا چ ڕادەیەك سەرۆك گۆڕا و سیاسەتەکانی دوا بە دوای ئەم پەلامارە پەرەیسەند، لەوانەیە لە زنجیرە قسەکردنەکانیدا لە نێوان ئەیلولی ٢٠٠١ و ئەیلولی ٢٠٠٢ ڕەچاو بکرێت، شان بە شانی دۆکۆمێنتی ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی، کە لە وتارەکەیدا بە فەرمی ئاماژەی پێدراوە، کە لە میانەی کەمتر لە یەك کاتژمێردا ئاراستەی کۆمیتەی هاوبەشی کۆنگرێس کرد، لە بەرواری(٢٠) ی ئەیلولی (٢٠٠١) دا. بۆشی دووەم وەك باوکی، واقعی خۆی گۆڕی بە ئینتەرناسیۆنالیست و هەوڵی پەسەندکردنی نمونەیی ئەمریکی گرتەبەر، بە هەمان ڕادەی دڵسۆزی هاری ترومان و جۆن کەنەدی و ڕۆناڵد ریگن. بۆش لەم ڕێگەیەوە وەسفی ئامانجی ئەمریکای کرد.

بەرەو پێش ڕۆشتنی سەربەستی مرۆڤ، دەسکەوتە مەزنەکەی ئەم سەردەمەمان لەگەڵ ئامانجە مەزنەکەی هەموو کاتێك، بە ئێمەوە بەندە. نەتەوەکەمان، ئەم جیلەمان، ترسی توند و تیژی و زەبر و زەنگ لە گەلەکەمان و دوارۆژمان دەرەوێنێتەوە. ئێمە بۆ ئەم مەسەلەیە بە هەوڵی لێهاتوانەمانەوە دنیا لە دەوری خۆمان کۆ دەکەینەوە، ئێمە ماندوو نابین، ئێمە مەرایی ناکەین، ئێمە نابەزین.

ئەمانە هەمووی، سەرۆك لە مانگەکانی داهاتوودا بە تەرکیزکردنە سەر هێزی سەربازی ئەمریکا لە ئەفغانستان، بەوپەڕی کاریگەرییەوە خستەروو. لە وێدا سەرۆك بۆش نەك هەر حەشارگاکانی بن لادنی کاول کرد، بەڵکو حکومەتی هەرە

چەوسێنەری جیهانی لەناو برد. لە وێدا هانی ئافرەتانی دا کە ڕووی خۆیان دەرخەن. منالآن کۆلارەکانیان بە ئاسماندا هەڵدەن و پیاوان بۆ یەکەم جار لە چەند ساڵێکدا بتوانن ڕیش بتاشن و ڕای خۆیان دەربڕن. وا دەوترا کە سەرۆك بۆش رەوشتی بێگەردی کرد بە سیاسەتی فەرمی.

رەوشتی بێگەرد، لە وتارەکەی سەرۆکدا، لە (٢٩) ی کانونی دووەم، ئاراستەی دەوڵەتی ئەمریکی بە هێزتر کرا، کاتێ کە عێراق و ئێران و کۆریای باکوری وەسف کرد. رۆژانی دوای ئەو وتارەشی هێشتا دەنگدانەوەی ئەو وتارە لە واشنتۆنەوە بۆ نیوۆرك و هەموو پایتەختەکانی ئەوروپا دەبیسترا. هیچ سەرۆکێکی ئەمریکی، لەو کاتەوەی کە رۆناڵد ریگن یەکیەتی سۆڤیێتی بە " ئیمپراتۆرییەتی شوم" وەسف کرد، ئا بەو شێوەیە سوکایەتی بە دانایی وحیکمەتی دەزگە ئاساییەکانی سیاسەتی دەرەوە و زاراوەی نەرمونیان نەکردووە.

نیویۆرك تایمز بە بەردەوامی داوای هۆشیارکردنەوەی دەکرد و نارەحەتی بەرانبەر " گەڕانەوەی هێز و سەرکوتکردن بۆ ڕێژەکانی پێشەوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی " دەردەبڕی. گروپێکی فەرمی ئیدارەی سەرۆکی پێشو تر، کلینتۆن، لە ئاستی خۆیانەوە نارەزاییان دەربڕی و سکالآی ئەوەیان بوو، کە گوایە سەرۆك بۆش زیاد لە پێویست مەترسی سەر ئەمریکای خەملآندووە و حسابی تەواوی بۆ خەتەری وەلآمدانەوەیانی نەکردووە.

لێرەوە ئێستە دەنگی سکالآکان گڕتر دەبن کاتێ بە کتوپڕی دەرکەوت کە بۆش سیاسەتی دەرەوەی ئیدارەی پێشوو دەشکێنێ و زیاتر لەو سکالآیانەی کە لە ئاستی مەسەلەی عێراقەوە دەکرا. لە هەندێ مانگی داهاتووتر دا، لە زنجیرەی وتار و چاوپێکەوتندا سەرۆك ڕوونی نەکردەوە بۆچی عێراق زیاتر لە وڵاتانی تر مەترسیدارتر بووە؟ وە چۆن (١١) ی ئەیلول، زەرورەتی بەرەنگابوونەوە دەخاتە

ڕوو؟ لە ئەیلولی ٢٠٠٢دا، لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، سەرۆک بە وردی شەڕەنگێزی و هەوڵدانی بە دەستهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ و گەشەپێدانی، چەتەگەری دژی گەلی عێراق، یاخی بوون لە نەتەوە یەکگرتووەکان و پشتگیریکردنی تیرۆریزمی سەدام حوسێنی شیکردەوە. لە میانەی درێژەدانی بە قسەکانی (٧) ی ئۆکتۆبەر بۆش ئەم وریابوونەوەی لە سینسیناتی* بەم شێوەیە باسکرد:

لەکاتێکدا کە لە جیهاندا مەترسی زۆرە ، هەڕەشەی عێراق بێهاوتایە، چونکە عێراق لە یەك شوێندا، خەتەرە گرنگەکانی سەردەمی تەمەنی ئێمە کۆ دەکاتەوە. چەکی کۆمەڵکوژی عێراقی کەوتۆتە ژێر ڕکێفی چەوسێنەرێکی پیاوکوژ، کە بە ئاشکرا خەڵکەکەی خۆی کیمیاباران کردووە. هەر ئەم چەوسێنەرە لە هەوڵدایە کە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، چووە ناو وڵاتێکی دراوسێی بچکۆلەوە و نامرۆڤانە داگیری کرد، بە بێ ئاگاداری لە نەتەوەکانی تری دا، بێ پەروا دوژمنایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکا. بە ڕەفتاری رابردوو و هەنوکەیەوە، بە توانای تەکنەلۆژییەوە، بە سروشتی بێ بەزەییەوە، ئەم ڕژێمە بێ هاوتا و بێ وێنەیە.

یانزەی ئەیلول هەڕەشەی سەدام حوسێنی نەخوڵقاند، یان تەنانەت حاڵەتی مامەڵەکردنی بە پەلەی لەگەڵ ئەم مەترسییەدا دروست نەکرد. زیاتر کردی بە چیرۆکی شانۆگەری مەترسییەك کە دەمێکە لە گۆڕێدایە. پێش ئەو ڕۆژە، سەرۆك ئەمریکاییەکانی بە ئاگا هێنایەوە: " ئێمە هەر ئاماژە بە پلان و نەخشەی قاعیدە دەدەین". بەڵام ئێستە لە عێراقدا" هەرەشەیەك دەبینین کە پوختەکانی زیاتر دیارن و ئاکامەکانی لە وانە زۆر کوشندە تر دەبێ.

---

* شارێکە لە ویلایەتی ئۆهایۆ. ( وەرگێر )

تێگەیشتن لەم هەڕەشانەی سەردەمی خۆمان ودەرك كردنی دیزاین و گومڕابوونی ئەم رژێمەی عێراق، هەموو هۆیەك دەخاتە بەرچاومان كە چاوەڕێی خراپتر بكەین، لێرەوە دەبێ ئەركی بە پەلە بخەینە ئەستۆمان و نەهێڵین خراپتر روو بدات. هەروەك سەرۆك روونی كردەوە: ئەركی سەرشانی ئەمریكا نە لە لابردنی سەدامدا و نە لە هاتنی حكومەتێكی عێراقی تازەی گونجاودا كۆتای دێت. لە فەرمایشتەكەیدا گۆڕینی رژێمی عێراقی بە خاڵی سەرنج راكێشەر دانا بوو، بەڵام رێباز و ئەرك و فرمانی بۆ سەرجەم سیاسەتی دەرەوەی ئەمریكیشی تێدا بوو.

بەم شێوەیە، لە وتاری (١) ی حوزەیرانی (٢٠٠٢) لە وێست پۆینت**، سەرۆك بۆش درێژەی بە ئیماكانی خۆیدا كە وەك سەرەتا دژی عێراق لە رابردوودا كاری پێ كردبوو. ئەوانەی پشت گوێ خست، كە لەمەودوا بە "دوكتیرین" واتە فەرمایشتی بۆش دەبژێردرێن. یەكەم قسەی ئەوە بوو كە ویلایەتە یەكگرتووەكان هەر بە تەنها پابەند نابێ بە " رێبازی جەنگی ساردەوە بۆ لە پەلوپۆ خستن و بەرهەڵستی"، بەڵكو لە جیاتی ئەوە" سەرچاوەی هەڕەشە تێكدەشكێنێ، شەڕ دەگوێزێتەوە ساحەی دوژمنانییەوە، پیلانەكانیان پوچەڵ دەكەینەوە، بەرەنگاری هەڕەشە دەكەین پێش ڕوودانی". دووەم ئەوە بوو كە ویلایەتە یەكگرتووەكان دەبێ چالاكانە گەشە بە پرینسیپەكانی بدات لە دەرەوەی وڵات دا، دەرك بەوەش دەكا " سەرجەمی خواستەكانی سەربەستی، دەبێ لە ئەفەریقا و ئەمریكای لاتینی و هەموو جیهانی ئیسلامیدا بەجێ بهێنرێت". لە كۆتاییدا ویلایەتە یەكگرتووەكان، هەموو ئەو كارانە دەكات كە بە پێویستی دەزانێ بۆ مانەوەی

** گرنگترین كۆلێژی سەربازییە لە ئەمریكا. ( وەرگێڕ )

وەك تەنها " سوپەرپاوەر" لە جیهاندا. یان هەروەك سەرۆك بۆش ڕایگەیاند " ئەمریکا هێزێکی سەربازی هەیە کە بەرهەڵست ناکرێ و نیازی وایە هەرواش بیهێڵێتەوە. لەم ڕووەوە، جێ مۆلەق کردن بە پێشبڕکێ کردنی چەك لە شوێنانی تردا بێ هودە دەبێ و پێشبرکێی بازرگانی و بە دواداچوونی ئاشتی سنوردار دەبێ"[٧] .

هەروەك چۆن ڕوودواوە تایبەتیەکانی کۆتایی سالآنی ١٩٤٠ هاوبەش بوونی فراوانی هێنایە پێشەوە و بوو بە دەلیلی ئەمریکا بە درێژایی جەنگی سارد، هەر ئاواش (١١) ی ئەیلول، گرێدراو، بە مەترسی عێراقەوە، فەرمایشتێکی ئاسایشی نەتەوەیی خولقاند، بۆ بەرەنگاری خەتەری بەربلاوتر لە سەدەی تازەدا. فەرمایشتی بۆش بۆچوونێکی ڕەوانی پێشەوەری ئەمریکای چەسپاند، کە نە کاردانەوەی هەیە و نە پابەندە بە پەیدابوونی مەترسی تایبەتەوە:

لە کۆتایی ئەیلولی ٢٠٠٢دا، کۆشکی سپی " ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی، بلاو کردەوە، کە دۆکۆمێنتێك بوو سێ بنەمای تێدا بوو، سەرۆك بۆش لە " ویست پۆینت" ڕوونی کردەوە: ڕێ لێگرتنی پێش ڕوودان، گۆڕینی ڕژێم و پێشەوایەتی ئەمریکی. بلاوکردنەوەی ئەمە چەرخێکی تری زەمانەی هێنایە پێشەوە، گۆڕانێکی لە بۆچوونی ڕۆڵی جیهانی ئەمریکی خولقاند، کە لەسەر بنەمای هێمای ڕەوشتی بوو. ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ دۆکۆمێنتی نیو سەدە لەمەوبەر کە تایبەت بوو بە لە قالبدانی دوژمن. جەنگی لە کرداری پۆلیسیەوە، بەخرکردنەوەی تاوانبارەکانی (١١) ی ئەیلول گۆڕی بە هەڵمەتی ڕیشەکێشکردنی چەوسێنەر و ناردنە دەرەوەی دیموکراسییەت. لە هەمان کاتدا بۆچوونی " ئینتەرناسیۆنالیزمی ئەمریکی جیاواز"ی گۆڕی بە سیاسەتی فەرمی دەرەوەی حکومەتی ئەمریکا.

ستراتیژی ئاسایی نەتەوەیی بۆش زۆر لە دۆکۆمێنتی ستراتیژی ئیدارەی کلینتۆن نەدەچوو، تەوەرەکانیش لەوەی باوکی و هاری ترومان یان رۆناڵد ریگن جیاواز تر بوو، لە لایەکی تریشەوە گرتنە خۆی کێشەی نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی مەحکەم، ستراتیژێکی ناسراو بوو. دۆکۆمێنتی بۆش بە رەقی لەسەر کاری بە پەلەی فەرماندەی ئەمریکی دەدوێ و دەڵێ " دەبێ ئێمە ئەو وڵاتانەی لە دوژمن دەچن بەوە قایل کەین کە واز بێنن لە بنیادنانی، نەوەك بکەونە سەروو رێزی یان هاوشانی هێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە. هاوکات باسی بەرگری کردن لە پێشەنگی ئەمریکا لە رووی رەوشت باشیەوە دەکات:

لە میانەی گرتنە خۆی کەلتور و پرنسیپمانەوە، ئێمە توانای خۆمان بە کارناهێنین بۆ دەستکەوتی یەك قۆڵی. ئێمە لە جیاتی ئەوە، بۆ هاوسەنگی هێز دەگەرێین، کە لە بەرژەوەندی ئازادی مرۆڤە. بارودۆخێك کە رێگە بە هەموو نەتەوەیەك وکۆمەڵگەیەك دەدا کە خۆیان بۆ خۆیان پاداشت و بەرەنگاربوونی ئازادی سیاسی و ئابووری لە ئەستۆ بگرن. بەوەی کە جیهان ئاسایشدارتر بکەین، رێگەی گەلەکانی هەموو دنیاش خۆش دەکەین بۆ ئەوەی ژیانێکی باشتر بە دەست بێنن.

هێشتا فەرمایشتی بۆش لە رووی هاوبەشییەوە بۆ گەشەدانی دیموکراسی روون و بێگەرد، لە رەوایی بەرژەوەندی خۆماڵییەوە بنەمای گرتووە. لە درێژەی ئەم فەرمایشتەدا هاتووە و دەڵێت: ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆیان هەیە، ئەگەر پێویست بوو کاری دەستبەجێ بکەن بۆ رێگرتن و بەربەستکردنی کاری دوژمنایەتی لە ناحەزەکانییانەوە. لێرەدا ناکۆکی نییە. سوور بوون لەسەر کاری دەستبەجێ لەو زانیارییەوە هەڵقوڵاوە کە جیهان ئەوەندە بچوك بووە و ئەوەندە خەتەرناك بووە کە تەنها لە فەفەسنان ( ئیحتیوا) بە کەم بزانێ و کاری دەستبەجێ دژی ئەو دیکتاتۆرانەی کە دەیانەوێت چەکی کۆمەڵکوژ

گەشە پێبدەن بە ئاشكرا خزمەتی بەرژەوەندیە دیمۆكراتییەكان دەكات. ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی لە لایەكەوە بە دوای لە یەك نزیك كردنەوەی نموونەییەكان و بەرژەوەندیەكاندا دەگەڕێت و لە لایەكی تریشەوە بە دوای رەوشت بەرزی و هێز. واتە هەمو ئاكارە گرنگەكانی " ئینتەرناسۆنالیزمی جیاواز" لە یەك شوێندا كۆ دەكاتەوە.

## بەشی حەوتەم
## لە پەلوپۆخستنەوە بۆ پەلاماری دەستبەجێ
## From Deterrence to Preemption

یەکەم ماددەی فەرمایشتەکەی بۆش، حەزی لە دەرخستنی کاری پێویست و دەستپێشخەرییە لە بارودۆخی تایبەتیدا. لە پەلوپۆخستن و ئیحتیوا کردن، بە بۆچوونی ستراتیژی ئاسایشی نیشتمانی، لەمە زیاتر سودی نییە " ئەگەر بزانین ئامانجی وڵاتە زیانبەخشەکان و تیرۆریستەکان چین؟ ئەوا ویلایەتە یەکگرتووەکان لەوە زیاتر ناتوانێ وەك رابردوو پشت بە کاردانەوەی مەزاجی ببەستێ، لە جیاتی ئەوە ئەمریکا دەبێ ئەو هەڕەشانەی دەکرێتەسەری، دەشتنیشانی بکا و تێکیبشکێنێ پێش ئەوەی بگەنە سەر سنوورەکانمان" بۆچی؟ چونکە هەروەك سەرۆك بۆش لە وێست پۆینت روونی کردەوە " ئەم جیهانە " لە دووڕێیانی ڕادیکاڵی و تەکنەلۆژیدا ڕاوەستاوە. " لێرەدا دەوڵەتە لاوازەکان و گروپە بچکۆلەکان هەوڵی بە دەستهێنانی هێزی وێرانکەر دەدەن بۆ لابردنی نەتەوە مەزنەکان". ئەم دووڕێیانە بە ئاشکرا لە عێراق لەیەك دەدەن.

هەندێ لە رەخنەگرانی فەرمایشتەکەی بۆش دەڵێن: ئیحتیوا کردن – کە لە پەلوپۆخستندا بەرجەستە دەبێ– پێوەری بەدیلێکی باشە بۆ دەست پێشخەری. عێراق لەناو " قەفەزی جیۆپۆلیتیکی" دا کپ کراوە. لێرەوە ئەم رەخنەگرانە مشتومڕی ئەمەیانە: کەواتە بۆچی خەتەری جەنگی دەست

پێشخەری بگرینە خۆ؟ بۆ لێکۆڵینەوە لەم مشتومڕە باش وایە سەرنجێك لە رابردوو بدەینەوە، چونکە ئەوە یەکەمجار نییە گوێ بیستی ئەم مشتومڕە ببین. بەر لە پرۆسەی گەردەلولی بیابان، گوایە تەمێکردن دەبێتە هۆی هێورکردنەوەی سەدام، بوو بوو بە بۆچوونی هاوبەش لە نێوان ڕووبەری ئەندامانی پارتی دیمۆکراتدا. لە ساڵی (١٩٩٠)دا، سیناتۆر تۆم هارکین سەرسوڕمانی لەوە دەردەبڕی کە " هەتا ئەمڕۆش چەند کەسانێك هەن کە دەڵێن لە راستیدا سەدام براوەیە، تەواو بە پێچەوانەوە سەدام رۆژانە دەیدۆڕێنێ، ئایا ئێمە دەمانەوێ ساڵ و نیوێك چاوەڕێ بکەین بۆ ئەوەی کاردانەوەی راستەقینەی گەمارۆ رەچاو بکەین، یان ئەگەری لە دەستچوونی (٢٠٠٠٠) ئەمریکایی قبوڵ بکەین کە لە شەڕی ئەم ساڵدا روو دەدا؟. لە ئاستی دەنگدانەوەی ئەم هەڵسەنگاندنە دا، بریژێنسکی، راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆکی پێشوو، کارتەر، دەڵێت: ( دەبێ ئێمە لە سیاسەتی سزای ئیحتیواکردندا بەردەوام بین، ئەم سیاسەتە گونجاوە و بەر لە عێراق گیراوەتەبەر....... و سزای چەشتووە، مادلین ئۆلبرایت لەسەر ئەوەی سوورە کە ( ئەمڕۆ عێراق لە ناو قەفەسی بڕیاری یەککالایی نەتەوە یەگکرتووەکاندیە ) هاوکات سیناتۆر کارل لیڤین دەڵێت: ( ئیحتیوا کردن هەرچونێی بێ لە کاردایە. ) بۆ ئەوەی جیمی کارتەریش لەم باسە بەدەر نەبێ، ئەویش دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی کە ( ئێستە هیچ مەترسییەك لە بەغداوە بەرانبەر ویلایەتە یەککرتووەکان نییە. )

پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا یاوەرانی لیبراڵ، کە پێشتر ئەوەندە بە هەڵەدا چوو بن، ئێستەکە هیچ میسداقییەتێکیان هەیە؟ زۆر زەحمەتە. بیرۆکەی " ئیحتیوا کردنی کاریگەر " هەر خۆزگەخواز بێت، لە کاتێکدا لە ساڵی (١٩٩٩)دا عێراق بە قاچاخ بایی (٣٥٠)ملیۆن دۆلار نەوتی دەناردە دەرەوە،

ئەمڕۆ سەدام ساڵی ( ٣) بلیۆن دولار بە فرۆشتنی نەوت لە بازاڕی رەشدا خڕ دەکاتەوە. عێراق نزیکەی ( ٢٠٠٠٠٠ ) بەرمیل نەوت بە تەنها بۆ سوریا دەنێرێ. ئەمە جگە لەوەی پارەش لە پرۆگرامی نەوت بەرانبەر خۆراك لا دەدات و داوای باج لە فرۆشتنی هەموو بەرمیلە نەوتێك دەكات. بە مەش بە تێکڕا، سەدان ملیۆن دۆلار پەیدا دەکات. هێڵەکانی ئاسمانی بازرگانی، بە شێوەیەکی رۆتینی گاڵتە بە گەمارۆی دژ بە عێراق دەکات. وڵات دوای وڵات پەیوەندی دبلۆماسییان لەگەڵ بەغدا دامەزراندەوە، کۆمپانیاکانی چین و روسیا و فەرەنسا پێشبڕکێی ئیمزاکردنی قۆنتەراتیانە لەگەڵ سەدام دا. پێشەوا عەرەبەکان هەر لە کۆنە دوژمنی وەك سعودیە و میسرەوە تا ئەندامەکانی( کۆمەڵەی عەرەبی ) بە گەرمی باوەشیان بۆ سەدام کردۆتەوە.

لەمەش بترازێ سوپای عێراقیش دۆخی خۆی باش کردووە و بە پارەی پەدەککراوی تر ماددەی قەدەغە لە چین و سربیا دابین دەکات، بەمەش توانای نیشانە گرتنەوەیان لە فڕۆکەکانی هاوپەیمانان چاك کردووە و رۆژانە بەرەنگاری فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمریکا دەبنەوە و تا و نە تاوێکیش هاش و هوش لەسەر سنووری کوەیت دروست دەکەن. لە هەمووی گرنگتر، بە پێی قسەی پشکنەرانی پێشوی چەك و دەزگەکانی هەواڵگری و راکردووە عێراقیەکانیش، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە سەدام تەشەنە کردنی پرۆگرامی چەکی کۆمەڵکوژی بە زیندوویی هێشتۆتەوە. ئەمەش لە یاد نەکرێ هەتا (٢٠٩ مووشەکی سکود دیار نەماوە، سەرۆکی پێشوی پشکنەری چەك، ریچارد بەتلەر هۆشیاری دەدات، ( کە سەدام لە پرۆگرامی چەکی کۆمەڵکوژدا هەر لە کاردایە ). و ( ئیحتیواکردن بە وەلامدانەوە ناژمێردرێ. ) سەرۆکی پێشوی پرۆگرامی ناوکی ئەتۆمی عێراقی، خدر هەمزە دەڵێت: پەنجەرەی دەرفەت بۆ وەستاندنی هەوڵی سەدام بۆ بە دەستهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ

لەوانەیە لە دوو سێ ساڵی داهاتوودا دابخرێ. جێگری سەرۆك، چێنی، کێشەی ئەو کەسانەی کە سوورن لەسەر کاریگەری پەلوپۆخستن کورت دەکاتەوە ودەڵێت: ( مشتومڕەکە ئێستە بەم شێوەیەیە، وەك دەزانین سەدام ترسناکە، ئێمە پێویستمان بەوەیە کە ڕێگەی بدەین بە هێزتر بێت پێش ئەوەی ئێمە هیچ شتێك بکەین ).

لێرەدا دوو جۆرە دوا ڕۆژ چاوەڕێ دەکرێ وەك چەکپشکنەری پێشوو چارڵس دوفلەر دەڵێت: ( عێراق لە ژێر دەستی ڕژێمدا بمنێتەوە بە توانای چەکی کۆمەڵکوژەوە، بە نوێڵی چوار تا پێنچ ملیۆن بەرمیل نەوتی ڕۆژانەوە، بە فایلی رابردوویەوە، بە ڕەوشتی شەڕەنگێزییەوە، بە ڕەوشتی زاڵبوون بەسەر هاوڵاتیانی خۆی و دراوسێکانی دا. ) بە دیلێکی تر ئەوەیە وەك دوفلەر لەسەری دەڕوات: ( عێراقێکی خاوەن ڕەوتی باش، عێراقێك لە ژێر دەستی حکومەتێکدا بێت کە بە پێی نەریتی نێودەوڵەتی هەڵسوکەوت بکات، کە بۆی هەیە ببێتە دینەمۆی نەشونما لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست دا. ) بەدیلی دووەم کە پێویست بە باسکردن ناکات، بەرجەستە نابێت تا سەدام لەسەر حوکم بێت.

بە دڵنیاییەوە، هەموو ئەوانەی دژی غەزووی عێراق دەوەستان، بە تەنها سیاسەتمەدارانی چەپ نەبوون. لە پایزی ساڵی ۲۰۰۲ دا چەند فەرمییەکی بەناوبانگ لە ئیدارەکەی جۆرج هێربەرت وٚکەردا، پڕ بەدەم دژ بە کاری سەربازی هاواریان دەکرد. زۆربەی ئەمانە مشتومڕەکانیان لەسەر بنەمای لە پەلوپۆخستن بوو – بۆچوونی ئەوان وابوو لەبەر مەزنی جبەخانەی چەکی ئەمریکی، زەحمەتە سەدام پشت بەو جبەخانەیەی خۆی ببەستێ بۆ بەرەنگاربوونەوە دژی جبەخانەی ئەمریکی. وەك سکاوکرۆفت لە ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت دا نووسیویەتی ( ئەگەری هەڕەشەی سەدام زیاتر بۆ ئیبتیزازی ئەمریکایە نەك بەکارهێنانی چەك، لە ڕاستیدا ئەگەر چەك بەکاربهێنێ ئەو کاتە خۆی و ڕژێمەکەی دەخاتەبەر گورزی

گورچکبڕی ویلایەتە یەکگرتووەکان، سەدامیش بۆ خۆی بەوە ناسراوە کە دەیەوێت بە هەر شێوەیەك بێت خۆی دەرباز بکات. یان وەك ( ستیڤ چامان ) ی رۆژنامەنووس دەڵێت: ( نابێتە جێی سەرسوڕمانمان ئەگەر پەشیمان بووەوە لە بەکارهێنانی چەکی کۆمەڵکوژ. چونکە سەدام لەمەو پێشتریش کاری وای کردووە).

مشتومڕی واقیعییەکان بۆ لە پەلوپۆخستنی سەدام لاوازە. لۆژیکی لە پەلوپۆخستن، بە تایبەتی لە کاتی وەڵامدانەوەی زۆر گەورەدا – و لە کاتی جەنگی سارد دا وەك چاوەڕێ کرا، سوودی هەبوو– چونکە ئەو ساکە شێوازی دڵنیایی بە تەواوی کەوتبووە سەر ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان و روسیا هەردوو دەزانن هەر ئەوەندەی دەستیان نا بە پەلەپیتکەی چەکی ناوکیدا هەردووکیان لە ناو دەچن. شێوازەکە، بە پشت بەستن بوو بەو گریمانەیەی کە گوایە پێشەوا سۆڤێتییەکان وەك خۆروشیف، برێژنێێڤ و گورباچۆڤ هوشمەندانە کار دەکەن و نایەنەوێت وڵاتەکەیان ببێتە کاولەی بە جێماوی ئاڵوگۆری چەکی ناوکی. ئایا ئەم جۆرە لە پەلوپۆخستنە، کە پابەندە بەوەی ناحەزەکان توسقاڵێك خاوەن حیکمەتن، لەگەڵ سەدامیشدا کاریگەر دەبێت؟

راستییەکە ئەوەیە، سەدام خۆی بە سەرکێشیکەرێکی پاسۆلۆجی دەرخستوە، بە هەر حاڵ بۆچوونەکانی بەم شێوەیەن: کاتێ کە پەلاماری ئێرانیدا لای وابوو کە ئەو رژێمە بە زووی هەرەس دێنێ، کاتێ پەلاماری ئیسرائیلی دا، وایدەزانی بەم کارە پشتگیری عەرەب بۆ هاوپەیمانێتی سەر بە ئەمریکا لە ناو دەبات و کاتێ کوەیتی داگیر کرد، بە حسابی خۆی، ئەمریکا وەڵامی ناداتەوە. هاوکات بە هەمان شێوەش گرنگی لەوەدایە کە سەدام لە بۆشایدا دەژی و شانی داوە بە ( جۆرە پیاوی بەڵێ گەورەم ) ەوە کە هاوبەشی خەیاڵەکانی دەکەن.

خوێندنەوەیەکی فەرمیی هێزی ئاسمانی ویلایەتە یەکگرتووەکان سەر بە گەردەلولی بیابان بەناوی (مەزنەی هێزی ئاسمانی جەنگی کەنداو) بەم شێوەیە وەسفی حساباتی سەدام دەکات: ( لوت بەرزی عێراقی – کە بوو بە بەلاّ بۆ سەدام خۆی و ژەنەڕاڵەکانی – کە خۆی شێوازی ( ئارەزووی زلکردنی تواناکانی خۆی و بە کەم زانینی هێزی دوژمنانی ) دەردەخست– کاریگەری مەزنی دەخستە سەر تەرازووەکەی سەدام بۆ پێوانی حساباتی هێزەکان.

ئەوەی زیاتر بەرچاوی تەماوی دەکرد، باوەڕبوونی بوو بە فاڵچییەکان، کە زانیاری هەموو جموجۆڵێکی سەدامیان لە کاتی جەنگی کەنداودا لابوو، کەمی زانیارییەکانی لە بابەت نییەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، رابردووە ناسراوەکەی لە کەم تەرخەمی موجازەفە کردن و سەر کێشی دا، لە سەر ئەمانە هەموویەوە بۆچوونە نامەنتیقیەکانی بوو. واڵتەر لیپمان جارێك ئەم تێبینییەی بلاّوکردەوە ( ئەگەر ئێمە لە سەرجەم هەڵسوکەوتی خەڵکی تێنەگەین تا ئەو رادەیەی کە دەزانین ئەوان چی دەزانن، ئەو ساکە دەبێ بە ئینساف بین و لەبەر ئەوەی بە ئینسافیش بین بۆ هەڵسەگاندنی نەك هەر ئەو زانیارییەی کە لەبەردەستیانە، بەڵکو بە چی برێك لە بێژنگیان داوە.) بۆ بەریەستکردنی کاریگەری سەدام دەبێ ئێمە بزانین ئەو بە چی عەقلێك زانیارییەکانی لە بێژنگ داوە. ئەمەش بنەمایەکی لەرزۆکە بۆ شێوازێکی کاریگەر لە پەلوپۆخستن.

رەنگە سکاوکروفت بیر لەوە بکاتەوە کە سەدام جبەخانە کوشندەکەی بەکار نەهێنێت، بەلاّم پێش ئەوەی راوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی پێشووتر سکاوکروفت، بنێرین بۆ لای سەدام بۆ ئیمزا کردنی رێکەوتننامەی کۆنترۆلی چەك، دەبێ بە قایل کردنەوە روونی بکاتەوە، چۆن چەکی کۆمەڵکوژ دیکتاتۆرەکانی جیهانی سێهەم دەکەن بە پیاو ماقولان؟ خاوەن بیر و هەڵوێست، جۆناسان شێل، ڕاگری تێکشکاندنی چەکی ناوکی، لە بابەتی فاکتەری پەلوپۆخستنەوە کە

پابەندی پێوە دەکرێ نووسیویەتی: ( باری دەروونی، بەرژەوەندی خۆی، بیرو هۆشی دروستی، ورد بینی کۆنترۆڵی خودی خۆی و رووناکی بیر و بۆچوونی، ئەمانە هەموو هێمای پێشرەون و بنەمان بۆ سەلامەتی هاولاتیەکانی و نیشتمانەکەی. بە کورتی، دەبێ بڕیاری وابێ کە ئەو جیهانەی تێیدا دەژی ئەوە نییە کە شەڕەنگێزی بە ئاسانی تێدا بچێتە سەر. هۆشیاری و بیر دروستی، وردبونەوە و خۆ کۆنترۆڵکردن ئەمانە هێمایەکن کە پێویست ناکات بخرێنە بەر باس، چونکە ئەمانە هیچیان لە سەدام حوسێندا نین.)

بە هەرحاڵ، باش لەگەڵ هەستی سەدامدا دەگونجێ کە ببێتە خاوەنی جبەخانەیەکی مەزن و دەست بەسەر دراوسێکانیدا بگرێ و بەربەستی ویلایەتە یەکگرتووەکانیش بکات. ئەمڕۆ ئێمە دەتوانین بە کەمترین زیان پەلاماری سەدام بدەین، چونکە هێشتا بومبای ناوکی نەکەوتۆتە ژێر دەستی. کە بوو بە خاوەنی ئەم بۆمبایە ئەو ساکە پرسیارەکە دەگۆڕێ. واتە ئێمە بەربەست دەکرێین. بۆ ئەم شێوە بەڵگەیە دەبێ سەیری کۆریای باکوور بکەین. لە پاش ئەوەی ئەم وڵاتە جاڕیدا کە لە راستیدا بۆەتە خاوەنی ئامێری ناوکی، ماری مالگوری لە واشنتۆن پۆست بە سەرسوڕمانەوە دەپرسێ: ( بۆچی ئەرکی سەرشانی ئێمەیە کە عێراق بۆمباران بکەین، غەزوی کەین و داگیری بکەین؟ وەلامەکە روون و ئاشکرایە: چونکە عێراق هێشتا بۆمباکەی نییە و کاتێ کە بوو بە خاوەنی، ئەو ساکە هەر وەك کۆریای باشور توانای ( سەرانە سەندن ) ی لە ئەمریکا دەبێت، یا بەربەستی دەکات و مامەڵەی ( جێنتڵ مان) ی لەگەڵدا دەکرێت. ئاوا دەبینین کە هەوڵی عێراق بۆ دروست کردنی بۆمبا تەواو لۆژیکییە. ) سەدامێکی ماقوڵ، کە بوو بە خاوەنی چەکی ناوکی وەك سەدامێکی ناماقوڵ بەربەستی وەلام دانەوەمان دەکات لە هەراسان کردنەکەی خۆی. ئەو ساکە سەدام دەتوانێ دەست بکات بە شەڕفرۆشتن و سەرانە سەندن لە دراوسێکانی و بەلایەوە ئەمریکا بەربەستی ناکات، چونکە لە

زیانی گیانی هاوپەیمانەکانی و خۆی دەترسێ و نایەوێ بەرهەڵستی لە سەدام بکات. لێرەوە سەیری ئەم هەلە ناقۆلایە و ئەم ئەگەرە بکە، کە کاری پەلوپۆخستن دەیخاتە پێشت : گریمان سەدام – شێتۆکەیە و ئارام بگرە تا دەبێ بە خاوەنی ئامێرەکانی شەڕفرۆشتن یان باشە سەدام پیاوێکی ماقوڵە و ئارام بگرە تا دەبێ بە خاوەنی ئامێرەکانی شەڕفرۆشتن.

وا دەر ئەکەوێ کە توێژەرەکانی سیاسەتی دەرەوە کە پابەندن بە بۆچوونە کۆنەکانییەوە ئەرەیان لە یاد چوو بێ کە جیهان لە کاتی شەڕی ساردەوە گۆڕاوە، شان بە شانی ئەمەش، ئەو مەترسییانە کە روو بە رووی ئەمریکا دەبنەوە وەك خۆی نەماون. لە تەنیشت مردنی کۆمۆنیزمی سۆڤێتەوە، گەورەترین گۆڕانکاری ئەوەیە گەلێك وڵاتی تر بوون بە خاوەنی چەکی کۆمەڵکوژ و خاوەنی وەسیلەی گەیاندنیان. لە کەمەساڵێکی رابردوودا هیند و پاکستان، تێکڕا دوانزە تەقینەوەی ئەتۆمیان ئەنجام داوە. پاکستان، ئێران، کۆریای باکوور و چین مووشەکی بالیستییان بۆ تاقی کردنەوە هەڵداوە. عێراق، سوریا و لیبیا خاوەنی پرۆگرامی بەردەوامی مووشەکن و هەروەها چین و روسیا و کۆریای باکوور سەرقاڵی ناردنی تەکنەلۆژیای مووشەکی بالستین بۆ وڵاتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست. سیاسەتمەدارانی ویلایەتە یەکگرتوەکانیش لە دەرککردنی ئەم مەترسییانە سست بوون، گەیشتە ساڵی ١٩٩٨ ئەو ساکە هینری شێڵتن، سەرۆکی ئەرکانی یەکگرتوو جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە ( کۆمیتەی خەبەرگوزاری، دەتوانن بە کاری هۆشیارکردنەوەی پێویست هەستن ) لە ئەگەری ئەوەی یەکێك لەم وڵاتانە مەترسی ICBM بخاتە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان. بەڵام هەفتەیەك دوا بە دوای جاڕدانەکەی شێڵتن – بەبێ هیچ وریاکردنەوەیەك لە کۆمیتەی خەبەرگوزاری – کۆریای باکوور توانی مووشەکی بالیستیکی نێو کیشوەری ( واتە ماوە درێژ ) بە سێ قۆناغ بەسەر ژاپۆندا بتەقێنێ. توێژەران وهەواڵگری دەست بەجێ نکۆلیان لە

کەم تەرخەمی خۆیان کرد. توێژینەوەکە کە لە ساڵی (٢٠٠٠)دا ( CIA )، جەختی لە سەرکردەوە باسی ئەوە دەکات کە ( ئەگەری بەکارهێنانی مووشەکی داڕێژراو بە چەکی کۆمەڵکوژ دژی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەمڕۆ گەورەترە لە زۆربەی زۆری کاتەکانی شەڕی سارد و ئەم مەترسییە لە تەشەنە کردندایە.

کارێکی سروشتییە کە ئەم وڵاتانە هەموو لە لایەن چەوسێنەرێکی ناجێگیری ( مهزوز ) وەك سەدام حوسێنەوە حوکمڕانی ناکرێن. لە راستیدا، کێشەی حساباتی لە پلوپۆخستن لە سەردەمێکی ناسراوی بڵاوبوونەوەی چەکی ناوکیدا، زیاتر لە سروشتی بڵاوکردنەوەی ئەم چەکەوە دێ وەك لە سروشتی رژێمەکەوە. وەك هینری کیسنجەر نووسیویەتی: ( لە پەلوپۆخستن تۆسقاڵێك ماقوڵتر بوو، کاتێ کە تەنها یەك نەیاری خاوەن چەکی ناوکیت هەبوو، ) بەڵام ئێستە ئەو تۆسقاڵەش کەمتر بۆتەوە. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە لە سەردەمی بڵاوبوونەوەدا ژمارەکە بەرز بۆەتەوە و کەمتر دەگونجێ لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. لە جیاتی ئەوەی بۆ یەك رژێم بکەوینە پاڕانەوە، کە هۆشیارانە بیر بکاتەوە، ئێستە بۆ سەلامەتی خۆمان دەبێ بۆ شەش و حەوت بپاڕێینەوە. ئەم ژمارەیەش هەر ئەوانە لە خۆ دەگرێ کە بەناونیشان ناسراون. گەلێك لە هەرە خەتەرناکە دوژمنەکانی ئەمریکا ئەکتەری بێ وڵاتن، لەمانە ئەلقاعیدەیە. چونکە ئەم تۆڕە تیرۆریستییە شاراوەن وبێ جێ و شوێنن، زۆر زەحمەتە بەربەست بکرێن،. بە هەمان شێوەش زۆر ستەمە بەربەستی ئەو وڵاتەنە بکرێت کە گرووپە تیرۆریستەکان بۆ ناردنی چەکەکان بەکار دێنن. هێشتا، هیچ لە بارەی پرسیاری رەوشتەوە نەوتراوە، کە خۆبەخشانە باوەش بگرینەوە بۆ رەفتاری وێرانکردنی ماڵ و بەرەو تیاچوونی خەڵکی سیڤیلی خۆمان و خەڵکی وڵاتی رژێمە ناحەزەکانیشمان. هەر چۆنێ بێ ( ١١ ) ی سێپتەمبەر فێری کردین کە بەشێکی

گەورەی دوژمنەکانمان پشتیان بە خۆ کوشتن ئەستوورە، ئەمانەش بەوانە وەسف کراون کە بەربەست ناکرێن.

ئەگەر ئیحتیوا کردن و لە پەلوپۆخستن لەمەو دوا بەس نەبێت، بەبێ گومان ئەمریکا پێویستی بە نەخشە رێگەیەکی تازە دەبێت. لەوێوە کە ئیحتیوا و بەربەست کردن سەرکەوتو نەبوون – وەك حاڵەتی دیکتاتۆرێکی سوشیوپاتیکی وەك سەدام و گروپی تێرۆری وەك ئەلقاعیدە – لەوێوە دەبێ کە ئەمریکا ئەم رێگە روناکە بگرێتەبەر بۆ پاراستنی هاولاتییەکانی بەهۆی پەلاماری دەست بەجێوە.

بەدبەختانە، بەشی زۆری ئەو مشتومڕەی کە لە سەر ئەم بۆچوونانە دەخولانەوە زیاتر بوونە رێگر، نەك رێخۆشکەر. دەستپێکردنی پەلاماری دەست بەجێ بابەتێکی تازەی ستراتیژی ویلاتەیە یەکگرتووەکان نییە. بەپێچەوانەوە هەڕەشە و ئەگەری هەڵمەتی دەست بەجێ، بۆ زیاتر لە سەدەیەك، بەشێك بووە لە ستراتیژی ئەمریکی. لە هەمووشی زیاتر، واتاکەی سادە و ئاشکرایە. پەلاماری دەست بەجێ واتە دەست وەشاندنی یەکەم.

وەك سەرۆك بۆش بە بەردەوامی روونی کردۆتەوە، خۆ دورخستنەوە لە ( ١١ )ی ئەیلولێکی تر، هەر چەندە بە دەگمەن روو دەدا، وا لە ئەمریکا بکات کە بە وردی رەفتار بکات. ون بوون لە ماخۆلای میدیادا لە بابەت پەلاماری دەست بە جێوە، لە ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆك بۆشدا جێگەیەکی بچکۆلە داگیر دەکات. ئەم ئیدارەیە چەند جارێك داکۆکی کردووە، کە پەلاماری دەست بەجێ تەنها ( لە رووداوی کەمدا دەکرێت ). لەوێوە وەك کوڵن پاوڵ دەڵێت: ( هەڕەشەیەك هەیە کە وەڵامەکەی لە هەڕەشە کۆنەکان جیاواز ترە.)

رەخنەگرانی سەرۆك بۆش دەڵێن: ( بەرزکردنەوەی ئەگەری پەلاماری دەست بەجێ، کە تا بێت قسەی لەسەرە بۆ ئاستی ستراتیژی ئاسایشی نیشتمانی بە واتای سەرپێچی کردن دێت لە بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی و کلۆرکردنی

ستراتیژی سەربازی ئەمریکی. ) فرانك هۆفمان لە بابەتێکدا کە بۆ ناوەندێکی چەپڕۆی زانیاری بەرگری نووسیویەتی: ( پەلاماری دەست بە جێ.. ) راستەخۆ دژی کولتوری سیاسی و ستراتیژی ئەمریکا رادەوەستێت. دیك ئارمی، کە رابەری زۆرایەتی پارتی کۆماری بوو لە پەرلەمان، لە ئاستی خۆیەوە دەڵێت: ( پەلاماری دەست بەجێ وا نەبووە و نابێتە پێکهاتەی بوونمان وەك نەتەوە ) لە سەروی ئەمەشەوە ئەلگۆر بۆ چوونی وایە کە ( ئەم رێبازە ئیشی ئەوەیە کە ئامانجی دنیایەك تێك بدات، کە ولاّتان تێیدا خۆیان بە مل کەچی یاسا لە قەڵەم دەدەن. )

بەلاّم رەخنە گرانی رێبازەکەی بۆش دواکەوتووانە لە یاسای نێودەوڵەتی بیردەکەنەوە، لە کارکردنی نێودەوڵەتیدا و لە مێژووی ئەمریکادا، بوارێکی پێشینە هەبووە بۆ رێبازی پەلاماری دەست بەجێ. با ئەم زاراوەیە ناوی ( هێرشی رێ لێگرتن بێ ) یان ( پێشبینی خۆ پاراستن. ) یان بە سادەیی ( پەلاماری دەستبەجێ ) بێت. نەتەوەکان بۆ ئەم مەبەستە، لە سەدان ساڵەوە جۆرە هەڵسوکەوتێکیان هەبووە، بنج و بناوانی ئەم بیرۆکەیە دەگەڕێتەوە بۆ باوکی یاسای نێودەوڵەتی، ناسراو بە هۆگۆ گرۆتیۆس، کە لە سەدەی حەڤدەهەمدا نووسیویەتی: ( یاساییە ئەو کەسە بکوژی، کە خۆی بۆ کوشتن ئامادە دەکات. ) لە شێوە بۆچوونێکی تریشەوە، تۆماس مۆر، داکۆکی دەکات:( ئەگەر ئەمیرێك لە ولاّتێکی بیانییەوە پەلاماری چەکی دا و ویستی ولاّتی خەڵکانی تر داگیر بکات، ئەو خەڵکانەش بۆیان هەیە لە دەرەوەی سنووری ولاّتەکەی خۆیان کتوپڕ و بە هەموو توانایانەوە پەلاماری ئەم ئەمیرە بدەن. )

لە ئەمریکا، پەلاماری دەستبەجێ لە لایەن وەزیری دەرەوە، ئەلیهو روتەوە، داکۆکی لەسەر کراوە. روت دانەری یاسای نێودەوڵەتی ئەمریکایە و لە ساڵی ( ١٩١٤ )دا جاڕی داوە کە ( ماف هەموو نەتەوەیەکی خاوەن سەروەرییە

خۆی بپارێزێ، بەوەی رێگە لەو بارودۆخە بگرێ کە دەبێتە هۆی دواخستن لە خۆ پاراستن.)

ئەمڕۆ، بنەمای یاسایی بۆ پەلاماری دەست بەجێ ئەوەندە فراوان بووە، کە رێگە بدات بە (پێشبینی خۆپاراستن) پێش روودانی هێرشکردنە سەرت. هەر وەك زانای سیاسی ریچارد ریگن لە کتێبەکەیدا کە ناوی ( Just War )ە نووسیویەتی:

پێویست ناکات ئەو نەتەوەیەی کە دەبێ بە قوربانی، چاوەڕێ بکات تا نەتەوەی شەڕفرۆش کوتوپڕ هێرش بکاتە سەری، پێش ئەوەی قوربانی بنەمای دیل بوونی بدۆزێتەوە بۆ پەلاماری دەست بەجێ دژی شەڕفرۆش. بە هەمان شێوەش نەتەوەی قوربانی نابێ چاوەڕێ بکات تا نەتەوەی شەڕفرۆش جبەخانەی ناوکی و چەکی کیمیایی ساز بکات بێ ئەوەی ئەو نەتەوەیەی کە دەبێت بە قوربانی، بنەمای دیلانە بدۆزێتەوە بۆ پەلاماردانی کارگەکانی بەرهەمهێنەری چەکی وێرانکەر.

بەرانبەر عێراق ئەم کردارە هیچ پێویستی بە پارانەوە و لالانەوە نییە. لە هەمووی گرنگ تر، پەلاماردانی عێراق، بەبێ کەم و زیاد جێ بەجێ کردنی دەقی بڕیارەکانی یەککالایی نەتەوە یەکگرتووەکانە، کە سەدام پشت گوێی دەخات، یان پێشێلی دەکات. لەم رووەوە داگیرکردنی عێراق، زیاتر پەیڕەوکردنی یاسای نێودەوڵەتیە وەك لە پووچکردنەوەی.

کارێکی سروشتییە، پێوەری گرنگی یاسای نێودەوڵەتی، دەبێ بگاتە ئاستی جێ بەجێ کردن لە لایەن دەوڵەتەوە. لەوساوە کە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان پەسەند کراوە، گەلێك دەوڵەت دەستی داوەتە کاری پەلاماری دەستبەجێ. وڵاتە یەکگرتووەکان لەمانە کەمتر نەبووە. مەسەلەیەك هەیە کە بە تایبەتمەندی سەرنجی خەڵکانی خاوەن پەیوەندیان ڕاکێشاوە، لە ناویشیاندا سەرۆك، لە ساڵی ( ١٩٦٢ )دا، لە کاتی قەیرانی مووشەکەکانی کوبا دا، سەرۆك

ئێف کەنەدی بەجدی نیازی وا بوو بە لێدانی ئاسمانی مووشەکەکانی سۆڤێت لە کوبا تێك بشکێنێ. لە درك کردنی ئەوەی کە چەکی کۆمەڵکوژ، جیاوازی نێوان هەڕەشەی کتوپڕ و تارمایی هەڕەشەی لێ کردووە، کەنەدی دەڵێت:
ئیدی ئێمە لە جیهانێکدا ناژین کە تەنها تەقەی چەکەکان، بە بەرەنگاربوونەوەی مەترسی هەرە گەورەی ئاسایشی نیشتمانیمان حیساب بکرێت. چەکی ناوکی هێندە کاولکەرە و مووشەکی بالستیکی شتێکی ئەوەندە لە بار و خێران کە بە هێزکردنی ئەگەری بە کارهێنانیان یان گۆڕانی کتوپڕی ئامادەباشیان، ڕەنگە زۆر بە روونی بە مەترسی سەر ئاشتی لە قەڵەم بدرێت.
لەم رووەوە داکۆکی بۆش لەسەر خەتەری تازەی تێکەڵ لە توندڕۆی و تەکنەلۆژیەوە خوڵقاوە، سەدای چل ساڵەی لەمەوبەری کەنەدی دەخاتەوە یاد. بوونی خەتەر داوای خۆ ئامادەکردنێکی مەزنتر دەکات بۆ پەنابردنە بەر پەلاماری دەستبەجێ بەرانبەر دوژمنەکان. بەلای هینری کیسنجەرەوە وایە کە: ( لە سەدەی بیست و یەکدا، قوربانی چاوەڕێکراو ناتونێ ئەوەندە چاوەڕێ بکات، هەتا ئامرازی هەڕەشە دەبێت بە پەلاماری دەستبەجێ. وەچەی تەکنەلۆژی- ئایدۆلۆژی سیستمی سەدەی بیست ویەکەمە.
چل ساڵ لەمەوبەر، دوا بە دوای مشتومڕێکی گەرم لە نێوان راوێژکارەکانیدا، سەرۆك ئامۆژگاری لێدانی کاسترۆی ڕەت کردەوە، بەڵام بە شێوەیەکی تر پەلاماری دەستبەجێی هێنایە کایەوە. ئابلۆقەی سەربازی خستە سەر کوبا، بۆ ئەوەی رێگە لە گەیاندنی مووشەکی سۆڤێتی بگرێ. لە کاتێکدا ئەم مووشەکانە بێگومان مەترسیان دەخستە سەر ویلایەتە یەککگرتووەکان، هەڕەشەی پەلاماری دەست بەجێیان لە ئارادا نەبوو. بە هەر حاڵ بۆیە بەم کارە هەستا، چونکە ویستی پێش ئەوەی ئامادە بن، چالاکییەك بکەن.

بیست ساڵێك دواتر، لە گریناداو پەنەما، واشنتون لە ژێر دەسەڵاتی پەلاماری دەستبەجێدا زیاتر هەنگاوی نا. یەکەمیان ئەوە بوو سەرۆك ریگن سەلامەتی قوتابییە ئەمریکییەکانی کۆلێژی پزیشکی لە گرینادا کرد بە بیانوو بۆ ڕوودانی غەزووکردن. لە هەمان کاتیشدا ریگن رایگەیاند کە هۆی سەرەکی هەڵمەتەکەی بۆ ئەوە بوو کە ئەو دوورگەیە لە کاریگەری سۆڤێتی دوور دەخاتەوە. لە کارێکی هاوشێوەدا، سەرۆك بۆش، پاراستنی گیان و سامانی ئەمریکای کرد بە بیانوو بۆ غەزووی پەنەما، بەڵام ئەم ئیدارەیە بە ئاشکرا و ناچاری وتیان ئامانجی راستەقینەی بۆ رێگرتن بوو لە دیکتاتۆرێکی ناجێگیر ( مهزوز ) کە دەست بەسەر پەنەمادا بگرێت و کۆنترۆڵی بکات.

لە هەمووی سەیر تر، کە دێنە سەر باسی رکەبەری دژی رێبازی بۆش، ئەوەمان دێتەوە یاد کە ئیدارەکەی کلینتۆن بۆ یەکەمجار بلاْوکردنەوەی چەکی کۆمەڵکوژی بەستەوە بە کاری پەلاماری دەستبەجێ دژی ئەوانەی بەو کارە هەڵدەستن. لە کانونی یەکەمی( ١٩٩٣ )دا و زیری بەرگری لێس ئەسپین پرۆگرامی دژ بە بلاْوکردنەوەی ئەم جۆرە چەکە و هێرش بەم چەکانەی بۆ بەرهەڵستی هێرشەکانی چەکی کۆمەڵکوژ خستەروو. لە نێوان پێشنیارەکەیدا: ( بۆ بڕینی حەشارگەی کۆنکرێتی ژێرزەمینی و وێرانکردنی جبەخانەکانی کیمیایی و بایۆلۆژی، پێویست بە گەشەدان بە چەکی پەلاماری دەست بەجێ دەکات .) ساڵێکی بەسەرا نەڕۆشت وەزیری نوێ، ویلیام پێری، هاتە جێگەیی و هەڕەشەی پەلاماری دەستبەجێی لە کاولکردنی توانای ناوکی کوریای باکووردا کرد کە لە گەشەکردندا بوو. ئەم دوو هەوڵە، بوون بە بۆچوون بۆ لەناو بردنی سەرهەڵدانی کتوپڕی جبەخانەی چەکی کۆمەڵکوژ و بوونە پێشبینی بۆ رێبازەکەی بۆش، بەڵام تیمەکەی کلینتۆن ئەم پەلامارەی هەنگاوێك زیاتر بردە پێشەوە. ستراتیژناس رۆبەرت کیلبرۆ لە بانگەشەکانیدا دەڵێت: ( پەلاماری دەستبەجێ بۆ چوونەناوەوە،

کە دەبوایە لە ڕوواندا و کۆسۆڤۆ بمانکردایە، کاتێك کە هەڕەشەشیان نەدەکردە سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان یان هاوپەیمانەکانی، حاڵەتی زۆر جدی تر بۆ خستنەگەڕی پەلاماری دەستبەجێ بۆ ڕێ لێگرتن ئەوەیە کاتێ سەدام حوسێن جبەخانەیەکی مووشەکی گەیەنەری چەکی کۆمەڵکوژی دەست دەکەوێت، لە مەودای دەڤەرەکەی و کیشوەرەکانیدا بەکاری دێنێ. ) جیاوازی کردن لە نێوان پەلاماری دەستبەجێ بۆ مەترسی کە هێشتا لە ڕوودانەوە نزیك نییە، گرنگە. لە شوێنێکی وەك هایتی و بۆسنیا و کۆسۆڤۆ، ئیدارەکەی کلینتۆن ئەوەی روون کردەوە کە بەکارهێنانی هێز بۆ بەربەستکردنی ئازاردانی هاوڵاتیانی ئەو نەتەوانە و دراوسێکانیان پێویستە، ئەمە لە کاتێکدا کە هیچ هەڕەشەیەکی بۆ سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان نەبوو. تەنانەت پارتی دیموکرات بە شانازییەوە باسی ئەم هەڵگەڕانەوەیەیان دەکرد لە کاتی پلاتفۆرمی هەڵبژاردنی (٢٠٠٠) دا. ( مامەڵەی بەرەو پێشەوە ) بە واتای ئەوە دێت کە ( ڕوو بە ڕووی کێشەکان ببێتەوە کە هێشتا لە قۆناغی پەرەسەندندان، پێش ئەوەی بگەنە ئاستی قەیران. دەبێ لە نزیکترین شوێنی سەرچاوەی ئەم کێشانەوە بەرەنگاریان بکرێ، لەگەڵ بوونی هێز و سەرچاوەی پاڵدەر، ڕاستەوخۆ دوا بە دوای سەرهەڵدانی ئەم مەترسیانە. سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆفی عەنان، لە کۆتایی ساڵەکانی ( ١٩٩٠ )دا توانی ئاوڕێ بداتەوە و دەستخۆشکەری لە ( تەشەنەکردنی نەریتی ئاوبژی کردن کرد، بە مەبەستی پاراستنی مەدەنییەکان لە مەترسی کۆمەڵکوژی. )

لە ڕێگەی گرنگەکانەوە، ئیدارەی بۆش کەوتۆتە شوێن پێی پێشینەکانی.

( ئەوەی تۆ لەم ئیدارەیەدا ڕەچاوی دەکەیت، سەرهەڵدانی پرنسیپی تازەیە یا جەستەیەکی بیرۆکەکەیە، ناوی بنێ سنوورەکانی سەروەری ) ئەمانە وتەی ریچارد هاس ( کاربەدەستی ئیدارەی بۆش )ە کە لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ نیویۆرکەر دا وتوویەتی.

سەروەری ئەرکی دەوێت. یەکێکیان ئەوەیە خەڵکەکەت قەتلوعام نەکەیت، یەکێکی تریان ئەوەیە بە هیچ شێوەیەك پشتگیری تیرۆریزم نەکەیت. ئەگەر حکومەتێك ئەم ئەرکانەی جێ بەجێ نەکرد و پشتگوێی خست، ئەوە چەند هێمایەکی سەروەری لە دەست دەدات، لەوانە ژیانی سەرفرازی و دەست تێوەرنەدانە لە ناوچەکەی خۆتدا، واتە ئارەزوومەندی سەروەری نییە. حکومەتەکانی تر، لەوانە ماف وڵاتە یەککگرتووەکان دەستێوەردانیان هەیە.

لە دەرەوەی وڵاتە یەککگرتوەکانیشدا پەلاماری دەستبەجێ داردەستێکی تەواو ناسراوە: رەنگە لە هەموویان بەناوبانگتر و-سەرکەوتوو تر- نموونەی بەکارهێنانی لە ساڵی( ١٩٨١ )دا رووی دابێت. کاتێ کە هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی لە کارگەی ناوکی عێراقی ئۆسیراکی دا. هەرچۆنێك بێت، ئەم ئۆپەراسیۆنە لەلایەن نەتەوە یەککگرتووەکانەوە مۆڵەتی پێنەدرا بوو. لە راستیدا نەتەوە یەککگرتووەکان، شان بە شانی ویلایەتە یەککگرتووەکان و بەریتانیا مەحکوم کرا. نیویۆرك تایمز بەم شێوەیە لەم بارەیەوە نووسیبووی: ( هێرشە خێراکەی ئیسرائیل بۆ سەر کارگەی ناوکی کە لە لایەن فەرەنساوە دروستکرا بوو، کارێکی شەڕەنگێزی ناپەسەند و کورت بینە. ) بەڵام ئەمە کارێکی سروشتییە لە ژێری و عەدالەتی هێرشەکەی ئیسرائیلی کەم نەکردەوە، ئەگەر بێت و ئیسرائیل کورە ئەتۆمییەکەی ( مفاعل النووی ) کاول نەکردایە، سەدام توانای ناوکی زۆر لە پێش جەنگی کەنداودا بەکار دەهێنا – ئەمە راستییەکە زۆر کەس ئاماژەی پێداوە، لەوانە جێگری سەرۆك دیك چێنی بوو، کە دوا بە دوای جەنگ سوپاسی ئیسرائیلی کرد، ئەمڕۆ سڵاوی ئەم لێدانە دەدەنەوە و کردویانەتە قاڵبە مۆرێك بۆ کاری ئەمریکی. میدیای ئیسرائیلی ئامانجی ئەم بۆردوومانەی وا بە سادەیی وەسف کرد: ( ئێمە لە ژێر هیچ باروودۆخێکدا رێگە بە دوژمن نادەین دژی گەلەکەمان گەشە بە چەکی کۆمەڵکوژ بدات. ) ئەم لۆژیکە، لە چەند وشەیەکی تردا، هاوجووتە، لەم کاتەدا

لەگەڵ بۆچوونی ڕێژەیی ئەمریکادا. بنیامین ناتانیاهو، سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیلی پێشووتر دەڵێت: ( حوکمی مێژوو دەبێ ئەمڕۆ باس لە توانای بڕیاری ئێمە بکات. ئیسرائیل ئەم پەلامارە دەست بەجێیەی بۆیە ئەنجام دا، چونکە سەدام کارێکی تیرۆری تایبەتمەندی دژی ئێمە ئەنجامداوە؟ ئایا ئێمە ئەم کارەمان بە ڕێکەوتن لەگەڵ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتییدا کردووە؟ ئایا ئێمە ئەم کارەمان بە مەرجی قایلبوونی نەتەوە یەکگرتووەکان کردووە؟ نەخێر، ئیسرائیل بە تەنیا بەم کارە هەستاوە، چونکە دەمانزانی سەدام حوسێن خاوەنی چەکی ناوکییە و مانەوەمان دەخاتە مەترسییەوە. ) لە ڕاستیدا ئوسیراك وەك کاری نموونەیی پەلاماری دەستبەجێ ڕەخساوە و لە ڕووی مەترسییدا ئەنجام دراوە، هەرچەندە نزیك ڕوودان نەبووە، بەڵام هەبووە، بێ گوێدانە حەپە حەپی ناڕەزایی نێودەوڵەتی ئەنجام دراوە.

یەکێك لە کارسازییەکانی پەلاماری دەستبەجێ ئەوەیە، بە زۆری لە بەدیل کەمتری تێ دەچێت. کۆندالیزا رایس وتەنی: ( مێژوو پڕە لە نموونەی کاری پشتگوێ خستن کە ئەنجامی کوشندەی دەرهەق بە دنیا لێکەوتۆتەوە. ) دەبێ ئێمە ئاوڕێ بدەینەوە بۆ دواوە و بپرسین چەند دیکتاتۆر بونەتە مەترسی زل و زەبەلاحی ڕووی زەوی و کوشتنی هەزاران، لە ڕاستیدا ملیۆنەها قوربانی بوون، بەڵام چ دەبوو ئەگەر ئێمە لە کات و شوێنی خۆیدا بمان وەستانایە. بەڵام بۆ زۆر کەس پەلاماری دەستبەجێ تابووی( Taboo ) لەسەرە. لە سەرەتاوە ئەمە تەکنیکێکی یەك قۆڵییە بۆ گەلێ کەس، لیبراڵیش ئەم ئیشە ناگاتە ئاستی سیاسەتی دەرەوە.

سیناتۆر دیانا فاینشتاین دەڵێت: ( پێموایە هەر کارێکی ناو عێراق لەو کاتەدا بەبێ پشتگیری هاوپەیمانان و نەتەوە یەکگرتووەکان، بە جووت هەڵەیە و بەهەڵەدا چوونە. توم داشلەر، رابەری زۆرینەی دەستەی پیران لە کاری یەك قۆڵی

که بۆ خۆی هەرگیز پشتگیری ناکات، هۆشیاری دەدات و دەڵێت: ( ئاکامی زۆر زۆر ترسناکی لێ دەکەوێتەوە. ) بۆ داکۆکی کردن لەسەر هەڵوێستی خۆیان دژی ئەم شێوە کردارە، لیبراڵییەکان دەتوانن ئاماژە بە هەستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بدەن. لە دنیای عەرەبەوە، شا عەبدوڵای ئوردن دەڵێت: ( لە هەموو ئەو ساڵانەی کە من تێبینی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیم کردووە، هەموو کەس دەڵێت: ( ئەمە بۆچوونێکی خراپە. ) لە پیشاندانی نەیارانی وڵاتەکەی خۆیدا، راوێژکاری ئەڵمانی، گێرهارد شرۆیدەر بە رەهاییەوە بەڵێن دەدا و دەڵێت: ( ئەڵمانیا لە کاری سەربازی ژێر فەرماندەی ئەمریکا دژی عێراق بەشداری ناکات، چونکە ئێمە زیاتر ئاشتیمان دەوێ، لەمە زیاتر جەنگمان ناوێت. ) لە کەنەدا، سەرۆک وەزیران، جین چرێتین، هیچ پێوستییەکی تایبەت بەدی ناکات، بۆ ئەوەی دوای ئەمریکا بکەوێت. لە جیاتی ئەوە ( دەبێت ئێمە دوای نەتەوە یەککگرتووەکان بکەوین. )

لە ئاستێکی تەسکەوە، پشتگیری کردنی کاری هەمە لایەنە واتایەکی هەیە. ویلایەتە یەککگرتووەکان دەبێ کاری هەمە ئاهەنگی لەگەڵ دەوڵەتانی تردا بکات. ئاوا کارێك: نەك هەر شەرعییەتێکی فراوان بە ئامانجی ئەمریکا دەبەخشێ، بەڵکو ئەم ئامانجانە بە ئاسانتر بە دەست دێنێت. بەڵام ئایا جەختکردنی هەمە لایەنە دەبێ بە مەرجی پێش کرداری ئەمریکا؟ ئایا نابێت هەرگیز ئەمریکا کاری یەك قۆڵی بکات؟

لەم حاڵەتەدا دەشێت ئەم داوایە پێویست نەبێ. سەرۆك بە دووی رەزامەندی نەتەوە یەککگرتووەکان دا دەگەڕا و بە دەنگدانی هەموو ئەندامەکانی ئەنجومەنی ئاسایش رەزامەندی بۆ خستنەگەڕی هەڵمەتێکی تازەی چەککردنی سەدام بە دەست هێنا. سەرەڕای ئەوەش، دیکتاتۆرەکەی عێراق کەتەلۆکێکی چڕ و پڕی بڕیاری یەککالایی نەتەوە یەککگرتوەکانی پێشێل کردووە. ئەمەش لە خۆیدا

بنەمایەکی یاسایی بێ وێنەیە بۆ ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە کاری تەمێکردن هەستێت.

بەڵام ئەگەر نەتەوە یەکگرتووەکان، نەیویستایە ئەم مۆڵەتە دەستپێکەی بە سیاسەتی بۆش ببەخشیایە یان تەنانەت نەیتوانیایە ئەو کارە بکات، کاتێك ویلایەتە یەککگرتووەکان بگەڕایەتەوە، ڕەزامەندی ئەنجومەنی ئاسایشی وەرگرتایەتەوە، زەحمەت دەبوو بۆش بە بێ سابیقە کاری یەك قۆڵی دژی سەدام بکردایە. پاش هەمووی، سەرۆك کلینتۆن، لە چەند بۆنە و هەلێکدا پاڵیدا بە هێزەوە بە بێ قایلکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان. لە هەموو ئەو بۆنانەدا پشتگیری داشلە و هاوەڵە دیمۆکراتەکانی لەپاڵدا بووە. فەرەنسا و ڕوسیاش بۆ نموونە لە ساڵی ( ١٩٩٨ ) دا، جەخت کردنی ئەنجومەنی ئاسایشیان ڕەت کردەوە، بەوەی دەسەڵات بدا بە هێزی سەربازی دژی عێراق کاتێك ئەم وڵاتە ڕێی لە پشکنینی چەکەکانی گرت، لێرەوە ویلایەتە یەککگرتووەکان بە بێ مۆڵەتی تازەی نەتەوە یەککگرتووەکان کاری خۆی کرد. هەر بەو شێوەیەش ویلایەتە یەککگرتووەکان، ساڵێك دوای ئەوە، لە لایەن ئەنجومەنی ئاسایشەوە بەربەست کرا، کاتێك ئەم ئەنجومەنە بڕیاری وەستانی ڕاو و ڕووتی سەربازەکانی لە کۆسۆڤۆ ڕەت کردەوە، وەك شارەزای بەڵقان ڕیچارد هۆلبروك لە تیمەکەی کلینتۆندا دەیگرێتەوە: ( ئەمریکا لە بەردەم هەلێکی سادە دا بوو، یا بە بێ ئەنجومەنی ئاسایش کار بکە یان هەر هیچ مەکە. ) سەر لە نوێ ویلایەتە یەککگرتووەکان کار کردنی بەسەر کار نەکردندا پەسەند کرد. )

هۆی ئەمەش ئاسان بوو، سکرتێری نەتەوە یەککگرتووەکان، بوتروس غالی بوو، هەموو بۆچوونەکانی هەڵە بوون، کاتێ کە دە ساڵێك لەمەوبەر لای وا بوو کە نەتەوە یەکگرتووەکان ( مەزنتر دەبێ وەك لە کۆی کۆکردنەوەی هەموو پارچەکانی. ) ئاخ و داخ چەند کەمتەرخەم و پاسیڤ بوو لە کاتی قسە بایخەکانی بۆسنیا و

رواندا، کەچی چەند بە هەموار و لێبوردە بوو لە ئاستێکدا کە سەدام بڕیارەکانی ئەم دەزگەیەی پێشێل دەکرد، ئەوەندەش لە کۆی پارچەکانی خۆی بچوکتر دەردەخست. یان هەروەك باڵیۆزێکی پێشوی بەریتانی نەتەوە یەککگرتووەکان وتی: ( دەستورەکە هیچی نییە، بەڵام ئەندامەکانی هیچ ناکەن. )

ئەمە زۆر نەشازە کە نەتەوە یەککگرتووەکان بە دەسەڵاتێکی رەوشت بەرزتر وەك لە ویلایەتە یەککگرتووەکان رەچاو بکەیت. بە هەر حاڵێك بێت نەتەوە یەککگرتووەکان کۆکەرەوەیەکی دەوڵەتانی سەروەری دارن. ئەم رێکخراوە هیچ جیاوازییەك ناکات لەسەر بنەمای سیستەمی سیاسی، لێرەوە چەوسێنەر و دیمۆکرات وەك یەك بە خێرهاتنیان لێ دەکرێت. زیاتر لەوەی نەتەوە یەککگرتووەکان خۆی ئەم دەزگەیە بگۆڕێ، کەچی چەوسێنەرەکان زیاتر کردوویانە بە مەیدانی پروپاگەندە بۆ گازندەکانیان و شوێن کەوتنی ئەجێندەکانی خۆیان. لە سەرو ئەمانەشەوە، لە مەسەلەی جەنگ و ئاشتیدا، ئەو ئەندامانەی نەتەوە یەککگرتووەکان کە حسابیان بۆ دەکرێت، هەمان ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشن. لە نێوان ئەندامە هەمیشەییەکانی وەك چین و روسیا وفەرەنسا و بەریتانیا و ویلایەتە یەککگرتووەکاندا هەر تەنها سیانیان بە تەواوی دیمۆکراتین، تەنانەت نەتەوە یەککگرتووەکان بۆ مەبەستی جیۆپۆلیتیکی خۆیان بە کاردێنن. بۆ نموونە، لە حاڵەتی فەرەنسادا، ئەو مەبەستانە تۆسقاڵێك زیاترە لە تەگەرەدان بە رووی ئەمریکا دا، مومارەسەی هیپۆکراسی* و رکەبەرییە شان بە شانی یەك، لە راستیدا کاتێك کە جاك شیراکی سەرۆك وەزیران، باسی قودسییەتی دەسەڵاتی نەتەوە یەککگرتووەکان لە بابەت هەڵگیرسانی شەڕەوە دەکات، واشنتۆن پۆست لە کاتی مشتومڕی پشکنینی چەکە مرۆڤ کوژەکاندا رووونی کردەوە کە نزیکەی (١٠٠٠)

* هیپۆکراسی: واتا دوو رووی یان ( نیفاق )

سەربازی فەرەسی، لەلای خۆیانەوە لە وڵاتی ساحلی عاج بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا کاری دەستێوەردان دەکەن. )

لە ئاستی عێراقدا ئەم مەسەلەیە دوو قاتە، لە وێوە چەند وڵاتێك، هەریەکە بە هۆی هۆکاری تایبەتمەندی خۆیەوە لە روو بە رووی شەیتان دا خاوەن هەڵوێست نەبوون. فەرید زەکەریا لە تێبینییەکەی نویزویکدا دەڵێت: ( فەرەنسا و روسیا، نەتەوە یەکگرتووەکانیان کردووە بە شانۆیەك، لە وێوە بە رووت و قووتی بەرژەوەندی خۆیان دەخەنە بەرچاو. کاری هاوقۆڵیان وەك وەسیلە لە چەسپاندنی سیاسەتی یەك لایەنەی خۆیان بەکار هێناوە. روسیا بە پێی وتەی ئەلیکساندەر سوڵتانۆڤ جێگری وەزیری دەرەوە، روسیا بەرژەوەندییەکی ماددی لە مانەوەی سەدامدا هەیە، چونکە لەم ساڵانەی دوایدا بایی بلیۆنەها دۆلار قۆنتەراتی لەگەڵ عێراقدا کردووە. چین کە بەردەوام سکاڵای پێشێلکردنی سەروەری عێراق لە لایەن ئەمریکاوە دەکات. چەند ساڵێکە خۆی لکاندووە ( بۆ نموونە لە کۆسۆڤۆ ) بە مشتومڕێکەوە کە هەر خزمەتی خۆی دەکات و دەڵێت: میللەتێك دەبێ لە ناو سنووری خۆیدا چی بەلاوە پەسەندە ئەوە بکات. کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەکان ئەمریکای لە هێرشکردنە سەر عێراق هۆشیار کردەوە کە گوایە ( دەرگەکانی دۆزەخ لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا والاّ دەکات. ) وڵاتە عەرەبییەکانیش ترسی پەرەسەندنی رکەبەری جەماوەریان هەبوو — زیاتر لەوەش دەترسان کە حکومەتەکانی تری دەڤەرەکەش بکەونە بەر هەرەشە، ئەو حکومەتانەی کە هیچیان بە شێوازی دیموکراتی نەهاتونەتە سەر حوکم. سەبارەت بە ئەوروپییەکانیش، ئەوانەی کە بەشێك لە جبەخانەکانی سەدامیان پۆشتە کردبوو ( فەرەنسا تەکنەلۆژیای ناوکی دەداتێ، ئەڵمانیا پێکهاتەکانی کیمیایی بۆ دەنارد) وا دەردەکەوتن بە پەرۆشی ئەوەوە بوون بەقەوانەکەی فەرەنسادا فوو بکەن بۆ قەبەکردنی هێزی ئەمریکا، نەك وەستان دژی نەگریسەکەی عێراق.

کاتێك کە ئەوروپییەکان لەسەر ئەوە داکۆك بوون کە گوایە بەرهەڵستی لەسەر هاوبۆچوونی ( کۆمەڵگەی جیهانی ) دەکەن، کەچی خۆیان شێوەیەکی دەسەڵاتی سیاسییان دەخستەکار کە بەرگی رەوشتی نێودەوڵەتیان لەبەرکرد بوو کە تەنها هەر لای نەتەوە یەککگرتوەکان دەتوانن بە لێهاتویی نفوزیان بەکاربهێنن، کە هەموو کاتێك وەك تاکە نەتەوە بەکاریان هێناوە. لێرەدا زۆر ئاشکرایە کە هێرشێکی ئەمریکا بۆ سەر عێراق چەند لەو دەسەڵاتە کەم دەکاتەوە، بەڵام لە جیاتی ئەوەی بە تەنها خوو بدەنە رەخنە گرتن لە ( هیگۆمۆنی * ) ئەمریکا، ئەوروپییەکان دەیانتوانی کە بودجەی بەرگری گەشە پێ بدەن و دەستێکی باڵاشیان هەبێ لە دابینکردنی ئاسودەگی جیهاندا. لە جیاتی ئەوە پارەکەیان لە پرۆگرامی کۆمەڵایەتیدا خەرج دەکرد و چاوەرێی ئەمریکا بوون ئاسایشیان زامن بکات. ئەمجا ئەمریکای ئامۆزایان بەوە مەحکوم بکەن کە زۆر شەڕەنگێزە و خولیای پێکهێنانی رێکەوتنێکی نێودەوڵەتییە بۆ کارکردن دژی عێراق، لە هەمان کاتدا وەسیلە و چەمکەکانیش چەواشە دەکات. هاوپەیمانییەك ئەوەندە بەرفراوان بێت کە ئاوا هاوپەیمانی بکات شیاوی بوون نییە. چونکە وڵاتانی جیاواز، هەستیاری جیاواز و داواکاری جیاواز دەخەنە رووی پرۆژەی هاوقۆڵی، ئەوەندەی هاوپەیمانەکەش فراوان بێ، ئەوەندەش ئازادی مانۆری و جموجوڵی ئەمریکا بەر تەسك دەبێ کە لە پێناو چیدا ئێمە قوربانی بدەین بەم ئازادیە؟ ئایا ئەم ئازادییە بۆ ئەوە بێت کە فەرنسا بەردەوام بێت لە بزنسی خۆی لەگەڵ سەدام دا؟ یان بۆ ئەوە بێت کە سەدام بتوانێ قەرزەکانی روسیا بداتەوە؟ چونکە عەرەبی سعودی دەترسێ دیموکراسی لەسنوورەکەیدا پەیدا ببێ؟ یان بۆ ئەوەی سوریا و وڵاتە دیکتاتۆرەکانی تر ڤیتۆ بخەنە سەر کایەی ئەمریکا؟

---

* هیگممنی: واتا زاڵبوون ( الهیمنە ) وەرگێڕ

ده ساڵێك لەمەو پێش ئیدارەی بۆشی یەکەم هاوپەیمانییەکی فرە لایەنی لە پێناو جەنگی دژ بە عێراقدا کۆکردەوە - بەڵام لەپاڵ ئەمەشدا خۆی چەکی بڕیاری یەك قۆڵی هەڵگرت بوو ( هاوپەیمانان بیانەوێ و نەیانەوێ ) ئەو کاری خۆی دەکرد. ئەگەر ئەمە بە بەراورد بکەین لەگەڵ هەوڵدانی کلینتۆن لە ساڵی ( ١٩٩٣ ) دا، لە کۆکردنەوەی هاوپەیمانییەك بۆ کارکردن لە بۆسنیا، ئەوا دەبینین کە ئەوە هاوپەیمانییەکی ئەوەندە لاواز بوو کە لەباتی ئەوەی خۆی پێشڕەویان بکات، هاوپەیمانەکان خۆیان پێشڕەوی ئەویان کرد. وارن کریستۆفەری نارد بۆ راوێژکار کردن لەگەڵ ئەم هاوپەیمانە ئەوروپییانەدا، هەر ئەوەندەی ئەمان پشتگیری خۆیان ڕەت کردەوە، کلینتۆنیش چاوی بەرانبەر قەتڵوعامە بەردەوامەکەی بۆسنیا نوقاند.

بۆ زۆربەی زۆری ئەوانەی حەز لە بەشدار بوونی کاری فرەلایەنی دەکەن، ئاوا پاشەکشێی بابەتی هەرە دروستیانە. پەسەند کردنی فرە لایەنی بەلای ئەوانەوە بە دەنگەوە چوونی کۆمەڵە پێویستییەکە، بەڵام هیچ لەمانە فریان بەسەر ئاسایشی نیشتمانییەوە نییە. پەنا بردنەبەر دەسەڵاتی رێکخراوەکانی وەك نەتەوە یەککگرتووەکان دڵدانەوە وحەوانەوەیەکە بۆ هۆشیاری ئەو کەسانەی کە خۆیان لە کاری سەربازی دەدزنەوە و ناچاریشن کە ( شتێ بکەن ). ئەمە شایەت حاڵە بۆ چاکی و نییەت پاکییان. ئەمە دڵنیاییەك دەبەخشێ بە دەسەڵاتی سەربازی ئەمریکی کە خۆیان بەشکن لێی، نەك هەر خزمەتی بەرژەوەندی نیشتمانی، بەڵکو خزمەتی هەموو مرۆڤایەتیش دەکات. لە هەمووی باشتر، شێوە حاڵەتی ئەو بۆچوونەیە کە بەلایەوە فرە لایەنی دەتوانێ رێ لە بەکارهێنانی هێز بگرێ، ئەمیش وەك لە حاڵەتی عێراقدا، کە گەلێ لە لیبراڵەکان دەیانەوێ بیگرنە بەر.

گەلێك چەپڕۆ، حساباتێکی ئەوتۆیان لە بەراوردکردنی عێراقی سەدام حوسێن و ئەمریکای جۆرج بۆشدا هێناوەتە کایە، کە گوایە ئەمریکا مەترسییەکی گەورەتر دەسەپێنێت بەسەر سیستمی جیهاندا.

وەك لە وشەکانی سەلمان روشدی* دا هاتووە: ( کەم نین ئەو لیبڕالانەی کە هەڵەی ئەوەیان کردووە و ئەوەندە بە پەرۆش بوون بۆ دژیایەتی بۆش، دەیان خاتەپشتگیری کردنی سەدام حوسێنەوە ). هاندەرەکە هێشتا تازە نییە. لە کاتی جەنگی کۆسۆڤۆ دا، دێڤید ریف نوسەری لیبڕاڵی لە رەخنەیەکی راشکاویدا دەڵێ: ( سەرنجراکێشانی خەیاڵی نەهلیزم ( ئینکاری تۆباوی ) لای چەپ وایان بەلاوە باشە کە جینۆساید ببینن، لەگەڵ شار بەدەرکردنی بە کۆمەڵی کۆسۆڤۆییەکاندان نەك تۆسقاڵە بەهێزبوونێکی دەسەڵاتی هێگیمۆنی ویلایەتە یەککگرتووەکان. لێرەوە وتارنووسی لێکۆڵینەوە ئاوا وەسفی ئەم خاوەن مێشکانە دەکات: ( لە جیاتی ئینتەرناسیۆنالیزم، ئێمە ئێستە لە ناو چەپڕۆکاندا جۆرێك لە (هەست نەبزوێن) و(میانڕۆ) و( (دوورە پەرێزگری) دەدۆزینەوە. )

ئەگەر مەبەست کەنارخستنی دەسەڵاتی ئەمریکایی بێت بۆ رێگرتن لە کۆدەنگی گشتی جیهانی، ئەوافرە لایەنی لەلایەن نەتەوە یەککگرتووەکانەوە گەمارۆ دراوە و لە رووی تیۆرییەوە دەبێتە هۆی گۆشەگیری لە حاڵەتی پراکتیك دا. نەك وەك گۆشەگیری خۆماڵی ساڵانی (١٩٣٠) کە داکۆك بوون لەسەر ئەوەی ئەمریکا زیاد لە پێویست بۆ جیهان باشە، فرەلایەن خوازەکانی ئەمڕۆ بە لایانەوە وایە کە

---

* روشدی ئەو نوسەرە هیندییەیە کە کتێبی " ئایات شەیتانیە" ی نووسیوە وسوکایەتی بە خێزانی پێغەمبەری ئیسلام کردووە. ئێستا لە بەریتانیا دەژی.

جیهان زیاد لە پێویست بۆ ئەمریکا باشە. ئەمەش تەنها لە میانەی کەوتنە تۆڕی زەبری نێودەوڵەتییەوە ئەمریکای هاندەری کاول کردن، دەوەستێنرێت.

بۆ نموونە پرۆفیسۆری زانکۆی هارڤارد ستانلی هۆفمان، وای بە لاوە باشە کە لە حاڵەتی عێراقدا هاوپەیمانی دەبێتە ( سەرچاوەی بنیادنەری بەربەست کردن ). لە کورتکردنەوەی لۆژیکی مشتومڕی هوفماندا، رۆژنامەنووس، چارلس کراوتامەر دەڵێت: ( فرە لایەنخوازی گۆشەگیری ئینتەرناسیۆنالیستە. ) هاندەر لە درێژکردنەوەی ئەو گومان لێکردنەوە دێ کە بەرژەوەندی خودی ئەمریکا و بەرژەوەندی مرۆڤایەتی بە تەبیعەت لە مەنجەڵێکدا ناکوڵێن.

بۆ ئەم جۆرە رەخنەگرانە، کارکردنی هەمە ئاهەنگی لەگەڵ، یان لە جیاتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی – یان بە داکۆکیەوە بەرهەڵستی لە خۆکردن وەك حاڵەتی ئەفغانستان– لە تاقیکردنەوەی چاکخوازیدا سەرکەوتوو دەبێ. بەڵام کارکردن دژی عێراق لەگەڵ هیچ لەم پێوەرانەدا ناشێ. جیاوازی گەوهەری نێوان دەزگەکانی دیمۆکراتی سەر بە دەست تێوەردان لە کۆسۆڤۆ و بۆسنیا زۆر دیمۆکراتی ئینتەرناسیۆنالیستی وەك ویل مارشاڵ ئاڵوز دەکات ( ئایا ئەوانە خۆیان لە عەبای بێ لایەنییەوە ئاڵاند بوو کاتێك کە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە عێراقدا راستەوخۆ کەوتبووە ژێر مەترسییەوە. ) ئەمە بۆ زۆر کەس، کاری دەستێوەردان شتێکە کە ناکرێ. ئەنتۆنی لویس، مایکل واڵزەر و نووسەرانی تر کە نەیاری بەکارهێنانی هێز بوون لە دژی عێراق، بە دەنگی بەرزەوە پشتگیری هەوڵی ویلاتەیە یەکگرتووەکانیان دەکرد لە کۆسۆڤۆ، چونکە وەك واڵزەر بە بەڵگەوە تێبینی کردووە ( بە روونی، ئاسایشی نیشتمانی ویلاتەیە یەکگرتووەکان لە مەترسیدایە. ) و لە کاتێکدا کە گەلێك راستڕۆ نەیانویست پشتگیری هەڵمەتی ئاسمانی بکەن لە بەڵقان، چونکە لە راستیدا بێ کارامە بوون لە ئاستی

بەرژەوەندی نیشتمانیدا، جەخت کردنەوەی لیبڕاڵی دیمۆکرات بە وردی لەسەر بنەمای ئەوە بوو کە ئەم بەرژەوەندیە و جودی نییە.

لێرەدا سروشتیە کە مشتومڕێکی چڕ و پڕی رەوشتی و مرۆیی هەیە، لە رووی گۆڕینی رژێمی عێراقیەوە. تۆ دەتوانی جارێك متمانەیان پێ بکەیت بۆ پێشکەشکردنی مشتومڕی رەوشتی، بەڵام زۆر بەدەگمەن دەبینی باسی ئەمە بکەن. گاڵتەجاڕی لە وەدایە، لە گونجاوی بەهێزبوونی وشیاری رەوشتی نێوان نەیارانی کارکردن لەلایەن چەپ و راستەوە دەگاتە ئاستی رەوشتی خۆ دزینەوە. دوای ئەمانە هەموو شتێك بە ناوی خواستی لابردنی دیکتاتۆرێك بێت، کە خەڵکەکەی خۆی کیمیاباران کردبێ، دراوسێکانی داگیر کردبێ، گەشەی بە چەکی کۆمەڵکوژ دابێت و کاتەلۆگی چڕ و پڕی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکانی پێشێل کردبێ، چۆن وەك نیوڕیپەبلیك لەسەر وتاریدا دەڵێت: ( پرسیاری گرنگ ئەوە نییە ئایا وڵاتانی تر لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هاوڕا و هاوبۆچوونن، گرنگ ئەوەیە ئەو وڵاتانە لە حاڵەتی عێراقدا راستن؟ نەخێر راست نین.

## بەشی هەشتەم

## لە ( ئیحتیوا )وە بۆ گۆڕینی ڕژێم

## From Containment to Regime Change

پرنسیپی دووەمی فەرمایشتەکەی بۆش گۆڕینی ڕژێمە، ئەمە لەوەوەیە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان ناتوانێت بە ئاشتی لەگەڵ ئەو حکومەتانەدا گوزەران بکات، کە بەدووی پەرەپێدانی چەکی کۆمەڵکوژەوەن و دراوسێکانیان دەخەنە ژێر مەترسییەوە و ئەشکەنجەی خەڵکانی خۆیان دەدەن. فەرمایشتەکەی بۆش مافی نەتەوە بۆ خۆی دەپارێزێت، کە چ بە رێگەی دیبلۆماسی یان سەربازی ئەو رژێمانە لەناوبەرێت.

لەحاڵەتی پەلاماری دەست بەجێدا، رەخنەگرانی گۆڕینی رژێم، ئەم تاکتیکەیان بە بەڵگەی ( یەك لایەنی )، ( ئیمپریالی ) و ( لەخۆبایی بوون ) دانا بوو، بەڵام ئایا لابردنی زاڵمێکی پڕ چەکی ناوکی ئەوەندە هەڵەیەکی گەورەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بەندە بەم خاڵانەوە: بەوەوە کە فەرمایشتەکەی بۆش بەلایەوە گۆڕینی رژێم تایبەتمەندییەکی دیموکراتی لیبراڵە. بە شێوەیەك کە ستراتیژی ئاسایشی نیشتمانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکاتە هاوبەشی لێهاتوو ( بۆ پاراستنی

کەرامەتی مرۆڤ، بەرەنگاری ئەوانە دەکات کە پێشێلی دەکەن. ) ئەم پاراستنەش بە خوڵقاندنی هاوسەنگی هێزێك دێت کە خوازیاری سەربەستی مرۆڤ بێت. بارودۆخێك بخوڵقێنێ کە تێیدا هەموو نەتەوەیەك و کۆمەڵگەیەك بتوانن خۆیان بۆ خۆیان هەموو ئەرك و پاداشتەکانی ئازادی سیاسی و ئابووری هەڵبژێرن. ) بەدیهێنانی دیموکراتی لە عێراقدا ئامانجی سەرەکی ئیدارەکەی بۆشە لە هەڵمەتی دژ بە سەدامدا. سەرۆك لە وتارەکەی شاری سینسیناتی وتی: ( سەربەخۆیی گەلی عێراق مەسەلەیەکی رەوشتییە و ئامانجێکی مەزنی ستراتیژی ئێمەیە. ) بۆچی ئامانجێکی ستراتیژییە؟ بە پێی وەسفی بۆش ( کۆمەڵگەی ئازاد، بە چەوساندنەوە و هەڕەشە، دەستەمۆ نابن، کۆمەڵگە کراوەکان جیهان ناخەنە بەر مەترسی ڕەشەکوژییەوە. ) ئەوە سەلمێنراوە.

راستیشە. سروشتیە کە زۆر کەم خاوەن ڕا بە روونی لایەنگری سەدام حوسین دەکەن، یان تەنانەت پرسیاری گۆڕینی ڕژێم لە عێراقدا دەکەن، بەڵام گومانکەران تەحەدای ئەوە دەکەن کە لابردنی سەدام بێتەدی. بە گەڕانەوە بۆ بۆچوونەکانی رەخنەگرانی بۆش — بەر لە گەردەلوولی بیابان — بە تایبەتی رەخنەگرانی سەر بە ( واقعی تەسك ) کە دەیانووت: جەنگی عێراق، لەوانەیە هەموو دەڤەرەکە نائارام بکات. کۆلین پاوڵ، دە ساڵێك لەمەوبەر لە بەئاگاهێنانێکی وادا وتی: ( لەتوپەتکردنی عێراق بۆ کیاناتی سیاسی سوننە و کورد و شیعە نابێتە هۆی ئەو ئارامییەی کە ئێمە لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا بە ئاواتیەوەین. ) پاراستنی یەکیەتی عێراق لەوە باشترە کە روو بە رووی نائارامی ببینەوە، ئەم مشتومڕە هەر ئاوا دەڕوات، تەنانەت ئەگەر تەنها دەرمان و بەدیلیش نەبێت. سکاوکروفت، لە رووی وریاکردنەوەوە دەڵێت: ( ئەگەر هێرش بکرێتە سەر عێراق، ئاکامەکانی هەموو ناوچەکە دەگرێتەوە و هەستی دژایەتی ئەمریکا دەخوڵقێنێت، ئاژاوە دەخاتە گرنگترین ناوچەی جیهانەوە. لۆرانس ئیگلبیرگەر، هاوەڵی سکاوکروفت لە

ئیدارەکەی بۆشدا لە هەمان ڕووەوە ترسی ئەوەی لێنیشتووە کە ئەمریکا ڕوو بە ڕووی ئەم هەموو ئاکامانە، دوای پەلاماردان ببێتەوە! ) دوا ڕۆژی نائاشکرای عێراق یان مانەوەی ڕژێمی توتالیتاری بوو بوو بە کێشەی بەشی زۆری واقعیەکان. سیناتۆر چەك هاکلْ دەپرسێ و حەز دەکات بزانێت: ( چی ڕوو دەدات دوای داگیرکردنی عێراق؟ کێ حکومی عێراق دەکات؟ ئایا ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ڕاستی دەیەوێت لە بەغدا ببێت بە پۆلیسی ئەو وڵاتە بۆ بیست تا سی ساڵێك؟

لەپاش ئەم بۆسە بە دەست چنراوەوە، هەمان واقعییەکان کاردەکەن کە دە ساڵێك لەمەوبەر بە هەمان شێوەی ( مێتەرنیخی ) دەیانووت: ( ئێمە نابێت ڕەوتی عێراق تێك بدەین و نابێت سەقامگیری لەناو بەرین. ) بۆ ئەوانەی وەك سکاوکروفت سەر بە سیاسەتی واقعی بوون، پەسەند کردنی ڕاگرتنی نیزام بەسەر ئازادیدا لە هەر شوێنێك بێت – لە یەکیەتی سۆڤێت بێت یان لە چین یان لە یۆگۆسلافیا – کارێکی تازە نییە، بەڵام مەیلی چەواشە کردنی ئارامگیری جیهانی و درێژەدان بە مانەوەی دیکتاتۆرەکانی دژ بە ئەمریکا، بە پوختی لە کێشەی عێراق دەکەوێتە بەرچاو. ئایا ئینکاری کردن لەوە دەکرێت کە سەدام حوسێن کاردانەوەی بۆ سەر ئەورووپا نییە؟ ڕژێمی سەدام حوسێن دیکتاتۆرێکی دڕندەیە کە بەهۆی دەست درێژی دەرەوە و قەتڵوعامی ناوخۆوە هەمان ئەو نائارامییەی هێناوەتە کایەوە کە گوایە سکاوکروفت و هاوبیرەکانی لێی دەترسن. ئێمە لەمێژە ئەوە ڕەچاو دەکەین کە پارچە پارچە بوونی عێراق لەمانەوەی حوکمی سەدام شوومترە و ئەگەری ئەوەش هەیە کە دوای ئەو، خراپتریش ڕوو بدات، بەڵام چۆن چاوەڕێی ئەوە دەکرێت کە لەگەڵ باری ئێستەی عێراقدا گوزەران بکرێت، دژی لۆژیکە گەر بتەوێت حکومەتێك بپارێزیت کە خەڵکەکەی خوازیاری لەناوچوونی بن بە تایبەتی دوور لە نائارامی دەڤەرەکە. لابردنی سەدام حوسێن لە دوا ڕۆژدا ڕێگە بە خوڵقاندنی ئارامگیرییەکی مەزنتر دەخوڵقێنێت، واتە مەسەلەکە مەسەلەی کاتە.

بە هەرحاڵ پاوڵ و خەڵکانی تر، مشتومڕی ئەوەیانە ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان حوکمی مەرکەزی سوونەی عێراق بگۆڕێت، ئەوا ئاژاوە لەناو وڵاتدا دەخاتە روو. ( پاوڵ هەمان خاڵی لە کاتی جەنگی ئەفغانستاندا ورووژاند، لەدوایشدا وا دەرکەوت بە هەڵەدا چووە و رژێمی پەشتوو کە حکومەتی تاڵیبانی بەڕێوەدەبرد لەناو براو و ئاژاوە ڕووی نەدا. ) بەڵام ورووژاندنی کێشەی ئەتنی لە عێراقدا، جێی پرسیاری زۆرترە وەك لە ئەفغانستان. جیاواز لە تاڵیبان سەدام پشگیری کەمە لەناو گروپە ئەتنیەکاندا، تەنانەت لەناو سوننەکاندا و ئۆپۆزسیۆنی عێراقیش لە خۆیدا فرە ئەتنیکیە. ئەوەی کوردەکانی ناچاری شۆڕشی ئاشکرا کرد، هەمان بە ئاگا هاتنەوەی نەتەوەی عێراقە کە زۆر بە سادەیی، بە سەدان هەزار لە رۆڵەکانی لەلایەن حکومەتی عێراقەوە قەتڵوعام دەکران. عێراق پێش سەدام حوسین، حکومەتی فرە ئەتنی مەزهەبی هەبوو و هەروەك شارەزای بارودۆخی عێراق، فێبە مار ئاماژەی پێداوە: ( زۆربەی زۆری دنیشتوانی عێراق جگە کەمێك لە کوردەکان، بە داکۆکییەوە سوورن لەسەر یەکیەتی دەوڵەت و چەشتنی سامانی عێراق. ) لە باسی دیراسەیەکدا، بەڕێوەبەری جێبەجێکردنی دەزگەی عێراق، ( رند رحیم فڕانکە ) دەڵێت: ( لای ئێمە جەنگی ئەهلی روو نادات، ئەمە دژی مێژووی عێراقە، وڵاتی ئێمە پێکدادانی تایەفەگەری وەك یۆگسلافیا و ئەفغانستان بەخۆیەوە نابینێت. کوردەکان بێ کەموکوڕی خولیای مانەوەیان لەناو عێراقدا هەیە، شیعەش دوور لە خۆکێشانەوە، خۆیان بە نیشتمان پەروەری بە ئارامی عێراق دەزانن. )

ئەوەی کە لەوەدەچێت مشتومڕی لەسەر بێت، ئامانجی یەکبوونی عێراقە، لەوانە دژ بە ئامانجی ئارامگیری عێراق رادەوەستێ. مایکل ماندێلا باوم لە زانکۆی جونز هۆپکیزەوە، وای بە باش زانیوە کە ( رێگەچارەی پێکەوە ژیانی ناوچەکانی عێراق بە لامەکەزی دەستەڵاتی حوکمڕانی لە عێراقدا دێتەدی. یان زۆر بە وردی بە شێوەی حوکمی فیدراسۆن دەبێت. ) ئەم رامانە بێ پێشینە نەبووە لە عێراقدا. پێش

ئازادی بەغدا لە حوکمی بەریتانی، سیاسەتمەدارە ناسراوەکانی عێراق جەختیان لەسەر ئەم بیرۆکەیە دەکرد. هەرچۆنێك بێت حکومەتی مەرکەزی بەغدا هەموو نوێڵەکانی دەستەلآت لای خۆی دادەنێت، بەلآم هەر کۆمەڵە ئەتنیەك دەبێتە خاوەن دەستەلآتێکی سنووردار بۆ حوکمی خۆی و بە دڵنیاییەوە ئازاد دەبن بە زمانی خۆیان قسە بکەن، ئاهەنگی ترادسیونی بگێڕن و ئەرکی ئایینی خۆیان بەجێبهێنن.

لەوە گرنگتر ئەوەیە کە چۆن عێراقی دوای سەدام هارمۆنی دەبێت؟ ئەرکی بەشداربوونی ویلایەتە یەککگرتووەکانە بۆ بەدیهێنانی رۆڵێکی مەزن لەم ولآتەدا. ئەم ئەرکە ئاسانتر دەبێت، ئەگەر خەزنەی نەوتی عێراق رەچاو بکرێت. لەو ساتەی نەوت دەکەوێتەوە سەر رەوتی خۆی، زەحمەتی بنیادنانەوەی عێراق بە بەرچاویەوە سووکتر دەبێت. لە هەمووشی باشتر، ئەگەری ئەوە هەیە کە ولآتەکانی کەنداو و کڕیارە سەرەکییەکانی نەوتی عێراق لە ئاسیا و ئەورووپا پارە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان دەکەن هەر ئەم سامانە دەبێتە هۆیەکی پتەو بۆ پێکەوەمانەوەی گروپە ئەتنییەکان و وەفا دەربڕین بۆ دەوڵەتەکەیان.

رەنگە وا پێویست بکات ئەمریکا بۆ ماوەیەك عێراق داگیر بکات، هەرچەندە وەك چۆن لە ئەفغانستان هێزەکانی نەتەوە یەککگرتووەکان و ئەورووپییەکان و عەرەبەکان بەشداریان کرد لە عێراقیش بیکەن، بەلآم بەرپرسیارێتی سەرەکی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو ولآتەی بەغدا رزگار دەکات. بە پێی خەمڵاندنێکی سەرەتایی، پێویستی بە ٧٥٠٠٠ سەربازی ئەمریکی دەبێت کە وەك پۆلیس دوای جەنگ ئەرکی خۆیان ببینن و ساڵی ١٦ بلیۆن دۆلاری تێدەچێت . کاتێ هێزی ولآتانی تر دەگات و کاتێك عێراق لە رووی سیاسی و ئابوورییەوە لەسەر پێی خۆی دەوەستێت، لەوانەیە سەربازەکانی ئەمریکا لە ساڵێکدا یان لە دوو ساڵدا بۆ چەند هەزارێك کەم بکرێتەوە. پاش بەزاندنی سەدام حوسێن و داگیرکردنی عێراق، دامەزراندنی حکومەتێکی دیموکراتی لێهاتوو لە بەغدا دەبێتە ئەرکی سەرشانی

ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵام ئەمە بۆچوونی هەندێ لە واقعییەکان نییە. ستوون نووسی تایم، مایکل ئیلیوت دەڵێت: ( سەرۆك بۆ ئەو رۆژە دەگەڕێ، کاتێك کە جەنگی عێراق ببێتە هاوئاهەنگی ئەفغانستانی دیمۆکرات و فەلەستینی دیمۆکرات و ئیلهامی چاکسازی لە جیهانی ئیسلامییەوە وەرگرن، بەڵام هێشتا کێشەیەك لە خەونەکەی سەرۆکدا هەیە: ( ئەوەیە ئەم شێوە حکومەتە دەبێت لە دەرەوە بسەپێنرێت بەسەریاندا. ) لە هەمان شێوە بۆچوونەوە، توێژەرەوەی رۆژهەڵاتی ناوەراست شبلی تەلحن لە پەیمانگەی برووکینگ لە نیویۆرك تایمزدا نووسیویەتی: ( دیمۆکراتی لە دەرەوە  بە هێزی سەربازی ناسەپێنرێت، ئەگەر بێت و هێزی سەربازیش سەرکەوتوو بن لە لابردنی دیکتاتۆرە دژ بە دیمۆکراتییەکان دا. )

ئەرێ بە راستە؟ ئەی ژاپۆن، ئەڵمانیا، نەمسا، ئیتالیا، گرینادا، کۆماری دۆمەنیکان و پەنەما کێ کردنی بە خاوەنی دیمۆکراتی؟ ئەمانە هێشتا کەمێکن لەو نەتەوانەی کە لە سەرەتاوە سیستەمە دیمۆکراتەکانیان بە هێزی سوپای ئەمریکا سەپێنرا. لەمەش زیاتر، عێراق لە هەموو نەتەوەکانی دەورووبەری زیاتر ئەگەری بە دیمۆکراتی بوونی هەیە. بۆ بەڵگە رەنگە کەس پێویستی بە نموونەی باکوری عێراق باشتر نەبێت، کە لە ژێر ڕکێفی هێزی ئاسمانی ئەمریکادا، ئۆپۆزسیۆنی عێراق بوونەتە خاوەنی دیمۆکراتی دڵتەزێن. عێراق خاوەنی رێژەیەکی بەرزی خوێندەوارییە لە ناوچەکەدا، خاوەنی چینێکی مەدەنییە، ئەمانە شان بە شانی پێوەرە دیمۆگرافییەکانن کە تایبەتن بە دیمۆکراتییەوە. لەراستیدا کۆنگرەی نیشتمانی عێراق، کە عێراقییەکانی هاندەران دەگرێتە خۆی، سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی شێوەی حکومەتی پاش جەنگە. بە پێی قسەی یەکێك لە ئەندامە دامەزرێنەرەکان، لەیس کوبە، ئامانجی سەرەکی ئەم حکومەتە ( دامەزراندنی ئەنجومەنێکی دەستووری لەگەڵ ئەجندایەکی شیاو، سازکردنی ڕاپرسیی عادیلانە بۆ پەسەند کردنی، لە دواییدا هێنانەدی دەستەڵات لە رێگەی سندوقی دەنگدانەوە. هاوشان،

ئیدارەی بۆشیش خەریکی پلاندانانە بۆ عێراقێکی دیموکراتی. جێگری سەرۆك، دیك چینی وتەنی: ( نوێنەرانی میللەت بە شێوەی دیموکراتی و فرەحزبی حوکم دەگرنەدەست، رێز لە ماف ئەتنی و ئاینی هەموو گروپێك دەگرن و دەیپارێزن.

دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئاوا بە توندی جیهانی عەرەبی دەشلەقێنێت، چونکە لەوێدا ولاتێکی تێدا نییە کە دەوڵەتەکەی دیموکراتیانە هاتبێتە سەر حوکم. بۆ نموونە ستوننووسی نیویۆرك تایمز، تۆماس فریدمان پشتگیری غەزووی عێراق دەکات و دەڵێت: ( ئەوەی یەکاریەك ولاتە عەرەبییەکان پێویستیانە شێوە حوکمێکە کە ببێتە مۆدێل بۆیان – شێوە حوکمێکی پێشکەوتوخوازە کە دەبێتە هۆی فشار و ئیلهام بۆ بە دیموکراتیکردن و بەسەردەم کردنی لەسەرخۆ لە دەڤەرەکەدا. ) پۆڵ وڵفۆڤیتس بۆچوونی وایە: ( ئەمە ئاسۆیەکە کە لەو دیوەوە یەکەم دیموکراتی عەرەبی سەرسوڕهێنەر بەدی دەکرێت. ) توێژەرەوەی عێراقی کەنعان مکیە دەڵێت: ( ئەمە بە قەدەر هەموو شتێك گەورە دەبێت کە لە دوای رووخانی ئیمپراتۆری عوسمانی لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا رووی داوە. )

ئەزموونی لیبراڵ و دیموکراتی عێراقی فشاری لەسەر مەلاکانی ئێران زیاتر دەکات، بۆ کردنەوەی کۆمەڵگەکەیان. مۆدێلی عێراق دەبێتە ئارمایی بەرچاوی سیۆکراتەکانی* ولاتانی خوارووی عێراق، عەرەبی سعوودی کە رێژەی بێکاری نێرینەکانی دەگاتە ٣٠٪، ژمارەی دانیشتوانی بەرەو زیادبوون دەڕوات و جەماوەر تینووی گۆڕانکارییە. لە هەمان کاتیشتدا، رەنگە عێراق ببێتە ئەو هاوپەیمانەی کە جێگە بە سعوودی عەرەبی لێژ بکات و ببێتە سەرچاوەی نەوتی ناوچەکە. عێراقی دیموکراتی دەبێتە پاڵدەری ئەو رژێمانەی کە لە خۆیاندا لیبراڵین، لەوانە قەتەر و مەراکیش و ئوردن، بۆ ئەوەی بەردەوام لەرەوتی دیموکراسیدا بن.

---

* سیۆکراتی بە شێوەی حوکمی ئاینی دەووترێت.

بەغدا لەژێر سەرپەرشتیاری ئەمریکا دا، بەبێ گومان پەیوەندییەکانی لەگەڵ دیموکراتەکانی تری ناوچەکەدا وەك تورکیا و ئیسرائیل چاك دەکات. جێگری سەرۆك، چینی، بەدڵنیاییەوە وای بۆ دەچێت کە کاتێك سەدام دەکەوێت: ( خەڵکانی ئازادیخوازی ناوچەکە دەبنە خاوەن هەل وفرسەت بۆ دامەزراندنی ئاشتییەکی درێژ خایەن. کاتێك قسە دێتە سەر دیموکراتییەکی بەرفراوان لە جیهانی ئیسلامیدا، روو بە رووبوونەوەیەك دروست دەبێت لەلایەن رەخنەگرانی فەرمایشتەکەی بۆشەوە – ئەو روو بەرووبوونەوەیەش ئەوەیە کە ئیسلام و دیموکراتی هەر بە بۆماوەیی پێکەوە ناگونجێن. ئادام گرافینکل سەرنووسەری ( NATIONAL INTEREST) نووسیویەتی : ( هەر شتێك کە ئەمریکا بیکات، لەوەناچێت کە بتوانێت بۆچوونی عەرەبی سەردەم لە ئاستی لیبڕاڵ دیموکراتدا بگۆڕێت ، کە بە لایانەوە بیرۆکەیەکی رۆژئاوایی نەگونجاوە و لە هەمان کاتدا ئەم کۆمەڵگایانە خەمی ئەوەیانە چۆن لەگەڵ مۆدرێنێکدا بژین کە رۆژئاوا هۆنیویەتیەوە. ) وەك کۆڵن پاوڵ کە ئەو بیرۆکەیە بە دوور دەزانێت: ( لە دیموکراتی بیاباندا کە خەڵکی رۆژنامەی فیدراڵییەکان لەپاڵ قورئاندا بخوێننەوە. ) گریهام فوللەر، شارەزای رۆژهەڵاتی ناوەراست گاڵتە بەو بۆچوونە دەکات کە ( حوکمی لیبڕاڵی مۆدێرن، لە رۆژئاوا ئامادەکراوە، لە جیهانی ئیسلامدا رەگ داکوتێت. )

وەك روو دەدات، ئەم جۆرە تێگەشتنانە، وێنەی ناو ئاوێنەی کتومتی لۆژیکەکانی توێژەرەوە و سیاسەتمەداری ویلایەتە یەکگرتووەکانە لە ئاستی هەموو ئەو دەڤەرانەی جیهان کە لەمەوبەر دیموکراتیان بەخۆوە نەدیوە. شارەزای ئەمریکای لاتینی هاوارد فیياردا، بە داکۆکیەوە دەیووت: ( بە گومانم کە دیموکراتی جۆری ئەمریکی بتوانرێت بەرەو دەرەوە بنێردرێت، بە گومانم لەوەی ئەمریکای لاتینی قبوڵی بکات یان بە گشتی رەتی نەکەنەوە. ) سێ ساڵ لەمەو پێش، شێفی شارەزاکانی سەر بە ژابۆن لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی، جۆزێف

گریو، سەرۆك ترومانی بە ئاگا هێنایەوە ( کە دیمۆکراسی لە ژاپۆندا سەرناگرێت و باشترین چارەسەر مەلەکی دەستوورییە. ) لە گەلێك هەڵوێستدا، دوا بە دوای جەنگی جیهانی دووەم، سیاسەتمەدارانی ئەمریکی دەهاتنەوە سەر هەمان بۆچوون لەبابەت گەلێ شوێنی وەك ئەڵمانیا، ڕووسیا، ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئەمریکای باشوور. کەچی ئێستە شەپۆلی دیمۆکراسی هەموو ئەو ناوچانەی گرتۆتەوە، ئەمانە جاریکی تریش هەمان خاڵی پێشوو دەووروژێنن لە ئاستی ناوچەیەکی تری دیمۆکراتی نەدیوو دا.

بەڵام ئایا جیهانی ئیسلامی لە بانگەوازی دیمۆکراتی پارێزراوە؟ لێرەدا جیاوازییەکی گرنگ هەیە لە نێوان دنیای عەرەبدا کە زۆربەی زۆری ئیسلامە، لەگەڵ جیهانی ئیسلامدا کە هەمووی عەرەب نییە. لەم جیهانەیاندا هەر لە تورکیاوە تا ئەندەنووسیا، دیمۆکراتییەت بە شێوەیەکی دراماتیکی لەم دە ساڵانەی دواییدا بەرەو پێشەوە هەنگاوی ناوە. ئەندامەکانی تیمەکەی بۆش — لەوانە پۆڵ ولفۆڤیتس و پاولا دوبریانسکی — داکۆکی توند لەسەر ئەم خاڵە دەکەن. بە پێی دوبریانسکی، ئەوانە دەنگە دەنگی ئەوەیانە کە دیمۆکراسی ( لە جیهانی ئیسلامیدا واقعی نییە، گوێبیستی سیاسەتمەدارە موسڵمانەکان و پێشەواکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و ئەکادیمی و دەستەڵاتدارانی ئایینی نەبوون، کە لەوە دڵنیان دیمۆکراسی نەك هەر دەگونجێت بەڵکو پێویستە. ) یاخود وەك سەرۆك بۆش بۆ خۆی دەڵێت: ( گەلانی وڵاتانی ئیسلام دەیانەوێت و شایەنی ئەوەن وەك هەموو گەلانی تر سەربەست بن و خاوەنی هەمان دەرفەت بن و حکومەتەکانیان گوێ لە داخوازییەکانیان بگرن. )

لەم ڕۆژەدا یەك دەوڵەتی عەرەبی نییە بە دیمۆکراتی هاتبێتە سەر حوکم. ڕاپۆرتی پەرەپێدانی مرۆڤی عەرەبی، ساڵی ٢٠٠٢، کە لە ژێر چاودێری نەتەوە یەککگرتووەکاندا و بە سانسۆری سندوقی نەختی عەرەبی بۆ گەشە کردنی ئابووری

و کۆمەڵایەتی، هۆکاری ئەم بارودۆخە دەخاتە بەرچاو. لە نێوان ئەو بڕگانەی کە لە راپۆرتەکەدا هاتووە: ( شەپۆلی ئەو دیموکراتییەی کە لە ساڵانی ١٩٨٠دا رۆژهەڵاتی ئاسیا و لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکاندا ناوەندی ئاسیای گرتەبەر، نەگەیشتە وڵاتە عەرەبییەکان. ئەم نوقسانییەی سەربەستی پاشەکشێی بە گەشەدانی مرۆڤ کردووە و بۆتە هۆی خەم وپەژارەی گەشە نەکردنی سیاسی. ) راپۆرتەکە لە میانەی لێکدانەوەکەیدا دەچێتە سەر حاڵەتی دڵەکزێی ترادسیونی کلتووری عەرەبی کە دوورە لە بە سەردەم بوون و بەرزی رێژەی نەخوێندەواری و هەژاری و سستی گەشەی ئابووری و لاوازی کۆمەڵگەی مەدەنی و لە هەمووی کاریگەرتر ئەوەیە کە هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان ( دەستەڵاتیان داوە بە دەزگەیەکی کارگێڕی کە کۆنترۆڵی هەموو بەشەکانی تری دەوڵەت دەکات و لە زۆربەی کاتدا ئەم دەزگەیە بە هیچ شێوەیەك وردبوونەوە و لێپێچینەوەی لەگەڵدا ناکرێت. )

سەرەڕای ئەم خۆ تاوانبارکردنەی عەرەب، سیناتۆر چەك هاکل کەوتۆتە سکاڵا کردن و دەڵێت: ( من بیرۆکەیەك کەلە رەقی و جۆرێك لە ( پاکس ئەمریکانا [*])دا بەدی دەکەم کە بە واتای ئەوە دێت ئێمە بەهێزتر و دەوڵەمەندترین و لە خەڵکانی تری جیهان زیرەکترین و دەبێت بە زۆر دیموکراتی بسەپێنین. ) بەڵام گەشەپێدانی دیموکراتییەت لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا کێشەی خۆبەزل زانین نییە. دیموکراسی بۆتە مایەی سەرفرازی و بوونی نەتەوەکەمان. لە یانزەی ئەیلوولدا قەیرانی عەرەب بوو بە هی ئێمە. چەوساندنەوەی عەرەب نەك هەر گوڕی دەدا بە جوڵانەوەی تیرۆری ئیسلامی و ئاگری توندڕۆیی دژ بە ئەمریکا خۆش دەکرد،

[*] پاکس ئەمریکانا: لە پاکس رۆمانا وەرگیاوە، کە چەند وڵاتێك لە ژێر دەستی ئەو ئیمپراتۆرییەدا بە ئاشتی و سەقامگیری دەژیان. وەرگێڕ

بەڵکو هەمان ئەو دەوڵەتانەی کە ئێمە پشتگیریمان دەکردن، راستەوخۆ بوونە هاندەری ئەم جۆرە هێزانە بۆ ئەوەی رق ئەستووری جەماوەر لە دەروازەی تەلارەکانی خۆیان دووربخەنەوە. مێژووناسی ناسراو، جۆن لویس گادیس نووسیویەتی :

ئاوێتە بوونی توندڕەوی لەگەڵ تەکنەلۆژیادا کە لەو بەیانییە سامناکەدا هاتە بەرچاوی جیهان، ئەو واتایەی دەبەخشی کە بوونی دەستەڵاتی چەوسێنەر لە هەر شوێنێك بێت، دەبێتە هۆی بێزار بوونێك بۆ هەڵچوونی تیرۆر و دەبێتە هۆی ئازاری قووڵ لە ناخی دەروونداا. لێرەوە بە ناچاری هۆیەکی واقعی دەرەخسێت بۆ تەواو کردنی ئەو ئەرکە نموونەییەی کە ودرۆ ویڵسن زیاتر لە هەشتا ساڵ لەمەبەر دەستی پێکرد: جیهان دەبێت سەقامگیر بکرێت بۆ دێموکراسی، چونکە بە پێچەوانەوە دێموکراسی لە جیهاندا پارێزراو نابێت.

رژێمە عەرەبییەکان، بە هۆی سیاسەتی سەرکووتکردنیانەوە، جۆرە ئیسلامییەکی توندڕۆیان خولقاند، دوو سەرە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردن، لە لایەکەوە هاوکاریان دەکردن و لەلایەکی ترەوە لە خۆیانیان دوور دەخستنەوە. ئەمە بە تایبەتی لە حاڵەتی عەرەبی سعوودی دا ئاشکرا دەبێت. کاتێك کە چەند کەسانێکی خێزانی پاشایەتی پارەیان بە ئوسامە بن لادن و گروپە ئەنتی ئەمریکییەکانی تر دەدا، لەلایەکی ترەوە سوودیان لەوە دەبینی کە ئەمریکا لەمانە دەیانپارێزێت.

کاتێ دێینە سەر باسی رۆژهەڵاتی ناوەراست، واشنتۆن سەرقاڵی سەوداییەکی تایبەت بوو: عەرەبە دیکتاتۆرەکان نەوتیان دەدا بە ئەمریکا و سەنگیان دژ بە یەکیەتی سۆڤێت و دوژمنانی ئەمریکی هەبوو" بەرانبەر بەوەش ئەمریکا چاوپۆشی لەوە دەکرد ئەم رژێمانە هاوولاتییەکانی خۆی سەرکوت دەکرد و پشتگیری گروپە ئیسلامییەکانیان دەکرد. لە پاڵ هەموو هەوڵەکانی رۆناڵد ریگن لە گەلێ شوێندا، بە هیچ شێوەیەك گەشەی بە دیمۆکراسی لە رۆژهەڵاتی

ناوەراستدا نەدەدا. ئیدارەی بۆشی یەکەمیش بە هەمان شێوە – تەنانەت لە کوەیتدا، ئەو وڵاتەی کە سەربازی ئەمریکی لە پێناو رزگارکردنیدا خۆیان بە کوشت دەدا، ئەم ئیدارەیە کاری بۆ بە دیموکراتی کردنی نەکرد. تیمەکەی کلینتۆن، لە ئاستی خۆیانەوە گوێبیستی شارەزای رۆژهەڵاتی ناوەراست، مارتین ئینديك، بوون کە دەیووت: ( دەوڵەتە عەرەبییە میانرۆکان بنکەی سەربازی بە ویلایەتە یەککگرتووەکان دەبەخشن و کار ئاسانی بۆ دەکەن، لە بەرانبەر ئەوەشدا لەبەر هۆی ناوخۆ واشنتۆن نابێت فشار بخاتە سەریان. ) ئەم ئیدارەیەی ئێستەش، تارادەیەك رێز لەم رێککەوتنە دەگرن. – بۆ نموونە، فشاریان نەدەخستە سەر سعوودیە بۆ هاوکاری لە لێکۆلینەوە لە رووداوەکانی ١١ ئەیلولدا، یان لە خاکی سعوودیەوە هێرش بکاتە سەر ئوسامە بن لادن. وەك ئاماژەدانێك بە بۆچوونی چین کیرپاتریك لە کتێبی ( دیکتاتۆرییەت دوو رووپی ) ئەندامانی تیمەکەی بۆش مشتومری ئەوەیان بوو کە راستە دیکتاتۆرە عەرەبەکانی سەر بە ئەمریکا ئێسك قورسن، بەڵام ئەوانەی دێنە جێگایان لەوان خراپتر دەبن. ئەو دیکتاتۆرە عەرەبانەی کە یاوەری ئەمریکا بوون شەرمیان لەوە نەدەکردەوە کە بە تیمەکەی بۆش رابگەیەنن کە ترسی لابردنیان هەیە. ئاوا و بەم شێوەیە لە کاغەزێکدا کە ساڵی رابردوو، جێگری پاشای سعوودی ئەمیر عەبدوڵڵا نارد بووی، باس لەسەر ئەوە بوو کە ئەگەر ویلایەتە یەککگرتووەکان ئاگای لە کارەساتی رژێمەکەی نەبێت، ئەوا خێزانی پاشایەتی سعوودی دووچاری هەمان چارەنووسی شای ئێران دەبێت.

فرانکلین رۆزڤیلێت، لە مەوبەر، ئەناستاسیو سۆمۆزایای نیکاراگوای وەك نموونەکانی عەرەبی سعوودی و میسر وەسف کردووە و دەڵێت: ( سۆمۆزا کوری دێڵە سەگە، بەڵام کوری دێڵە سەگی خۆمانە. ) ئەم وەسفە ئێستە تەواو ناگونجێت، با لە سعوودیەوە دەست پێبکەین: ئەمانە بە هیچ شێوەیەك کوری دێڵە سەگی ئێمە

نین، دوور لەوەی کە مەعمیلی خۆمانن – سۆمۆزاش وابوو – نەك هەر ئەوەندەی یارمەتی ئەوەیاندا کە ئیسلامی رادیکاڵی دامەزرێنن بەڵکو هانیشیان دەدان. لە کاتی جەنگی ساردا، کاتێك کە مەترسی بەلای کەمەوە لە ئاسی ئێستەدا بوو، ئیدارەکەی ریگن رێگە چارەسەری بۆ دیمۆکراسی لە سلفادۆرەوە تا فلیپین دادەهێنا بە بیٚ ئەوەی یاریدەی ئۆپۆزسیۆنە دیمۆکراتەکان بدات بێنە سەر حوکم. ئەوانیش وەك گومانچییەکانی ئێستە کە دەڵێن ئەو شەیتانەی ئێستە دەیناسن لە بەدیلەکەی باشترە. ئەوان بە هەڵەدا چوو بوون و ئێستەش هەر بە هەڵەدا دەچن.

ئەمانیش لە رووی کاری دەستپێکەوە بۆ بنیادنانی دیمۆکراسی لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا تا ئێستە هەر وردە ئیش کراوە. زیاد کردنی پارە بۆ ئاژانسی گەشەی نێودەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ پێشخستنی دیمۆکراسی: یارمەتی بۆ دەزگای ئینداومێننتی نیشتمانی بۆ دیمۆکراسی، بۆ هەمان مەبەست و زارەتی دەرەوەش پرۆگرامی بۆ یاریدەدانی بە دیمۆکراسی بوون هەیە لە مەراکیش و بەحرین و قەتەر، لەگەڵ پێکهێنانی پرۆگرامی رادیۆیی ئازاد بۆ ئەوەی ئەو هەوالانە باسب کرێن کە وەکتر هەرگیز نابیستریٚن. لە رووی رەوانبێژییەوە، کەمێك لە سیاسەت باشتر دەڕوا، لە راستیتدا باشتر لە هەموو پێشینەکانی ئیدارەکە هەنگاوی باشی ناوە ، بابزانین کۆندالیزا رایس لە ئۆکتۆبەری رابردوو چی دەڵێت: ( ئێمە ئەو بۆچوونانە رەت دەکەینەوە کە دەڵێن سەربەستی لە خاکی رۆژهەلاتی ناوەراستدا سەوز نابێت، یان موسڵمانەکان هاوبەشی ئارەزووی سەربەستی نین. ) بۆ ئەوەی ئەم قسانە بکرێن بە کردەوە، ئیدارەکەی بۆش یارمەتی گەیاندۆتە خۆپیشاندەرانی دیمۆکراسی لە ئێراندا، داکۆکی لە دیمۆکراسی بوونی دەستەلاتی فەلەستینی کردووە و رەخنەی لە سەرۆکی میسر حوسنی موبارەك گرتووە، لە شێوەی مامەڵە کردنی لەگەڵ چالاکیەکانی سەر بە دیمۆکراسی لە ولاتەکەیدا.

لەو بەڵێنەدا کە ویلایەتە یەکگرتووەکان ( ئەم چرکە ڕەخساوە بەکار دێنێ بۆ ئەوەی سوودی سەربەستی بە هەموو گۆی زەوی بگەیەنێت، سەرۆك بۆش ئاوا بەهێزە لە پشتگیری دیمۆکراسیدا و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش دوورتر دەڕوات.: ویلایەتە یەکگرتووەکان خاوەنی هێزێك و کاریگەرییەکە کە لەوە پێشتر لە جیهاندا نەبووە، ئەمەش بە پشتبەستن بە باوەڕمان بە پرنسیپی سەربەستی و بەهاکانمان بۆ کۆمەڵگەی ئازاد. ئەم هەڵوێستەمان بە شێوەیەکی بێ هاوتا لە ئاستی بەرپرسیارێتی ئەرك و قۆستنەوەی دەرفەتەوە دێتە کایەوە. هێزی بەگوڕی ئەم بۆچوونە دەبێت بۆ هاوسەنگی هێزی سەربەستی بەکاربهێنرێت.
لەوە دەچێت ئەم پێشنیارە بێ چەندوچوون بێت، بەڵام بە پێی ڕەخنەگرانی هەردوولا، چەپ و ڕاست، خەریك بوونمان بە دیمۆکراتی کردنی دەوڵەتانی تر، بانگەشەیەکی مەزهەبییە کە گوایە بنەماکانی ئێمە سەر بە هەموو دنیایە. ئەم جۆرە شۆڤێنەتە تەسکە بێ گومان دەبێتە هۆی هەڵمەتی خاچپەرستی سەر جیهان و لە خۆیدا کاردانەوە ترسناکەکەی کە لە سادەیی و لە خۆبایی بوونێکی نالەبار وەرگیراوە. ئەم جۆرە ڕەخنەیە سەلیقە و ڕاستیشی تێدایە، ناردنی دیمۆکراسی بۆ دەرەوە خزمەتی بەرژەوەندییە زیندووەکانی ئەمریکاشی تێدایە، بەڵام جێ بەجێکردنی نموونەییە هەرە بایەخدارەکانمان دەکرێ — لەوانە ئەو پرنسیپەیە کە دەڵێت: گەل بەبێ ویست و ئیرادەی خۆی حوکم بکرێ. وەك لە بیرۆکەی ئاسایشی نیشتمانی بۆشدا هاتووە: ( هیچ کەسانێکی سەر ڕووی زەوی نابێت دووچاری چەوساندنەوە ببێت و بکرێتە بەندو کۆیلە یان بە ترس و لەرزەوە چاوەڕێی پۆلیسی سری بکات کە نیوەشەو لە دەرگەکەی بدەن. )

به جیهانی کردنی پرنسیپەکانی ئەمریکا سوودی ستراتیژیشی هەیە، ئەگەر ئێمە ئامانجەکانمان بە زاراوەی دیمۆکراسی، نەك بە شێوەی ئەمریکی، ڕابگەیەنین. ئەو ساکە سیاسەتەکانی ئەمریکا پشگیرییەکی بەرفراوانی لێ

دەکرێت. بە تایبەتمەند کردنی هەوڵی ئەمریکا بۆ لابردنی سەدام، ناوی بنێی ( جەنگ لە پێناو نەوت )دا دەبێتە هۆی وەسف کردنی فەرمایشتەکەی بۆش وەك هەوڵدانێك بۆ ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك دەوڵەتێکی زۆردار کە بە لەخۆبایی بوون گۆش کرابێت دێتە بەرچاو و ئەگەر بە زاراوەی شەڕ بۆ دیمۆکراسی ئەم جەنگە بخەینە روو ئەوساکە کاردانەوەی بۆ سەر خەڵکی رۆژهەڵاتی ناوەراست زۆر جیاواز دەبێت. ( هاوسەنگی تەرازووی دەستەڵات کە سەربەستی پەسەند دەکات. ) خۆ نزیك کردنەوەیەکی ئەمریکییە رووە و جیهانە نەك خۆ دوورخستنەوە لە جیهان. شێوەی هەڵگیرساندنی جەنگ لە کۆسۆڤۆ و عێراق لە لایەکەوە، یارمەتیدانی ئیسرائیل و تایوان – هەرچەندە لەوە دەچێت پەیوەندی نێوان ئەم دووانە کەم بێت – کار دەکاتە سەر شێوەی بۆچوونی جیهانبینی خۆ نزیك کردنەوە لە وڵاتانی جیهان. لەم رووەوە مایکل ماکفاول، شارەزای زانکۆی ستانفۆرد نووسیویەتی: ( ئیسلامەکان و مەسیحەکان، ئەمریکاییەکان و ئێرانییەکان، عەرەبەکان و ئیتالییەکان، هەموویان دەتوانن لە یەك ئاست بن و دژی یەك دوژمن بوەستن. ئەو دوژمنەی دژی ئازادییە و لەوانەیە کە لە ئیسلامی تۆتالیتاری گەورەتر بێت و هەر لە دیکتاتۆرەکانی باکورەوە تا شێخەکانی عەرەبی سعوودی بگرێتەخۆی. نرخی ستراتیژی دیمۆکراسی لە ئاستی سیاسەتی نێودەوڵەتیەوە رەنگ دەداتەوە. دیمۆکراتەکان لەوانەیە زۆر کەم یان هەرگیز جەنگ دژی یەکتر هەڵگیرسێنن، بۆچی؟ هۆیەك لە لایەن ئیمانوئێل کانتەوە بەم شێوەیە روون کراوەتەوە:

کاتێك کە رەزامەندی هاوڵاتیان مەرجدار دەبێت بۆ بڕیاردانی هەڵگیرساندنی جەنگ یان خۆ لێ دوورخستنەوەی، تەواو سروشتییە لە دەستپێکی پرۆژەیەکی ئاوها خەتەرناکدا تووشی دوودڵی گەورە بێن .... بەڵام بە پێی دەستوورێك کە کۆماری نییە، لە هەموو شتێك ئاسانترە کە رووبکەینە جەنگ. لەبەر ئەوەی کە سەرۆکی

دەوڵەت لە ئاستی هاووڵاتیاندا نییە، بەڵکو خاوەنی دەوڵەتە و جەنگ وا لەو ناکات کە بچووکترین قوربانی بدات.

بەهاکانی رەوشت و دەزگەکانی دیموکراسی هاندەری ئاشتبوونەوە و رێکەوتنن، هاندەری نەریتەکانی ترن کە دەوڵەتە دیموکراتەکان پەیڕەوی دەکەن لە پەیوەندییەکانی نێوان خۆیاندا. دەوڵەتە نادیموکراتەکان، کە پێویست بە باسکردن ناکات، نایکەن. یان وەك ودرۆ ویلسۆن لە ١٩١٧دا دایناوە: ( سەقامگیری ئاشتی هەرگیز سەرناگرێ بە بێ هاوبەشی کردنی وڵاتە دیموکراتەکان و نابێت هەرگیز پشت بە حکمومەتە ئۆتۆکراتەکان ببەتسترێ، کە ئەمانە بڕوایان بە ئاشتی هەبێت یان رێزی پەیمانەکانی بگرن. )

سەدەیەکی شەڕ و پێکدادان دژی فاشییە دیکتاتۆرەکانی ئەڵمانیا و ئیتالیا سەلماندی، کە دیکتاتۆرە کۆمۆنیستەکان لە کۆریا و ڤێتنام، تازە فاشییە دیکتاتۆرەکانی بەلقان و عێراق و دژی بازاڕی قاچاغی ماددە سڕکەرەکان لە ئەمریکای ناوەراستدا زۆربەی زۆری سیاسیە کەللەرەقەکانی لە راستییەك بەئاگا هێنایەوە کە هەڵسوکەوتی رژێمەکان – نەك رێکەوتنە دبلۆماسییەکان یان دەزگە هەمە لایەنەکان – کلیلی ئاشتی و ئارام گیرین. ستراتیژی تەرکیز کردنە سەر گۆڕینی رژێم بۆ دیموکراتییەکی بەهێز وەك زانای سیاسی جۆن ئیکێنبەری نووسیویەتی: ( ستراتیژییەك کە لەسەر زەمین بێ، بۆچوونێکی واقعی چەسپاوە کە زیاتر کاریگەری بەتینی هەڵسوکەوتی سیاسی دەوڵەتەکانی تر بەدی دەکات، کار دەکاتە سەر توانای ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دابین کردنی ئاسایش و بەرژەوەنییە ئابووریەکانی خۆی. ) سەبارەت بە ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەرژەوەندییەکانی خۆی شێوەیەکە ئەوەندەی جیهان دیموکراتی بێت، ئەوەندەش مەییو و سەقامگیر دەبێ بۆ ئەمریکا.

تاکتیکەکانی گونجاندنی کاری دیموکراتییەت لەوانەیە بە پێی بارودۆخ بگۆڕێن، لەوانەیە لە چەند حاڵەتێکدا تەرکیز بخاتە سەر گروپەکانی راپەڕین وەك

چۆن هێڵی فەرمایشتەکەی ریگن لە ساڵی ۱۹۸۰ لە نیکاراگوا پەیڕەوی کرا. لە حاڵەتەکانی تردا لەوانەیە بە یاریدەدانی ئەوانە بێت کە لە دەرەوەی وڵات دەژین، بە ئاشکرا و نائاشکرا ئەم جۆرە تاکتیکە لەوە دەچێت کە ئاکامی باشی هەبێت، بۆ نموونە لە پۆڵندا و کۆریای باشوور. لەوانەشە تاکتیکەکان راستەوخۆ سەرکەوتوو بن یان سەرکەوتوو نەبن، بەڵام ئامانجەکانی دەبێت روون بن. کاتێك دێتە سەر مامەڵەکردن لەگەڵ رژێمە زۆردارەکاندا، بە تایبەتی ئەوانەی کە دەتوانن زیان بە ئێمە یان هاوپەیمانەکانمان بگەیەنن، ویلایەتە یەکگرتووەکان دەبێت بە دوای گۆڕینی رژێمەکەدا بگەڕێ، نەك لە گەڵیدا ژیان بردنە سەر.

بیرۆکەی ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێ ( هاوکاری ) لەگەڵ هەر رژێمێکدا بکات، بێ گوێدانە ئەوەی چەند گونجاو و ناحەزی پرنسیپەکانی ئەمریکا بێت لە رووی رەوشت و ستراتیژەوە، بیرۆکەکەی گومان لێکراو دەبێت. هێزی نموونەیی ئەمریکا و دەستەڵاتی ئەمریکی مەیلی بێ پەروایان هەیە بۆ مۆلەق کردنی ئەو کۆڵەکانەی کە ئەم دەستەڵاتە تۆتالیتاریانە پاڵیان پێوە داوە. ئەم رژێمانەش لە ئاستی خۆیانەوە پەنا دەبەنەبەر شڵەژاندنی ئەمریکا و لایەنەکانی بەهۆی داپین کردنی چەکی تۆقێنەرەوە وەك حاڵەتی چین و کۆریای باکور، یان داگیرکردنی شوێنانی تری دەڤەرەکە وەك عێراق و سربیا. کاتێك نەشیانتوانی هاوڵاتییە نەگبەتەکانی خۆشیان بە شەرعیەتی خۆیان قایل بکەن، ئەوساکە ئەم دەوڵەتانە دەکەونە سرینەوی ئازادییەکان بە بیانووی ئەوەی گوایە دوژمنی دەرەوە ناچاری کردوون. وەك نموونە، حکومەتی چین باش دەزانێ کە نابێتە هاوبەشی ستراتیژی ویلایەتە یەکگرتووەکان. حکومەتی ئێران دەزانێ ناتوانێ پەیوەندییەکانی لەگەڵ جیهانی دیمۆکراتدا ئاسایی بکات. سەددام حوسێن لای روونە کە ناتوانێ بە ئاسانی واز لەو چەکە کۆمەڵکوژە بهێنێت کە کۆی کردوونەتەوە. کەواتە کەی رژێمەکانیان هەرەس دێنێت.

سوودی گەشەدان بە دیمۆکراتی لە وەدایە کە جیهان زیاتر گونجاو دەکات بۆ پێکەوە ژیان لەگەڵ ئەمریکا، ئەمە لە خۆیدا ئامانجێکی مەنفەعی پراگماتیکیە و زیاتر وەك میرات بۆ ئەمریکا ماوەتەوە. بنەماکانیش لە بەیاننامەی سەرپەرشتی ولاتدا بەرز نرخێندراوە. ماددەکانیش بوونەتە پوختەی دەستوور. کاردانەوەشی بۆتە دوو شێوازی سەدەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا. ویلایەتە یەکگرتووەکان بە تەنیا هەر منارەیەکی بڵندی روناکی نییە بۆ دیمۆکراسی لیبڕاڵی، هەموو پێشڕەوێکی ئەم وڵاتە – ئەگەر چی مشتومڕی ئەوەی بێت، کە هەڵسوکەتی نێودەوڵەتی ئەمریکی دەبێت ببێتە کەشێکی گونجاوی ئەم شێوە نموونەییە دیمۆکراتییە یان باشتر وایە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان ببێتە ئیلهامی دەوڵەتەکانی تر، لە پەیڕەوی کردنی ئەم نموونەییانە لەناو ئەمریکا خۆیدا – هەموو پێشەواکانیش دەرکیان بە رۆڵی تایبەتی کردووە کە پرنسیپەکانی ئەمریکا دەبێت لە رەفتاری دەرەوەی ئەو وڵاتەدا پەیڕەو بکرێت.

ئەم بەرژەوەندییە بێ وێنەیەی ئەمریکا لە دیمۆکراتیدا، کە بۆتە کێشەی رخنەگرە چەپڕۆکان لە ئیدارەی بۆش و گومان کردن لەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێ هەستێ بە دامەزراندنی ( حکومەتی دیمۆکراتی لە شوێنێکدا کە لەوە پێشتر ئەم شێوە حوکمەی بە خۆیەوە نەدیوە ). لیۆن فویرس، راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی ئەلگۆر لە هەوڵی ئەم شێوە کارەدا ئاگاداری دەدا و دەڵێت: ( دەبێتە هۆی گومڕا بوونێکی ترسناك بە هێزی ئەمریکاوە. ) ئەوانەی سەر بە پەیڕەوکردنی دیمۆکراسین لە ئیدارەی بۆش وەك نووسەری نیویۆرك تایمز دەڵێت: ( گروپێکی هەرە خەتەرناکی تۆباوییە. لە هەمان بۆچوونەوە پرۆفیسۆر ستانلی هۆفمان لە زانکۆی هارڤارد کە چەند ساڵێك لەمەوبەر بەرگری دەکرد لە ( بەهای رەوشت لە سیاسەتی دەرەوەدا ) ئێستە تێناگات بۆچی ویلایلاتە یەکگرتووەکان دەیەوێت ( ئەو وڵاتانە بگۆڕێت کە لە رابردوودا دیمۆکراسی بە

خۆیەوە نەدیوە و نە رژێمە چەوسێنەرەکانی روو بە رووی ئۆپۆزیسیۆنی یەکگرتووی خاوەن ئەزموون بوونەتەوە. )

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، ودرۆ ویلسۆن، کەوتە هەڵمەتێکی خاچپەرستانە بۆ خۆش کردنی زەمینەی دیمۆکراسی جیهان. ئەو سەرۆکانەی بە دوایدا هاتن لە ( رۆزڤێڵدەوە بۆ کەنەدی )، لە بابەت ئەم ئامانجەوە هەرگیز نەهاتوونەتە پرسیار، بەڵام ئەم ئامانجانە لە ماوەی درێژخایەنی جەنگی ڤێتنام لە درەوشانەوە کەوت، بە تایبەتی لیبراڵەکان پرسیاری ئەگەری ئەوەیان دەکرد، ئایا سیستەمەکەی خۆیان لەوانی تر بە باڵاتر دانێن؟ ئایا بە زۆر کاردانەوەی خۆیان بسەپێنن؟ ئەمانە بە باشی دیمۆکراسی ناگەن، زیاتر پرسیاری رێگەی سەرخستن دەکەن، بە تایبەتی بە هۆی هێزی ئەمریکییەوە. بەم جۆرە، کاتێك تیمەکەی کارتەر لە بابەت دیمۆکراتییەوە بە ئاشکرا بە دەنگی بەرزەوە دەدوا، بە تایبەتی لە حاڵەتی هاوپەیمانەکانیدا. وەك ئێران و نیکاراگوا، ئەوانەی لە وڵاتی خۆیاندا ڕوو بە ڕووی شۆڕش بوونەتەوە. کەم تریش دەهاتنە سەر باسی یەکیەتی سۆڤێت و ئەو وڵاتانەی لە فەلەکیدا دەخولانەوە. دوو دڵییەکی قووڵ لە حوکمدان بەسەر خەڵکی تردا و گومان کردنی درێژ خایەن لە نموونەییە بنەماکانی ئەو بکات، لیبراڵەکانی بەرەو پتەو کردنی گەشەدانی ( کۆمەڵایەتی ) و ( ئابووری ) جیهان دەبرد لەسەر حسابی دیمۆکراسی. دیمۆکراسیش لە خۆیدا ببوو بە پێناسەی ئەمریکی. دبلۆماتی ناسراوی تیمەکەی کلینتۆن، جۆزیف دوفەی لە توێژینەوەیەکدا دەڵێت: ( جەنگی سارد زۆر گومرای کردووین، بە عەقڵییەتی خاچپەرستیشەوە بیر دەکەینەوە، بە شێوەیەك وای لێکردووین بە باشی بزانین فەرمان بە سەر وڵاتانی تردا دەربکەین.

لە دەنگدانەوەی بۆچوونی جۆرج مالگوڤەرن، لە هەڵمەتی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٧٢ دا کە دەڵێت: ( هێزەکانی دوور لە کۆنترۆڵی ئێمە ڕۆڵی هەرە گرنگیان لە دانانی شێوازی داڕشتنی باری سیاسی دوا رۆژدا دەبێت. ) لە پێشبینی

بریژێنسکی راوێژکاری جێمی کارتەر بۆ کاروباری ئاسایشی نیشتمانی کە دەڵێت: ( زەمانەیەك کە تێیدا تەکنەلۆژی و ئەلکترۆنیك رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبنە بنەمای بڕیاردانی شێوەی ژیان لە جیهاندا.) تیمەکەی کلینتۆن لەسەر ئەوە سوور بوون کە هێزی بەرفراوان بێ سەرباز، گەلێك لە ئامانجە ترادسیۆنەکانی سیاسەتی ئەمریکی بە دەست دێنن، بە تایبەتی هێزە پشت بە یەك بەستووەکان دەتوانن بە شێوەیەکی باشتر دیموکراسی بچەسپێنن وەك لە چالاکی سیاسی ئەمریکی. لێرەدا ئیدارەی کلینتۆن مەبەستی لە هێزی بازرگانی بوو، بە پێی بۆچوونی تیمەکەی کلینتۆن تەرکیز کردنە سەر بازرگانی نێودەوڵەتی، نەك هەر ئاکامی ئابووری باش بووە، بەڵکو یارمەتی وەدەست هێنانی ئامانجە ترادسیۆنەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکاشی داوە، گرنگترینیان بە دیموکراتی کردن بووە. یان وەك راوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی، ساندی بێرگەر لە ساڵی ۱۹۹۷ دا وتوویەتی: ( گەشتیارە تازەکانی جیهانی ئابووریَ — کۆمپیوتەر و مۆدێم و فاکس و فۆتۆکۆپی و کۆنتاکت و گرێدانی کاری بازرگانی زیاتر دەکەن و تۆوی دیموکراسی لەگەڵ خۆیاندا دەگێڕن. لە دوای لێك جیاکردنەوەی مافەکانی مرۆڤ و ئیعتیباراتی سیاسی، بە شێوەیەکی رەسمی کلینتۆن لە ساڵی ۱۹۹٤دا، لە چین، دڵنیایی پیشان دا کە بازرگانی و تەکنەلۆژیا ( هێزی گۆڕانکاری لە چین دابین دەکەن، چین ئاوێتەی بیر و بۆچوون و نموونەییەکانی ئێمە دەکەن.)

به ئاواتی ئەوەی کە ئەرکی بە دیموکراتی کردن بە بازار بسپێردرێ، تیمەکەی کلینتۆنی دووچاری داوی ئاڵۆزی رەوشت کرد و نەیاندەزانی چۆن سەری لێ دەرکەن. مامەڵە کردنی کۆشکی سپی کلینتۆن لە ئاستی مەسەلەکانی دەرەوەدا وەك ( پراگماتی تازە و ولسۆنیانیزم ) رەنگی دەدایەوە، بەڵام ودرۆ ویلسۆن کە هاتە سەر حوکم، نییەتی روونی هەبوو، دەیویست کۆتایی بە ( سیاسەتی دبلۆماسی دۆلار )ی ئیدارەکەی سەرۆك تافت بهێنێ. لە سەرووی هەموویانەوە، لۆژیکی

تیمەکەی کلینتۆن لە روو بە ڕووەکانیدا بۆ بە دیمۆکراتی کردن بە خێرایی بەرەو دواوە دەڕۆشت. دڵنیا بوونیان لەوەی تەنها پەرۆش بوون بۆ دەسکەوت، گەشە بە دیمۆکراتی دەدات. ئیدارەکەی خستە هەڵەی پشت گوێ خستنی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لە چەند وڵاتێکدا کە ئەمریکا هاوبەشی بازرگانیان بوو. دوور لە گوێدان بەم پێشێل کردنە، فراوان کردنی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی وەك چین و باکستان، هاوکاتی خراپ بوونی پێوەری مافەکانی مرۆڤ بوون لەم وڵاتانەدا. بە پاشکۆ کردنی پرنسیپەکانی سیاسی لە ئاستی فراوان کردنی پەیوەندییە بازرگانییەکان بوونە بیانووش بۆ مەحکوم کردنی هیپۆکراسی ئەمریکی. ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەڕەنسی لە وتارێکدا نووسیویەتی ( مەسەلەی چین و خۆپیشاندانەکانی، ئەمریکا وەك دۆستی نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤ پوچەڵ دەکاتەوە. دوور لە پەرەپێدانی دیمۆکراسی وەك ( پشتگیری یەکتری ) ڕەفتاری نێودەوڵەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان وای لێ هاتبوو لەگەڵ ڕەفتاری ئەوروپییەکاندا جیا نەدەکرایەوە.

فەرمایشتەکەی بۆش ئەم مامەڵەیەی ڕەت کردەوە، کە گوایە گریمانەی لە خۆڕازی بوون بەسە بۆ ئەوەی بە دیمۆکراسی کردن تەشەنە بکات. واشی خستە ڕوو کە دیمۆکراسی هەڵبژاردەی سیاسەت و کاری ئیرادەیە، کەسێك نەك شتێك دەبێ بخوڵقێنێ، زۆرجار ئەو کەسە یەك پێشڕەوە – لێخ ڤالێنسا، شاخوان کارلۆس و ڤالساڤ هاڤیلە، جاوباریش، فشاری دیمۆکراسی لە جوڵانەوەی ئۆپۆزسیۆنی سیاسییەوە دێت وەك کۆنگرێسی نیشتمانی ئەمریکا لە باشووری ئەمریکا، سۆلیدارێتی لە پۆڵەندا، یان ڕێپێوانەکەی تیانانمێن. بەڵام بۆچوونی مێژوو وای دەردەخات کە بە کاریگەری لە ویلایەتە یەککگرتووەکانەوە دێت.

لە ساڵەکانی ١٩٨٠دا ئەمریکا فشاری دبلۆماسی و ئابووری دەخستە سەر ڕژێمە چەوسێنەرەکان لە پۆڵەنداوە بۆ ئەفریقای باشوور، دەستتێوەردانی بۆ بەربەست کردنی کودەتای سوپایی لە فلیپین و پیرۆ و سلیفادۆر و هندۆراس و

بۆلیڤیا دەکرد ، هەرچۆنێك بێت بایەخێکی هاکەزایشی دا بە مافەکانی مرۆڤ و دیمۆکراسی لە شێوازی سیاسەتی دەرەوە دا. ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕۆڵێکی گرنگ و راستەوخۆی بینی لە دیمۆکراسی کردنی وڵاتانی کۆریای باشوور و تایوان. بە شێوەیەکی تەواو و گونجاویش، دە ساڵەی هەشتاکان بە هەڵواسینی وێنەی پەیکەری سەربەستی، بە فاکس گەشتۆتە گۆڕەبانی تیانامێن لە لایەن دیمۆکراتخوازە چالاکەکانەوە هەڵواسرا. کریستۆفەر پاتن، دوا حاکمی بەریتانی لە هۆنگ کۆنگ بە تینەوە دەڵێت: ( دەستەڵاتی ئەمریکا و پێشڕەوایەتییەکەی لە هەموو فاکتەرێکی تر تۆکمەتر بوو بۆ بە هاناوەچوونی سەربەستی لە نیوەی دووەمی ئەم سەدەیە دا. )

مشتومڕکردن لەسەر ئەوەی کە چی بۆ ئێستەی ئەمریکا گونجاوە؟ مشتومڕێکی ناماقووڵە ئەرکەکەی بخاتە سەر شانی تەکنەلۆژیا یان بازرگانی یاخود رێکخراوە دەوڵەتییەکان ، بە هەمان شێوە هەڵەیە کە بڵێی ئەمریکا دەبێت وا نەکات، چونکە مافی نییە ئیدارەی خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێت. ئەلیکساندەر سۆلینتسین جارێك وای نووسیوە: ( پێشڕەوەکانی کۆمۆنیزم دەڵێن دەست لە کاروباری ناوخۆمان وەرمەدەن، با هاوڵاتییەکانمان بە ئارامی و بێ دەنگی بخنکێنین. ) بەڵام من پێتدەڵێم: ( زیاتر و زیاتر دەستتێوەردان بکە، هەتا دەتوانی دەست تێوەردە، ئێمە لێتان دەپارێینەوە کە بێن و تەداخوول بکەن. )

سروشتییە کە ئەم بانگەشەی سولینتسینە نە لە واقعییە پارێزگارەکانە و نە لە چەپڕۆ پڕ گومانەکانی ئەمریکاوە پێشوازی لێ ناکرێت. کاتێك کە زۆربەی واقعییەکان ڕۆڵی سەرەکییان لە ساتە وەختی جەنگی سارد دا دەبینی و پشتگیری گەورەی هێرش بردن بوون، لە سیاسەتی ئەمریکادا لە هەمان ساتە وەختدا، – ئەمریکایان وریا دەکردەوە کە دوور بێت لە خەیاڵەکانی لیبراڵەکان و خۆ تەریك کەرەکان، پاڵدەری بەرزکردنەوەی رێژەی خەرجی بەرگری بوون و

سیاسەتمەدارانیان لە بەرفراوان بوونی یەکیەتی سۆڤێت وشیار دەکردەوە – ئەمانە هیچ کاتێك سۆزیان بەرانبەر مەزهەبی ئایدیالی و نموونەیی نەبوو، کە ئاودەری ئەم سیاسەتە بوو. لە سەرەتای جەنگی سارد دا، زانای لاهوتی راینهۆلد نیپور سکالای ئەوەی بوو: ( ئێمە هێشتا مەیلی ئەوە دەکەین، وا خۆمان پیشان بدەین کە دەستەلاتمان لە لایەن میللەتێکی نامۆی راستگۆوە جێ بەجێ دەکرێت. ) هاوکات هاوەڵە واقعییەکەی جۆرج کینان ئەوەندە دوور ڕۆشتووە کە رابردووی دیموکراسی ئەمریکی لەگەڵ ( دەعبایەکی پێش مێژووی دەکرد کە لەشی هێندەی ژوورێك بووە، بەڵام مێشکی هێندەی نووکە دەرزییەك دەبوو. ) دەجووان ئەوەی واقعییەکان لێی دەترسان، تاڕادەیەك میکانیزمی دیموکراسی ئەمریکی نەبوو لە ناوخۆ دا. – هەرچەندە جاروبار خۆیان لەمەش بەدوور دەگرت – بەڵام زیاتر دەرکیان بەوە دەکرد کە ئەمە پاڵدەرێکی عیسایی بێت، بۆ ئەوەی ئەمریکا بەرەو تێکدانی هاوسەنگی هێز ببات لە نێوان ئەمریکا و یەکیەتی سۆڤێت دا. لە کەوتنەبەر شەپۆلی ئەم مەزهەبە رێژەییەدا، هانز مورگنتاو دەڵێت: ( دیموکراتی ئەمریکی و کۆمۆنیزمی سۆڤێت هەروەك دوو ڕووی یەك دراو دەبینێ، کە ئەویش " قەومچێتی جیهانییە " کە کەوتۆتە شوێن ( یەك میللەت و یەك دەوڵەت مافی ئەوەی هەبێ بە هاوستانداردی کاری خۆیان بەسەر هەموو میللەتەکانی تردا بسەپێنن. ) ئەوەی ئەمریکا دەبێت دەرکی پێ بکات وەك کینان ئاماژەی پێکردووە ئەوەیە ( هیچ کەسێك ناتوانێ ببێتە دادوەری دەزگە ناوخۆییەکان و کارە پێویستەکانی میللەتێکی تر. )

واقعییەکان لە هەوڵی قایل کردنیان بۆ ئەم بۆچوونانەیان، نابینا بوو بوون و نەدەهاتنە سەر ئەو رایەی کە دەزگەکانی ناوخۆ و پێداویستییەکانی سەر بە هەردوو لا، یەکیەتی سۆڤێت و ویلایەتە یەککگرتووەکان، زۆر بە وردی بوونە هۆکاری کۆتایی هێنانی جەنگی سارد. هەروەك بە یەکدا هەڵچوونی ناوەوەی کۆمۆنیزم، لە بە خاك سپاردنی یەکیەتی سۆڤێت و دەوڵەتە پاشکۆکانی هاوکاری کرد. بە هەمان شێوە

بەشدارییان لە چەواشە کردن و سەرکەوتنی دیموکراسی ئەمریکی کرد بۆ رەخساندنی بەدیلێکی باشتر بۆ هاولاتیانی ولاتە شیوعییەکان. پرنسیپەکانی لیبڕاڵ – دیموکرات، پشتگیریشی لە قوربانییەکانی ئەم ئەمریکایە دەکرد، کە لە ماوەی ٤٠ ساڵی جەنگی سارد دا دەیانبەخشی. رۆبیرت ئۆسگۆد سوورە لەسەر ئەوەی مەزهەبی نموونەیی و پوچەڵکردنەوەی بیری مۆرگێنتاو و دەڵێت: ( ئایدیالیزم زەرووری مەنتیقە. ) واش دەرکەوت کە کۆمۆنیزم لە ئاستی سیاسی و رەوشتییەوە ناتوانێ بەربەرەکانی لیبڕاڵ دیموکرات بکات. کۆمۆنیزم ئەو بیرۆکەیەیە کە تەنانەت توانای درێژە پێدانی هێزە سەرکووت کەرەکەی نەبوو کە هێنایە گۆی زەوییەوە وەك ئایدۆلۆژی بە پێچەوانەوە، لیبڕاڵ دیموکراسی بە چەپرۆییەوە چەسپاوە و ئایدۆلۆژییەکەشی بەرەو گەشەکردن دەڕوات.

لەگەڵ ئەمەشدا گەلێك سیاسەتمەداری واقعی، ئەم سەلماندنە دراماتیکییە وەك بیرۆکەی ئەمریکای بۆ بەکارهێنانی هێز بۆ گۆڕینی رژێمی ئەو ولاتانەی دیکتاتۆری حوکمی دەکەن وەك تۆباوی لە قەڵەمی دەدەن. لە جیاتی ئەوەی گەشە بە بیر و بۆچوونی تر بدەن، واقعییەکانی ئەمڕۆ هەرچۆنێك بێت توانیویانە دوڕاندنێك لە سەرکەوتنە لاسەنگەکانی مێژوودا بدۆزنەوە، لێرەوە چەند ساڵێك لەمەوبەر پرۆفیسۆری زانکۆی هارڤارد ساموئیل هانتینگتۆن راستییەك دەردەخا کە ( ئارەزوویەکی تایبەتییان لەگەڵ ژینگە دا، هاوشان لەگەڵ دیموکراسیدا هەیە. ) لە ناوەندی ساڵەکانی ( ١٩٩٠ )دا ئەم پرۆفیسۆرە هەوڵەکانی ئەمریکای بۆ گەشەدان بە ژینگە بە ( هەڵە ) و رەوشت سووك ) و ( خەتەرناك ) مەحکوم کرد. لە هەمان رێچکەوە، لە سەنتەری نیکسۆنەوە دیمتری سیمس و رۆبرت ئیلسورس، باڵیۆزی ئەمریکا لە ناتۆ، بۆچوونیان وا بوو کە ( گریمانەی ئەوەی کە بەهانی ئێمە لە ئاستی جیهاندایە، هەڵەیە، چونکە بەزەقی لە بەرچاوە کە راست نییە و کەم رەوشتە، چونکە

بۆ ئەوەیە ئەو خەڵکانەی کە رۆژئاوایی نین قایل کرێن بە دەزگەکان و کولتوری رۆژئاوایی، خەتەرناکە چونکە بەرەو جەنگ ڕەوت دەکات.

لە یەکەم سەرنجدا، سکالای واقعییەکانی ئەمڕۆ وردبوونەوەیەکی کەمی پێوە دیارە وەك لە پێشینەکانیان. لە دوای هەمووی، داوای دیمۆکراسی جیهانی، نەدەبوایە بە کردەوە و ئەزموون بسەلمێنرایە و ئەگەریش مەزهەبی نموونەیی وەك لغاو کاری بکردایەتە سەر ئیشی ماقووڵ. بەو شێوەیە بوو واقعییەکان هەڕەشەی چەکی ناوکی لەناوبەریان هەڵدەسەنگاند. ئەمڕۆ بە لەناوچوونی یەکیەتی سۆڤێت و رەوتی خێرای دیمۆکراسی، ئامۆژگارییەکانیان زیاتر لە مەتەڵ دەچێ. لێرەدا سەر لێ تێکدانێك بەدی دەکرێت، ئەویش مانەوەی گومان کردنە بە گەشەدان بە دیمۆکراسی لە دەرەوە دا، لە ژێر تیشکی رووداوەکانی ٣٠ ساڵەی رابردوودا. پاش ئەوە ئێمە بە چاوی خۆمان دیمان چەند دیکتاتۆرێك لەناو بران لە لایەن هێزە دیمۆکراتییەکانەوە لە چەند شوێنێکدا کە لەوە نەدەچوو گۆڕانکاری تێدا روو بدات وەك فلیپین، ئەندەنوسیا، چیلی، نیکاراگوا، پاراگوای، تایوان، کۆریای باشوور، گۆڕانی رژێم لە شوێنێکی وەك عێراقدا، چۆن دێتە بەرچاوی تۆباوییەکان؟ ئەی تۆباوییەکان چۆن کار لەسەر رووخاندنی پارتی کۆمۆنیست لە چین دەکەن؟ لە پاش ڕماندنی ئۆلیگارخی* دامەزراوی گەلێك بەهێزتر لە یەکیەتی سۆڤێت؟ ئایا بە راستی واقعییە ئێستە لە دوای ئەو گۆڕانکارییە دیمۆکراتییانەی کە بە ڕادەیەکی بێ وێنە لە ٣٠ ساڵی رابردوودا لە جیهاندا هاتەدی، واز بێنن؟

---

* ئۆلیگارخی: بە حوکمی مەرکەزی تاقمێکی بچووك دەووترێت وەك فەرماندەی حیزبی شیوعی لە یەکیەتی سۆڤێت. وەرگێڕ

## بەشی نۆیەم
## لە ئیزدیواجییەتەوە بۆ پێشڕەویی
## From Ambivalence to headship

دوا ستوونی فەرمایشتەکەی بۆش کە لە هەمووی وروژێنەرترە: ( لە ئەستۆگرتنی شکۆمەندی ئەمریکایە، داکۆکی کردن لەسەر ئەوەی کە پێویستە ئەمریکا رێگە لە دوژمنە شاراوەکانی بگرێت، نەوەک لە ئاستی هێزی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا زاڵ یان هاوسەنگ بن. ) ئەمەش هەڵەداوانێکی بە درێژایی کەنارەکانی رۆژهەڵاتی ئەمریکادا هێنایە کایەوە.

هیندریك هێرتسبێرگ لە نیویورکەردا نوویسیویەتی: ( بۆچوونەکەی کە لە دۆکۆمێنتەکەی بۆشدا هاتووە، ئەو بۆچوونەیە کە پێی دەوترا " زاڵبوون بەسەر جیهاندا " کاتی خۆی پێمان وا بوو کە ئەمە خواستی یەکیەتی سۆڤێتە. ) هێرتسبێرگ توانیویەتی بە یەك رستە ویلایەتە یەکگرتووەکان تاوانبار بکات و یەکیەتی سۆڤێتیش بێ تاوان. ئەوەی لە بنەڕەتەوە ئاسایشی نیشتمانی بە تەمایەتی ئەلگۆر وتەنی : ( رێزلێنانە لە بۆچوونی باڵا دەستەکەکان. ) باشە چ هەڵەیەك لەم باڵا دەستیەدا هەیە مادام لە خزمەتی پرنسیپە گرنگەکانمان و نموونەییە بەرزەکانی دایە.

فرانسس فیتسگیراڵد لە ( New work Review of Books ) ئەم سکاڵایەی کردووە: ( ئیدارەکەی بۆش بە ئاشکرا ناکۆك بوو لەگەڵ بۆچوونەکانی سەر بە نێودەوڵەتی، کەچی جگە لە ئیدارەکەی یەکەمی ریگن، هەموو ئیدارەکانی تری دوای جەنگی جیهانی دووەم جەختیان لەسەر کردەوە. ) بەڵام ئایا ئەمە

هەڵەیە؟ دوور لە خۆ دوور خستنەوە، بۆچوونەکانی سیاسەتی ئاسایشی نیشتمانی دوای جەنگ، هەرچۆنێك بێت فەرمایشتەکەی بۆش دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو بیر و باوەڕانەی کە پێشڕەوانی سیاسەتی ئەمریکا لە کاتە هەرە سەرکەوتووەکانیاندا پەیڕەویان دەکرد. ئەم سەردەمە کە لە ساڵی ١٩٤٧ ەوە دەستی پێکرد، کاتێ کە هاری ترومان، لە وتاری کۆنگرێسدا ڕێگەی دا بە ( دەست نیشان کردنی ڕژێمە تۆتالیتارییەکان کە زۆر خۆیان بەسەر گەلە ئازادەکاندا سەپاندووە، کە شەڕەنگێزی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆن و دەزگەکانی ئاشتی جیهانی دەخەنە مەترسییەوە، لێرەوە ئاسایشی ویلایەتە یەککگرتووەکانیش دەکەوێتە بەرهەمان مەترسی. لە بەرگری کردنی ئەم سەردەمە تازەیەدا. بۆش، چۆن وەك ترومان لەمەوبەر هاتەوە سەر زمانی ئەمریکی ( سەر بەهەڵاوێردن* ) بۆ داکۆکی کردن لەسەر ئەوەی ( پێداویستییەکانی ئازادی بە سەرجەمی پەیڕەو دەکرێ ) لە لایەن هەموانەوە و ویلایەتە یەککگرتووەکان دەبێت گەشە بەم پێداویستیانە بەبێ ماندوو ناسین بدات. هەر وەك چۆن لە ١٢ ی مارتی ١٩٤٧ دا ترومان فەرمایشتێکی کە بەناوی خۆیەوە بوو خستەڕوو ، بەڵێنی دا بە ڕوو بە ڕوو بوونەوەی فراوان بوونی سۆڤیێت لە هەر شوێنێکدا بێت لەگەڵ تەشەنەدان بە سەربەستی، هەر ئاواش لە یەکی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٢ دا، بۆش فەرمایشتێکی خستە ڕوو کە بەناوی خۆیەوە بوو، بەڵێنی دابوو هێرشی دەست بەجێ بکاتە سەر هەر مەترسییەك لە هەر کوێوە سەرهەڵبدات و گەشە بە سەربەستی بدات. سەرۆکێك باوەڕی بە سیاسەتی ( ئیحتیوا ) بوو ئەویتر بە پەلاماری دەست بەجێ، بەڵام فەرمایشتی هەردوو سەرۆك ترومان و بۆش، خاوەنی ئامانجی هاوبەش بوون. هەردووکیان پێشنیاری " نەخشەڕێی " یاسایان بۆ پێشڕەوایەتی

* واتە خۆ بە جیاواز زانین یان ( Exceptionalism ). وەرگێڕ.

ئەمریکا داناوە، کە پشت دەبەستن بە دەستەڵاتی ئەمریکا و هەوڵدان بۆ بڵاوکردنەوەی نموونەییەکانی. لە راستیدا، لەناو دێڕەکانی هەردوو فەرمایشتەکەدا گەڕانەوەیەك بەدی دەکرێت بۆ ئەو بنەمایانەی کە ئەمریکای لەسەر بنیادنراوە و لە پێش جەنگی ساردیشدا پەیڕەوی کراوە. کۆندالیزا ڕایس دەڵێت: ( ئەمە هەر ساتە وەختی مەترسی کوشندە نییە، بەڵکو ساتی هەلی مەزنیشە،کاتێکە لە نێوان ساڵی ١٩٤٥ بۆ ساڵی ١٩٤٧ دەچێت. کاتێك کە فەرماندەی ئەمریکی ژمارەی دەوڵەتە ئازادەکان و دیموکراتەکانی زیاد کردووە – خاوەن دەستەڵاتە مەزنەکانی وەك ژاپۆن و ئەڵمانیا – ی تێدا بوو، بەمەش هاوسەنگییەکی تازەی هێز بە هێز هێنرایە کایەوە، کە لە بەرژەوەندی سەربەستیدا بوو. ) ئەوا وەك ئەمریکییە هۆشیارەکانی دوای جەنگی جیهانی دووەم، کە بە باشیان نەزانی پاشەکشێ بکەن لە مامەڵە کردنی نێودەوڵەتییان و چاوەڕێی قووت بوونەوەی ئەڵمانیای نازی تازە بکەن. بەم شێوەیەش تیمەکەی بۆش دەرکی بەوە کرد کە دوا بە دوای یانزەی ئەیلوول دەبێت شێوە شێوازکردنێکی بارودۆخی جیهانی بگرێتە دەست کە بتوانرێ بەربەستی لە مەترسی داهاتوو بکرێ لە هەر شوێنێکەوە بێت بەبێ دواکەوتن.

جاروبار لە یادمان دەچێ کە پلانەکانی سەرەتای ساڵانی ١٩٤٠ کە سیاسەتمەدارانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی دایان ڕێژا بوو، بۆ لە قەفەسدانی یەکیەتی سۆڤێت نەبوو، چونکە هێشتا هەندێکیان بە هیوای ئەوەن کە سۆڤێتییەکان ببنە هاوبەشمان. ئەم سیاسەتمەدارانە زیاتر سەیری رابردوویان دەکرد، چۆن ئەو بارودۆخەی پێشو بوو بە هۆی کارەساتی پێکدادانی جیهانی. ئامانجیان وا بوو کە نزامێکی نێودەوڵەتی ئەوتۆ بخوڵقێنن کە سەقامگیرتر بێت وەك لەوەی ساڵی ١٩٣٩ کە تەقییەوە. جۆرە سیستەمێکی ئابووری کە ئارامی بگەیەنێت بە هەموو جیهان لە رێگەی پەرەپێدان و بازرگانی ئازادەوە، هاوشانیش

بێت لەگەڵ دانانی چوار چێوەی ئاسایشێکی نێودەوڵەتی، کە زیاتر لەسەر ئەو راستییە بنجی داکوتی بێت کە دەستەڵاتی ئەمریکی ببێتە بەردی بناغەی دانانی قەبارەی نزامی جیهانی. بە هەرحاڵ لەم چوار چێوەیەدا بە زۆری پشتیش بەوە بەسترا بوو کە یەکیەتی سۆڤێت هاوشان بێت لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا و کاری هاوبەشی بۆ دارشتنی ئەم جۆرە نیزامە بکات.

کەسانی وەك جیمس فۆرێسیتال و دین ئەیکسۆن باوەڕیان وا بوو، کە ئەمریکا وەك پێشڕەوی جیهان جێگەی بەریتانیای مەزنی گرتۆتەوە. وەك فۆرێسیتال لە ١٩٤١ دایناوە ( ئەمریکا دەبێت ببێت بە دەستەڵاتی زاڵبووی سەدی بیستەم. ) هێنری لوس لە جیاتی هەموو دەست ڕۆشتووەکانی ناوەوە و دەرەوەی ئیدارەکەی ڕۆزڤێڵت دەدوا کاتێك داکۆکی لەسەر ئەوە دەکرد کە ( نەك هەر بردنەوەی جەنگی دژ بە ئەڵمانیا و ژاپۆن کەوتۆتە ئەستۆی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بەڵکو ئەوەشی لە ئەستۆیە کە نزامێکی رەوشت بەرزی نێودەوڵەتیش ساز بدات، تا بتوانێت پرنسیپەکانی ئەمریکا بڵاو بکاتەوە – لەگەڵ ئەرکی پرۆژەی دوورخستنەوەی تارمایی جەنگی جیهانی سێیەم – ئاوا بۆچوونێك لە بەڵگەنامەکەی ڕۆزڤێڵتدا زۆر بە وردتر لە خوڵقاندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٥ دا رەنگی دابووەوە.

بەم شێوەیە، تەواو پێش ئەوەی یەکیەتی سۆڤێت وەك بەرەنگارێکی مەزن بوو و ئاسایش و پرنسیپەکانی ئەمریکا بێتە کایەوە. فەرماندەرە ئەمریکییەکان گەشتبوونە ئاکامێك کە بە پێویستیان زانیوە ویلایەتە یەکگرتووەکان بەربەستی شەڕەگێزی لە هەموو جیهاندا بکات، شەڕەنگێزی هەر کەسێك بێت، ئەمەش لە پێناو بنیادنانی جیهانێکی پڕ لە ئارامی. لە راستیدا لە ساڵانی جەنگدا زیاتر خەمخۆری قووتبوونەوەی ئەڵمانیا و ژاپۆن بوون زیاتر لە سۆڤێتییەکان. جۆن

لویس گادیس کورتەی بۆچوونەکانی ئەمریکی لە سالآنی نێوان ١٩٤١ – ١٩٤٦دا، بەم شێوەیە کورت کردۆتەوە:

سەرۆکی ئەمریکا و راویژکارە سەرەکییەکانی سوورن بوون لەسەر پاراستنی ویلایەتە یەکگرتووەکان دژی هەر جۆرە خەتەرێك کە لە پاش بردنەوەی جەنگ رووبەرووی ئەم ولآتە ببێتەوە، بەلآم هۆشیارییەکی تەواویان نەبوو بەرانبەر ئەوەی ئەم مەترسییانە چی بن و لە کوێوە سەردەردەکەن. بیرکردنەوەیان لە ئاستی ئاسایشی پاش جەنگ، زیاتر بوو نەك تایبەت.

هەندێك کارمەندی فەرمی دەستڕۆشتوو، زیاتر لە ژێرباری ئەو بە هەڵەداچوونەدا بوون کە گوایە ( ئاسایشی هەمە لایەن ) و نەتەوە یەکگرتووەکان شایەنی ئەوەن پشتیان پێ ببەسترێت بۆ پاراستنی ئاشتی. لە سالّی ١٩٤٥دا هاری ترومان جاڕی داوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆتە ( یەکێك لە هەرە هێزە دەستەلآتدارەکانی سەر ڕووی زەوی ) و ئەرکی ئێستەی ئەوەیە ( وەك خۆی بهێڵرێتەوە ) بۆ ئەوەی ( جیهان بە بەرەو ئاشتی و خۆشگوزەرانی بەرێت. ) ترومان ئەوەشی خستە ڕوو کە ( ویلایەتە یەکگرتووەکان سەرقافڵەیی جیهانی بە دەست هێناوە کە بە تەنها پابەندی سوپاکەمان و هێزە دەریاییە نەبەردەکەمان نییە. ) بەلآم نیازی وا بوو، سەرەڕای ناردنەوەی سەربازەکان بۆ ماڵی خۆیان کە ( ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك مەزنترین هێزی سەر رووی زەوی و دەریایی بهێڵێتەوە و هێزی ئاسمانیش وەك بە تواناترین هێزی جیهان ڕاگرێ. ) ترومان وتووشیەتی: ( ئەمریکاییەکان هێزی سەربازییان بە تەنها بۆ ئەوە بەکاردێنن کە ئاسایشی جیهانی پێ سەقامگیر بکەن، چونکە ئێمە پێمان وایە کە ئاسایشی ئێمە پا بەندە بە ئاسایشی جیهانەوە. )

نکوڵی کردن لە ڕادەی خەرجی سەربازی و خۆ دوورخستنەوە لە ئامادە باشی پێویست بۆ قەبەکردنی هێزەکان بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستانە بوو، بەهۆی

پاشه کشێی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، راستەوخۆ دوای جەنگ. بەڵام ڕایەڵ کردنی پەردە ئاسنینەکەی ستالین و هەڵگیرساندنی جەنگ لە کۆریا، خەوی لە ئەمریکا تێکدا و پێویستی دانانی سیاسەتێکی پتەو و پێشکەوتووی دەرەوەی بە ئاگا هێنا، بەڵام کاتێك کە ویلایەتە یەککگرتووەکان بە خێرایی روو بە رووی ئەم بەرەنگارییانە بووەوە. زرنگییەکی رەچاونەکراو لە کاتی گواستنەوە دا، لە ساڵەکانی کتوپڕی دوای جەنگ بۆ دەستپێکی جەنگی سارد. ئامانجی ئەسڵی گەشەدان و پاراستنی نزامێکی جیهانی لایەق کە بە ئامانجی بەرەنگاربوونەوەی دەستەڵاتی سۆڤێتەوە، ویلایەتە یەککگرتووەکان جۆرە سیاسەتێکی گونجاند. کە ئەگەر بەرەنگاری سۆڤێتیش ڕووی نەدایە، ئەوا ئەمریکا رۆڵی خۆی هەر دەبینی، واتە ڕۆڵێکی گەورەی لە ئەورووپا و ئاسیا و رۆژهەڵاتی ناوەراستدا دەبینی، نەریتە بنەماییەکانی هەڵسوکەوتی نێودەوڵەتی دەگرتە خۆی و گەشەی دەدا بە چاکسازی دیموکراتییەت لە هەر شوێنێك بووایە لەگەڵ پێشخستنی پرنسیپەکانی ئەمریکا لە دەرەوە دا. هەموو ئەم نموونەییانە بوونەتە هاوبەشی لە گەڵ ستراتیژی لە قەفەسنانی ( ئیحتیوا ) یەکیەتی سۆڤێت، هەر ئەم نەریتانەش ئاوێتەی ستراتیژی ئەمریکی بوون لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا.

ئەگەر شتێك لە بابەت گەڕانەوە بۆ کاتی رابردوو لە فەرمایشتەکەی بۆشدا ئاماژەی پێکرا بێت، ئەوەیە کە میونخ نەك ڤێتنام، بوو بە هۆی هۆشیار کردنەوە و بیرهێنانەوەی ( گومڕا بوونی دەستەڵات ) وە خەتەری دادوەری کردنی خەڵکانی تر. لە ساڵی ١٩٥١ دا سەرۆك ترومان لە وتاری روون کردنەوەی بەشداری بوونی ویلایەتە یەککگرتووەکان لە جەنگی کۆریا دا، داکۆکی لەسەر ئەوە کرد ئەگەر هاوپەیمانەکان لە ساڵانی ١٩٣٠ دا ( سیاسەتی شیپاویان جێ بەجێ بکردایە ، ئەگەر وڵاتە ئازادەکان بە یەکەوە کاریان بکردایە بۆ تێکشکاندنی شەڕ فرۆشتنی دیکتاتۆرەکان، ئەگەر لە کاتی دەست پێکردندا و کاتێ کە شەڕەنگێزییەکە هێشتا

پەرەی نەسەند بوو، لەوانەیە جەنگی دووەمی جیهانی هەر رووی نەدایە. ئەگەر مێژوو شتێکی فێر کردبێتین، ئەو شتەش ئەوەیە، دەست درێژی کردنە سەر هەر شوێنێکی جیهان دەبێتە مەترسی بۆ سەر ئاشتی هەموو جیهان. ) هەروەها ئەمڕۆش، سیاسەتمەدارانی ئەمریکا دەبێت لە هەمان هۆ کەڵك وەربگرن، واتە: هەتا زوو بکەی درەنگە. وەزیری بەرگری، رامسفیلد لە چاوپێکەوتنێکی ساڵی ۲۰۰۲ دا وتی: ( هیتلەر چی بویستایە باسی دەکرد.) بەلای رامسفیلدەوە ( هەتا زووتر بوەستێنرایە ... کەمتر زیانبەخش دەبوو، کەمتری تێ دەچوو. )

ئەگەر فەرمایشتەکەی بۆش هەندێ لە خاڵەکانی سیاسەتی ئاسایشی نیشتمانی بخات بە لادا، هەر لەبەر ئەوەیە ئەم فەرمایشتە بە یەکجاری خۆی لە میراتەکەی ڤێتنام دوور دەخاتەوە. لە پرۆفایلێکی تازەی نیوزویکدا " لە بابەت دونالد رامسفیلدەوە و تا رادەیەکیش لە بابەت فەرمایشتەکەی بوشەوە، شتی سەرنج راکێش دەخاتە روو: رامسفیلد وەچەی سات و جیلێکە کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە رۆژگیراندا بوون، بەڵام روخسار و هەڵوێستی کاردانەوەیان لە بۆچوونەکانی حکومەتی ئێستەی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەیە. وتارەکە بەم شێوەیە بەردەوامە: ( بڕیاری ئەگەری پەلاماردانی عێراق لە قۆناغەکانی ژیانی پێشتر و ئەزموونی رامسفیلدەوە بەدی دەکرێت و پێکدادانی نێوان بەهاکانی مەزنترین جیل و کۆنە سەربازی جەنگی سارد و ( BABY BOOMERS )* کە هاتنەسەر حوکم لە پاش ۆتەرگەیت* و ڤێتنام ) پرۆفایلەکە تێبینی هنری کیسنجەر دەگرێتە خۆی کە دەڵێت: ( رامسفێلد هەوڵی گەڕانەوەی ئەرکی سەربازی و بەرپرسیارێتی

---

* زیادکردنی منداڵ بوون لە دوای جەنگی جیهانی دووەم.

* ۆتەرگێت: شەرمەزاری تەزویر کردنی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ۱۹۷۲ بوو، کە لە ئاکامدا نیکسۆن ناچار کرا وەك سەر کۆکاری ئەمریکا واز لە حوکم بهێنێت. وەرگێڕ.

بۆ زاڵبوون بەسەر هەڵوێستی جیلی ڤێتنامدا داوە، هەڵوێستی ناهەمواری پەککەوتەیی. )

ئەم هەڵوێستانە یەکیەتی سۆڤێتیان لە مردن ڕزگار کرد. لای چەپەوە، لەوێوە نووسەر نۆیمی ئیمری ئەم تێبینییەی داوە: ( هەمیشە هەر ساڵی ١٩٦٨، شەوی ڕەشی ڕۆحیانەتی ئەمریکییە. ) ڕەنگدانەوەی ڤێتنام لە کاتی پرۆسەی گەردەلوولی بیاباندا و لە کاتی ئیدارەی کلینتۆنیشدا بەدی دەکرا. هەروەك کۆنە جەنگاوەرەکانی هەڵمەتی ماك گۆڤەرن پەنجەی خۆیان لە بابەت دوپات کردنەوەی هەڵەی ڤێتنام لە بۆسنیا و کۆسۆڤۆ دەگووشی ، تا ئەو ڕادەیەی خاوەن ئەزموونی ڕێگەچارەی دبلۆماسی بەڵقان ریچارد هولبرووك بەناچارییەوە بڵێت: ( بۆسنیا، ڤێتنام نەبوو، سربییەکان ڤێتکونگی نەبوون و بەلگراد هانۆی نەبوو. ) خێوەکەی ڤێتنام تا ئەمڕۆ لەم ناوە ماوە، لە چاوپێداخشانەوەی کتێبەکانی نیویۆرکدا ئەنتۆنی لویس نووسیویەتی: ( بەردەوام بیرم لە یەك شت دەکردەوە، ڤێتنام! ) ئەمە لە دەنگدانەوەی ناڕەزایەتی جەنگی کەنداو بوو، دە ساڵێك لەمەوبەر کە دەیووت: ( عێراق وڵاتێکی گەورە و هاوچەرخە، بە چڕی خاوەنی شارستانییەتە، ئەگەر ئێمە بە بۆردومان لەت لەتی بکەین، ئایا ئێمە ئەوەندە عاقڵ دەبین کە پارچەکانی بنێین بە یەکەوە. )

لای ڕاستەوە ستراتیژی نیکسۆنی بۆ خۆ دوورخستنەوە لە ڤێتنامێکی تر بە تەرکیز کردنەسەر بەرژەوەندییە گرنگەکانی ویلایەتە یەککگرتووەکان هەتا ساڵانی ١٩٩٠ بەردەوام بوو. جۆرج ۆکەر بۆش سکاڵای هاوشێوەی میونخی دەکرد، تەنانەت سەدامی بە هاوشێوەی هیتلەر دادەنا. وا بەڵێنی دەدا کە ئەو لە ( ڤێتنامەوە فێر بووە و بەپێی ئەوەش جەنگی کەنداوی ساز کرد — ڕاشی وەستاند — و هەر ئەوەندەی " بەرژەوەندی گرنگ " کە نەوتی کوەیتە زامن کرا، بە هەزارەها عێراقی بەجێهێشت بۆ ئەوەی قەتڵوعام بکرێن لە لایەن ئەو ( هیتلەر )ەی

كە ویلایەتە یەككگرتووەكان بڕیاریدا لەسەر دەستەڵات بمێنێتەوە. دوایی بە خۆهەڵكێشانەوە وتی: ( كۆنیشانەی ڤێتنامممان، بۆ هەتا هەتایە بە شەق لەناو برد. ) بەڵام ساڵێك بە سەردا تێنەپەڕی ( بۆش دەستێوەردانی گۆریلای بۆسنیای ڕەت كردەوە. ) وە وتی: ( ئێمە بەسمانە. ) و تەنانەت جۆرج دەبلیو بۆش، لە كۆنگرەی كۆماری نیشتمانی ساڵی ۲۰۰۰ دا ئامۆژگاری ئامادەبووانی كرد ( كە وانەكانی ڤێتنام لە یاد نەكەن. ) بە تەنیا هەر سیاسییەكان نین كە بە كۆنیشانەی جەنگی ڤێتنامەوە دەناڵێنن. دەزگەی سەربازی ئەمریكا، كە ڕامسڤێڵد سەرۆكایەتی دەكات، هێشتا پێویستی بە چاك بوونەوەیە لەو جەنگە. ستراتیژناس، ئیلیۆت كۆهین ڕوونی دەكاتەوە كە ( ڤێتنام، بۆتە شانۆی ڕەوشتی دەزگەكانی بەرگری، بۆتە چیرۆكی هێنانەوەی مەدەنییەت، دەستەمۆ كردنی سەربازی و تا ڕادەیەكیش خوڵقاندنی كارەسات. ) وانە بیرۆكراتییەكانی ئەم شانۆگەرییە ( ڕەوشتییە ) لە لایەن و زیری بەرگری ئیدارەی ڕیگن، كاسپەر واینبرگەرەوە، بۆ یەكەمجار دەستی پێكرد. كە بە ڕوونی سیستمێكی پێوانەی سنووردار كراوی بۆ بەكارهێنانی هێز ئاشكرا كرد. كۆڵن پاوڵ، دواتر، بە ڕێزلێنانەوە خستیەناو فەرمایشتەكەیەوە، كە بەناوی خۆیەوە ناسراوە. فەرمایشتەكەی پاوڵ زیاتر ئەوە دەگرێتە خۆی چۆن بجەنگین؟ هەروەها كەی بجەنگین؟ بە تایبەتی لە پێناو ( بەرژەوەندی گرنگ )دا نەك ( هۆكاری نیوە ناچڵ ) وەك ( بنیادنانی نەتەوە ) و ( سۆزی مرۆڤایەتی ) یان هەر شتێك كە خێوەكەی ڤێتنام لە خەو بەخەبەر بكاتەوە. پاوڵ بەم شێوەیە فەرمایشتەكەی كورت دەكاتەوە: ( ئایا بەرژەوەندی وڵات كەوتۆتەبەر مەترسی؟ ئەگەر وەڵامەكە بەڵێیە، بڕۆ بۆی) ئەمە لەوانەیە بەشی خۆی ماقول بێت. پاڕانەوەی فەرمایشتەكەی پاوڵ و ئەو جەنگەی بوو بە ئیلهامی ئەم فەرمایشتە، هەر چۆنێك بێت، نەیاری گەورە ژەنەڕاڵەكانی ئەمریكایان پیشان دەدا. لە زۆربەی زۆری ئەو دەستێوەردانانەی ویلایەتە یەككگرتووەكاندا لە وڵاتانی تر، لە سەردەمی پاش

جەنگی سارد دا، لە عێراق و بۆسنیا و کۆسۆڤۆ و عێراق سەر لە نوێ. پاوڵ لە بایۆگرافەکەی خۆیدا، لە بابەت پێکدادانەکانی سەرۆەختی کلینتۆن نووسیویەتی: ( لە هیچ کام لەم قەیرانە بیانیانەدا، بە قەدەر ئەوەی کە دوای داگیر کردنی کوەیت و مەترسی بڕینی نەوتی عەرەبی سعودی، ئاوا بەرژەوەندییەکانی ئێمە نەکەتۆتەبەر مەترسییەوە. ) گۆێی مەدەرێ، پاوڵ بۆ خۆشی نکوڵی لە بەشداری بوونی جەنگی کەنداو دەکرد. لە رووی ڕەوانبێژییەوە فەرمایشتەکەی پاوڵ لەوە دەچێت پتەو بێت، لە رووی جێ بەجێ کردنەوە، قابیلی کار نەکردنە.

کاتێك بە بەرانبەر ڤێتنام حوکم دەدرێ و دەپێورێ، ویلایەتە یەککگرتووەکان هەمیشە دووچاری پاشە کشێ دەبێت. بۆ ئەمەش هۆیەکی سادە هەیە: سیاسەتمەدارەکانی ئێمە لەوانەیە بە هۆی وانەکانی ڤێتنامەوە زۆریان لەباردا نەما بێت، بەڵام باقی جیهان بە پێوەرەکانی میونخ ڕۆڵ دەبینن. لێرەوە، کاتێك نیکسۆن و کیسنجەر، دوایَ بە دوای ڤێتنام، جیهانی سێیەمیان دەخستەوە باری کشوماتی. مۆسکۆ دوو ڤات هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی نفوزی خۆی لە ئەفریقا و رۆژهەلاتی ناوەراست و رۆژهەڵاتی ئاسیا بەرفراوانتر بکات. لە کاتێکدا کە سەرۆك کارتەر، بە وانەی ڤێتنام تەمێ بوو بوو، نەیدەویست ویلایەتە یەککگرتووەکان ( دەستێوەردانی ناوخۆی هیچ وڵاتێك بکات. ) یەکیەتی سۆڤێت سەرقاڵی غەزووی ئەفغانستان بوو و بریکاری لە ئەمریکای ناوەراست دادەمەزراند. وای دادەنێن کە ویلایەتە یەککگرتووەکان تەواو عەسابی لە دەست دابێت، لەوانەیە هەردوو سەدام حوسین و میلۆسۆفیچ کەڵکیان لە شەرعی رووداوی ڤێتنام وەرگرتبێت و وایان دانا بێت کە ئەمریکا لە شەڕ فرۆشتنیان بەهەند وەرناگرێت.

لە راستیدا، پێوەری ڤێتنام وەك دەلیلێ بۆ ئەوەی چ کاتێك هێز بەکاربهێنرێت لە دوای جەنگی ساردەوە، وا دەرکەوت کە بێ سوود بێت. لە گەلێ رووداو دا، ئەوەندەی " چەپ " سوور بوون لەسەر دانپیانانی ئەوەی لە نێوان

رەوشت بەرزی و کۆمەڵکوژیدا، نیزام و بەرەڵایدا وەستاوە، هێزی ئەمریکایە. خۆگرێدانی تەواو بە وانەکانی ڤێتنامەوە، واتە: ( نەناردنی هێزی ئاشتی پارێز، لێنەدانی ئاسمانی کاریگەر، دەستتێوەرنەدان ئەگەر بۆ کاری مرۆیش بێت – بە کورتی هیچ پرۆسەیەك کە لە بەرژەوەندی خۆ- بەدەر بێت، نابێت ئەنجام بدرێت. لە ئاستی کۆنزێرڤەتیڤەکانیشەوە کە لە جیهانی ئەمڕۆدا جێگەی نەدەبووەوە و پێناسە کردنی ( بەرژەوەندییە گرنگەکان ) بە واتای بیرەکانی نەوت و ڕاڕەو و کەناڵەکانی دەریا دێت. بە پێی هەڵسەنگاندنی سیاسەتی فەرمی، تەرجوومە کردنی بە واتای ڕەشمە داماڵینی فەرماندەیی ئەمریکا دێت. بۆ نموونە کاتێك کە ئەمریکا نەیوویست لاقەی قەیرانی مرۆیی بۆسنیا بکات، ڕاستەوخۆ سەقامگیری ئاسایشی هاوپەیمانەکانی ئەتلانتیکی دەکەوتنەبەر هەڕەشەوە، کە ئاسایشی هەر یەکێك لەم وڵاتانە، یەکێکە لە هەرە گرنگترین بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا. لەوانەیە واقعییەکان پێیان ناخۆش بێت، بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە بە ئامانجەی ( دوولایی دەرگە ) ی سیستەمی نێودەوڵەتی و کاتێك مەلوولانە دەکەوتنە رووی هەڕەشەی ئەو سیستەمە، نیزامی نێودەوڵەتی بە خێرایی مۆلەق دەبوو. لە مێژووی ئێستەی ئەمریکادا، زیاتر بێ دەنگی، نەك هەڵچوون بۆتە هۆی کێشەی زۆرتر و مەترسی گەورەتر.

وەك جەنگاوەرە سستەکانی پێش ڤێتنام، ئەندامی تیمەکەی بۆش بەوەیان زانی کە هەنووکە ئەزموون و هەلی باش دەخاتە ڕوو، بە بۆچوونی ئەوان دەبێت یەکاویەك دوو نیشانە بپێکرێت: یەکەم گەشەدان بە نیزامی جیهانی سەر بە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و پرنسیپەکانی، دووەم بەرهەڵستی دژی تەگەرەی ڕاستەوخۆ و مەترسیدار، کە ناهێڵێت ئەم نیزامە بە دەست بهێنرێت. بە چەند وشەیەکی تر، جەنگی نائاسایی دژی تیرۆریزم، سیاسەتی تەقلیدی دەرەوەی ئەمریکا بێ تاوان ناکات لە بەدەستهێنانی ئامانجەکانیدا. میشێل فلورنۆی کە

راوێژکاری باڵای سەنتەری ستراتیژی و توێژینەوەی نێودەوڵەتییە دەڵێت: ( ئیدی ئێمە ناتوانین وا بە ئاسانی بیر لە ئاسایشی نیشتمانی بکەینەوە لە ڕێگەی پاراستنی هاوپەیمانەکانمانەوە و پاراستنی بەرژەوەندییەکان لە دەرەوەی وڵات. ) ( دەبێت ئێمە زۆر بە جدی ئاگامان لە پاراستنی ماڵی خۆمان بێت. ) ئێمە ئەمە دەکەین. بەڵام ئەمە زۆر بە زەحمەت ئەمریکا دوور دەخاتەوە لەوەی بە ئەرکەکانی خۆی بۆ پاراستنی تایوان هەستێت دژی چین، لە پاڵپشتیکردنی ئیسرائیل و هاوپەیمانەکانمان لە ئەوروپا و ئاسیا دا و بۆ پاراستنی بنەما ئەمریکییەکان لە دەرەوەی وڵات. بە ئاگا بوونمان لە چەمکە بەرفراوانەکانی سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان زیاتر لە جاران دەمانخاتەبەر هەڕەشە ئاساییەکان، کە ئێمە تا ڕوودانی ( ١١ ) ئەیلوول سەرقاڵی بووین.

ڕووداوەکانی دوای ( ١١ ) ی ئەیلوول، ئامانجە بنەماییەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی وریا نەکردەوە. بە پێچەوانەوە، جەنگی ئیدارەی ئەمریکی دژی تیرۆر بە ( چوارگۆشەیی ) کەوتە نێو ستراتیژی کۆنی ئەمریکییەوە. هەر لە جەوهەریەکانیشدا کاردانەوەش بۆ هیچ شتێك نییە، جگە لە دەرك کردنی ڕاستییەکان نەبێت بە شێوەیەکی سادە. کەیف خۆشی ڕەخنەگرانی ئیدارەی بۆش لەوەدایە کە ڕەوشتی ئەمریکا لە جیهاندا دەکەوێتە دەرەوەی شکۆمەندی گۆی زەوییەوە. ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵوێستێکی بێ پێشینەی دەستەڵات و کارتێکردنی لە جیهاندا گرتەخۆی، بە پێوەری ترادسیۆنی دەستەڵاتی نیشتمانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە بارێکدایە کە لە ساتی حوکمداری میدیرانەوە لە لایەن ڕۆماوە تا ئێستە وێنەی نەبووە. لە هەر جیهانێکدا بێت، هێزی سەربازی ئەمریکی کورتەبنەترینە لە نێوان هێزەکانی تری جیهاندا، لە کاتی کاردانەوەی بەرهەڵستی هەڕەشەی کتوپڕدا. ئەمە لە کاتێکدایە کە بنەماکانی ڕەوشتی ئابووری، کە سەرمایەداری لیبراڵییە و بازرگانی ئازادە، لە لایەن جیهانەوە بە باشترین مۆدێل

پەسەند کراوە بۆ سامان بەدەستهێنان و ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ناوەندی نیزامی ئابووری نێودەوڵەتیدا جێی خۆی خۆش کردووە. هەروەها رەوشی سیاسی لیبڕاڵی دیموکراتی ئەمریکی بە کیشوەرەکاندا بڵاو بوونەتەوە. بنەماکانی سیاسەتی لیبڕاڵ دیموکراتی ئەمریکی لەناو وڵاتانی کیشوەرەکاندا و لەناو گەلێك کولتوردا بڵاو بۆتەوە. لە کاتێکدا خەڵکانی تر، سەرقاڵی میتۆدی " ئۆتۆکرات " ین لە شێوە حوکمیاندا. کەمێکیش دان بە چاکەی ئەمریکادا دەنێنن لە بواری ماف و ئازادی تاکە کەسدا.

لەمەش زیاتر جیاواز لە هێزە ئیمپریالیەکانی پێشوو، ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان پاکس ئەمریکانایەکی خوڵقاند بێت ئەوا نەلەسەر داگیرکردنی کۆلۆنیالی یان لەسەر فراوانکردنی قەبارەی ئابووری بنیادی نەناوە. سەرۆك بۆش لە وتاری کۆلێژی سەربازی ویست پۆینت وتی: ( ئەمریکا ئیمپراتۆرییەتی نییە تا بەرفراوانی بکا و ناشییەوێت ئۆتۆپیا (تۆباوییەت ) دامەزرێنێت. ) هەر ئەوەندەیە ئەمریکا بە پیاوچاکێتی خۆی نیزامی ئەمڕۆی جیهانی راگیر کردووە. بۆ دڵنیایی، بەچاودێری هێزی ئەمریکا و بەهۆی پێشبڕکێ و پێزانینەوە لە هەموو لایەکی جیهاندا، نموونەییەکانی ئەمریکا بە راستی جیهانی بوون. لە ئاکامدا، کاتێك کە تەنیا زلهێزی جیهان خۆی ئاوێتەی نەریتی رەوشتی نێودەوڵەتی دەکات – بۆ دیموکراسی، بۆ مافی مرۆڤ، دژی دوژمنایەتی، دژی بڵاو بوونەوەی چەك – ئەمانە واتای ئەوەیە کە بەرەنگاری سەرکەوتووانە لە ئاستی دەستەڵاتی ئەمریکادا بە بێ گۆڕان هەموو نەریتەکانی دەستکردی ئەمریکا لاواز دەکات. – ئێمە – لە میانەی سەرۆکایەتیەوە و واز لە خۆ هێنانەوە یان لە بۆچوونی تەسکی بەرژەوەندی نیشتمانییەوە – بۆ پاشەکشێ کردن لەو جێگەیەی کە لە مێژووەوە بۆمان ماوەتەوە، ئەو هەڵچوونەی کە بە خێرایی بە دوایدا دێت بە دڵنیاییەوە دەگاتە کەنارەکانی وڵاتەکەمان. تەنانەت ئەگەر بێتو بهاتایە، سبەینێ ترسی عێراق نەمایە

هێشتا لەوە بە دەرمان ناکات کە رۆڵێکی بەهێز و چالاك لە جیهاندا ببینین. لەوەش بە دەرمان ناکات کە ئەو ئەرکانەی قەدەر خستیویەتە سەر شانمان. رەچاوی ئەو خەتەرانە بکەین کە ئێستە هەن لەگەڵ ئەو مەترسییانەی کە چاوەڕێمان دەکات و لە ئاسۆدا نادیارن، هەر ئەوەمان بۆ دەمێنێتەوە کە بەرەو ڕووی ئەم بارگرانییە ببینەوە. راگرتنی نیزامی نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی لایق و شیاو، بۆ ژیان داوا لە پێشڕەوایەتی ئەمریکا دەکات بۆ بەرگری کردن و تێکشکاندنی دیکتاتۆرە شەڕفرۆشەکان و ئایدۆلۆژییە دژوارەکان، بەهۆی پشتگیری کردنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و بنەماکانی دیمۆکراسی لیبڕاڵ، لەگەڵ یاریدەدانی ئەو کەسانەی کە خەبات دەکەن دژی ئەو شەیتانە تونڕۆیانەی کە وەك مرۆڤ خۆیان نیشان دەدەن. ئەگەر ئەمریکا واز لە شێوازی دانانی ئەم نیزامە بهێنێ، لەوە دەتوانین دڵنیا بین کە خەڵکانی تر دەخەینە شێوازێکەوە کە بە هیچ شێوەیەك نەخزمەتی بەرژەوەندییەکانمان دەکات و نەبەهاکانمان.

ئەگەر ویلایەتە یەککگرتووەکان نەبێت، کێیی تر دەتوانێت پشتگیری جوامێری لە جیهاندا بکات؟ ئەورویا؟! کە دووجار لە سەدەی بیستەمدا سەرقاڵی شەڕی براکوژی بوون، دوای ئەوەش خۆیان لە کاتی جەنگی سارد دا خستەژێر ڕکێفی ئەمریکاوە. زۆربەی ئەورووپییەکان لامدانەوەیان بەرانبەر بەرەنگارییەکانی پاش جەنگی سارد، بریتی بوو لە هەڵوێستی دەبەنگ و کفت و پەککەوتە و نەزۆك. لە بانگەشەکانی ساڵانی نەوەدەکاندا، پێشەواکانی ئەم کیشوەرە، دە ساڵەکەیان بردەسەر و نەیانتوانی مامەڵە لەگەڵ پاکتاوی رەگەزی نێو کیشوەرەکەی خۆیان بکەن، بەڵام سەفقەی بازرگانی نایابیان لەگەڵ دەوڵەتانی قۆڵبڕ و چەتەدا ئەنجامدەدا و نەشیان دەویست بودجەی بەرگری بەرز بکەنەوە بەو رادەیەی کە بگاتە ئاستی ئەوەی ببنە خاوەنی سیاسەتێکی دەرەوەی ئازاد. ئایا چین دەتوانێت ئەم رۆڵە ببینێت؟ حوکمەکەی خۆی دیکتاتۆرییە و خاوەنی ئایدۆلۆژییەکی لە کار

کەوتووی لە پەلوپۆ کەوتووە، ترس و هەراسان کردن نەبێت هیچ نابەخشێت بە دراوسێکانی. نەتەوە یەکگرتووەکان دوور لەوەی کە کیانێکی سەربەخۆ بێت، ئەم رێکخراوە پێکهاتووە لە گروپە دەوڵەتێك کە بەشی زۆریان دیکتاتۆرن و بەشێکی کەمییان نوێنەری جەماوەرن و ئەمریکا هەرچۆنێك بێت شانی داوەتەبەر ئەرکەکانی ئەم رێکخراوە لە رووی دارایی و سیاسی و سەربازییەوە.

کەواتە داواکاری دوا رۆژی مرۆڤ سیاسەتێکی دەرەوەی ئەمریکایە، کە نموونەیی، دوور لە بیانو هێنانەوە، پتەو لە رووی دارایشەوە دامەزراو بێت.ئەمریکا نابێت بە تەنها پۆلیسی جیهان بێت، یان بەڕێوەبەری پۆلیس بێت، بەڵکو بڵندگۆی رووناکی و رێ پیشاندان بێت. لەم بارەیەوە توێژەرەوەی سیاسەتی دەرەوە جۆشوا موراڤیك نووسیویەتی: ( پۆلیس ئەرکەکەی لە دەستەڵاتی باڵاترەوە بۆ دیاری دەکرێت، بەڵام لەناو کۆمەڵەی نەتەوەکاندا دەستەڵات نییە لە ئەمریکا باڵاتر بێت. ) ئەم سۆزیارییە تەنها لە ئاستی نازی نەتەوایەتییەوە نییە. ڕستییەك هەیە کە بەدیلی پێشەوایەتی ئەمریکا، جیهانێکی شڵەژاوی " هۆبسیانی *" یە، جیهانێکە بەبێ بەرگری لە شەڕفرۆشی، بە بێ دابین کردنی ئاشتی و ئاسایش، بە بێ رەخساندنی نەریتە نێودەوڵەتییەکان. ئەمەیە زلهێزی سەر گۆی زەوی، ئەمە ئەرکی بەرپرسیارێتی جیهان دەگرێتە ئەستۆ. کورت بینینە وا تێبگەیت سیاسەتی " مل کەچی " سەلامەترە یان هەرزانترە لە سیاسەتێك کە بەر لە هەڵچوونی مەترسییە تازەکان بێت. بەو شێوەیە ویلایەتە یەکگرتووەکان بە پەلە خۆی گەیاندۆتە شوێنی کێشەکان پێش ئەوەی سەر هەڵبدەن، ئەو کێشانەی کە دەبنە مەترسی سەر بەرژەوەندی نیشتمانی، ئاوا

---

* هۆبسیانی مەبەست لە تیۆری فەیلەسوف تۆماس هۆبز کە ساڵی ١٦٩١ دا دەڵێت: مرۆڤ ماق بنەمای هەیە بۆ خۆپاراستن و بەدەستهێنانی ئامانجەکانی خودی خۆی. ( وەرگێڕ )

ڕێگەچارەیان بۆ دابین دەکات، پێش ئەوەی وەك قەیران لە دەست دەرچن. سیناتۆر کەی بەیلی هوچیسۆن بۆچوونێکی ( ناسراو بەڵام بە هەڵەدا چوو )ی کە چەند ساڵێك لەمەوبەر نووسیبوی ( زلهێزێك زیاتر باوەڕ پێکراو دەبێت و کاریگەرتر دەبێت، ئەگەر بە پێوەرێکی دیاریکراو خۆی لە هەموو پێکدادانێکی ناوچەییدا بە دوور بگرێت. لە راستیدا ئەمە زۆر بە وردی ئەوەیە کە زلهێزێك خۆی لە زلهێزی بخات.

هێشتا، جێی خۆیەتی بپرسین، هەڵوێستی دەوڵەتەکانی تری جیهان بەرانبەر دەستڕۆشتنی درێژخایەنی ئەمریکا چۆن دەبێت؟ چارلس کوپچان، دانەری کتێبی " لە بابەت دوا هاتنی سەردەمی ئەمریکی، سیاسەتی ئیمپریالیزمە دەرەوەی و جیۆپۆڵیتیکی ) سەدەی بیست و یەك"، هۆشیاری لەوە دەکات کە فەرمایشتەکەی بۆش ( هەر ئاوازێکی بەجۆشی تازەی کە دەبێتە هۆی دروست کردنی ئەو شێوە هاوپەیمانییەی کە ئەم ئیدارەیە دەڵێ خۆیانی لێ دوور دەخەنەوە. ) بۆ دڵنیابوون، ئەو رژێمانەی کە نیزامی جیهانی بە پێشڕەوایەتی ئەمریکا بە مەترسی رەچاو دەکەن بۆسەر بوون و مانیان، دەکەونە دووی ڕێگەچارەیەك بۆ ئەوەی لە دەستەڵاتی ئەمریکی ببڕن و هاوپەیمانی تاکتیکی پێك بهێنن لەگەڵ دەوڵەتە سووك تاوانبارەکاندا بۆ بە دەست هێنانی ئامانجێکی هاوبەش، بۆ مۆڵەق کردنی نیزامی نێودەوڵەتی و بۆ دۆزینەوەی بارودۆخێك کە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە هاوپەیمانەکانی دابڕاو بکەن.

بە هەرحاڵ ئەمانە هیچیان سەنگێکیان نەخستە سەر مشتومڕی قایل بوون بە شکۆداری ئەمریکی، ئەمڕۆ کێشەکە کێشەی کەللە رەقی ئەمریکی نییە، ئەوە راستیەکە و سەلمێنراوە، راستی دەستەڵاتی ئەمریکییە کە لە هەموو شێوەکانیدا دەردەکەوێت. ئەوانەی لایان وایە کە وەڕس بوونی جیهانی دژی ئەمریکا بە لغاوکردنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکی لا دەچێت، خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن.

تەنانەت ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان جارێکیتر دەستێوەردانی شوێنێکی تری وەك عێراق نەکات، دەبێت بە نیشانە بۆ حەسوودی و جارس بوون، لەوانەشە جاروبار بۆ ترس، ئەمریکاییەکی دەستەڵاتداری بەرەوشت و هێشتا هەر شکۆمەندیش ئەمریکا بەس دەبێت بۆ بەرەنگاری پاوانخوازی ( طموع ) چین، ئیسلامی توندڕۆ و فەرەنسای کەم سەلیقە. ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان ئامادەی ئەوە بێت هەموو دەستەڵات و کارتێکردنێکی راستەقینەی خۆی لە خۆی دامالێ، هێشتا دەتوانێت رێگە بۆ نەتەوەکانی تر خۆش بکات تا بارودۆخێك بە دەست بهێنن کە ببێتە هاوسەنگی ئەمریکا لەسەر شانۆی جیهانیدا و هێشتاش بەرەنگاربوون و حەسوودی بردن وەك خۆی دەمێنێتەوە.

بەڵام جێگەی گومانە کە گروپێکی کاریگەری پێکهاتوو لە چەند وڵاتێك راست ببێتەوە و شان بدا لە شانی دەستەڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکان. هەموو هێرشەکانی ئەم سات و وەختەی دژ بە " زاڵبوونی ئەمریکی " پێناسەی وڵاتی هێرش هێنەر دەردەخات. هاوپەیمانانی وەك فەرەنسا لەوانەیە رەخنەی پوچەڵ لە بابەت " فرە دەستەڵاتی " ئەمریکاوە بگرێ، بەڵام هەر پابەند دەبن بە پشت بەستن بە ویلایەتە یەکگرتووەکان وەك زامنی ڕاگری نیزامی نێودەوڵەتی. بە نیسبەت روسیا و چین و جیهانی ئیسلامەوە، ئاوا پێکهاتەی گروپێکی کاریگەر بۆ کاری هاوبەش وەك هێزی یەکگرتوو، ئەگەرێکی لاوازە. مێژووی درێژی باوەڕ بە یەکدی نەکردن بەو راستییەوە ئاڵۆزاوە کە ستراتیژی هاوبەشیان نییە بۆ ئامانجەکانیان — تەنانەت ئەگەر لە بابەت ئەمریکاشەوە بێت. خۆ بە دوور گرتنی ئەم هێزانە و هێزەکانی تر بۆ یەکگرتن دژی ویلایەتە یەکگرتووەکان، دیسانەوە بەستراوە بەو راستییەوە کە ناتوانن بە خۆپەرستی و بەرژەوەندی تەسك خزمەتی وڵاتەکانیان بکەن، بەڵام بەدڵنیاییەوە بەرژەوەندی خۆیان لە میهرەبانی نیزامی نێودەوڵەتیدا دەدۆزنەوە.

ئایا ئەرکی ڕاگرتنی شکۆمەندی ئەمریکی و ئەنجامدانی هەوڵی پتەو بۆ دانانی شێواز و بارودۆخی نێودەوڵەتی لە سەروو توانای ئەمریکییەوەیە؟ نەخێر، بە مەرجێك پێشەوا ئەمریکاییەکان مەزنە و ئیرادەی سیاسیان هەبێت بۆ ئەوەی چی پێویست بوو بیکەن، ئەوەی داخوازییە مەرج نییە قەدەغە بێت. لە ڕاستیدا، زۆربەی ئەو ئەرکانەی لە بەردەمانە بریتییە لە پتەو کردنی هێزێك کە ئێستە هەمانە.

وێڕای سووکایەتییەکەی ساڵانی ۱۹۹۰، هێشتا ویلایەتە یەکگرتووەکان بە لێهاتووییەوە بەهێزترین هێزی سەربازی جیهانی داگیر کردووە. ئەم سوپایە، لە چەند دەرفەتێکدا، دوای جەنگی سارد جەسووری پیشان داوە لە : پەنەما، عێراق، کۆسۆڤۆ و ئەفغانستان. هێشتا ئەم سەرکەوتنانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەلەپوورەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان دە ساڵێکە لەسەری دەژی. ئەوە ڕاستە کە وێڕای زیادکردنی بودجە تازەکەی بۆش بۆ بەرگری، هێشتا ویلایەتە یەکگرتووەکان پارەیەکی زۆر کەم بۆ توانای سەربازی خەرج دەکات، بۆ ئاشتی ئامادەباشی لە کاتی خۆیدا و بەدەست هێنانی تەکنەلۆژیای چەکی نوێ. درزی نێوان ستراتیژییەکانی ئەمریکا و ئەو وەسیلانەی کە هەن بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانە یەکانگیر نابن. ئەم ڕاستییە، هەر کاتێك کە ویلایەتە یەکگرتووەکان بیەوێت هێز لە دەرەوە دامەزرێنێت زیاتر زەق دەبێتەوە. هێشتا ئەرکی چاك کردنەوەی ئەم کەموکوڕییانە و دروست کردنی هێزێك کە بتوانێت شێوازێك بۆ بارودۆخی نێودەوڵەتی ئەمڕۆ و سبەینێ و بیست ساڵی تر لە ئێستەوە دەتوانرێ جێ بەجێ بکرێت و لەوانەیە ساڵی ۱۰۰ بلیۆن دۆلاری لە سەروو بودجەی بەرگری ئێستەوە تێبچێت. ئەم لیستی پارەیە لەوانەیە تۆقێنەر بێت، بەڵام بە پێی مەرجە مێژووییەکان، ئەمە هاوبەشییەکی بچووکی سەروەتی ئەمریکایە. ئەم بڕە پارەیە هێشتا کەمە بە پێی پێوەری ٥٠ ساڵی ڕابردوو و زۆر نزمترە لەوەی زلهێزەکان

مێژوو دا بۆ سوپاکانیان خەرج کردووە لە. ئایا گرنگی ڕاگیرکردنی شکۆداری ئەمریکا ئەو برە پارەیە ناهێنێ؟ شەرعییەتێك بەهێزی هاوپەیمانێتی لە ئەورووپا و ئاسیاوە لەگەڵ ئیسرائیل دا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە جەنگی ساردەوە بۆ ئەمریکا ماوەتەوە، ئەم هاوپەیمانانە بوونەتە سەنگەری دەستەڵاتی ئەمریکی و پێکهێنەری دڵی نیزامی لیبراڵی دیمۆکرات، ئەو نیزامەی کە ئەمریکا دەیەوێت بیپارێزێ و بڵاوی بکاتەوە. ڕەخنەگران دەڵێن: ( شکۆمەندی نێودەوڵەتی ئەمریکی هەر لە ناوەڕۆکەوەیە و یەك لاییە. ) لە ڕاستیدا ستراتیژییەك کە بیەوێت جوامێری ئەمریکا بپارێزێت، هێشتا پێویستی بە هاوکارییەکی ئەمریکی گەورە ترە بەرانبەر هاوپەیمانەکان. ویلایەتە یەکگرتووەکان نابێت بریتی بێت لە بانکێکی دەرەوە و لە کاتی تەنگانەدا ڕووی تێ بکرێت، بە هەمان شێوە، ئەمریکا نابێت ببێتە بارچاوەشی دوودڵ کاتێ گوڕ بە خۆی بدا، کە خەڵکی شارەکەی لە کاتی مەترسیدا بە هەڵەداوان پەنای بۆ دەبەن. ویلایەتە یەکگرتوەکان دەبێت وەك هێزێکی ئامادە بۆ ئەورووپا، هەمیشە ئامادە بێت. دەبێت بە شێوەیەك کار بکات وەك بەرژەوەندی هاوپەیمانان بەرژەوەندی خۆیەتی، هەڕەشە بۆ ئەوان هەڕەشەیە بۆ سەر ویلایەتە یەکگرتووەکان. ئەمەش ڕاستیەك بێ، دەبێت کاردانەوەی ئەمریکا بە شێوەیەك بێت کە هەڕەشە لە پرنسیپەکانی شارستانیەت بە هەڕەشەکردنێك لە قەڵەم بدات، کە گەشتبێتە بەردەرگەی ئەمریکییەکان و دەست بەجێ بکەوێتە خۆی. کارکردن بە شێوەیەکی تر وا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکات وەك هاوبەشێکی باوەڕ پێنەکراو ڕەچاو بکرێت و شکۆمەندی ئەمریکا و خودی نیزامی نێودەوڵەتی لەناو دەبات.

بوونی ئەمریکایەکی بەهێز، بتوانێت یەکاویەك هێز بخاتە کار بە کاریگەرییەکی تێکشکێنەر بۆ پاراستنی ناوچە گرنگەکانی جیهان. ڕێگر دەبێت لەو تەحەدییانەی کە ڕوو بەرووی سەقامگیری و ئارامی ئەو دەڤەرانە دەبێتەوە و

دەبێتە هۆی گۆڕینی ئەو بارودۆخەی کە خۆیان پەسەندییان کردووە. ئەمریکایەکی بە توانا لەوانەشە بتوانێت ڕێگە لەم ناحەزانە بگرێت و نەهێڵێت خۆیان پڕ چەك بکەن. ئەمریکایەك کە ئارەزووی هێنانە کایەی لە گوماندا بێت، هەر ئەوەندەی لێ دەوەشێتەوە کە بەرەنگارییەکانی ناحەزەکانی زیاتر هانی بدات . ئایا ئەو پەیامەی کە دەبێت بۆ دوژمنانی بنێرێت دەبێت وا بێت؟ یان ئایا ئاوا بیری لێ بکەینەوە؟ " ئامادە باشی دەبێتە باشترین ڕێباز بۆ ئاشتییەکی بەردەوام. " ئەمەش زۆر هەرزانتر دەبێت لەو جەنگاوەرییەی کە لە سەرنەکەوتنی بونیادنانی ئەم توانایە دەکەوێتەوە.

توانای دامەزراندنی هێز لەوبەر دەریاکانەوە، لەوانەیە لە ساڵانی داهاتوودا تەگەرەی زیاتری بێتەڕێ، چونکە دەستەڵاتە بچووکەکان چەکی کۆمەڵکوژ و مووشەکی گەیاندن دابین دەکەن و دەیگەیەننە هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی و بگرە ئەمریکا خۆشی. تەواو جێگەی سەرسوڕمانە، ڕەخنەگرە بیانییەکان کە ناعادیلانە " بەرگری مووشەکی " بە داڕژاندنی زاڵبوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان و بوون بە شێفی جیهان لە قەڵەم دەدەن، ئەمانە هێشتا ڕەخنەکانیان ماقوڵتر ساز داوە وەك لە ڕەخنە خۆماڵییەکان. لۆژیکی ڕاستەقینەی بەرگری مووشەك لەوەدایە کە ئەگەری نەبێ، ئەوسا سوپای دوژمنی چەکدار کراو بە مووشەکی مەودا درێژ وەك ڕۆبیرت جۆزیف، شارەزا لە بەربەستی بڵاوبوونەوەی چەك لە کۆمیتەی ئاسایشی نیشتمانی ئیدارەی بۆش، دەڵێت: ( ئەم دوژمنانە دەتوانن شارەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانەکان بکەنە بارمتە بە ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستەمۆ بکەن. بە چەند وشەیەکی تر، بەرگری مووشەکی، لە بابەت پاراستنی توانای ئەمریکایە بۆ بەکارهێنانی هێزەکانی بەوپەڕی لێهاتووییەوە. بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات عێراق ببێتە یەکەم تاقیگەی پاش سەروەختی جەنگی سارد وەك چۆن کەس وای بە خەیاڵدا نەدەخەملاند کە بەرلین

ببێتە گۆڕەپانی جەنگی سارد. تاقیکردنەوەکە ئەگەری ئەوەی هەبوو کە لە شوێنی ترشیدا ڕوو بدات – لە کۆریای باکوور، لە تەنگاوی تایوان – یان لە گردەکانی جۆلان، بەڵام مێژوو موئامەرەیەکی کرد و یەکەم بەرەنگاربوونەوەی سەدەی بیست و یەکەمی خستە عێراقەوە. سەرنەکەوتن لە بەزاندنی سەدمدا بوو بە تیشکی ڕووناك کردنەوە;لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی نێوان جۆرج دەبیو بۆش و بیلّ کلینتۆن. پرسیاری ئەوەی، ئەی دەبێت جۆرج دەبلیو بۆش بەرانبەر سەدام حوسێن چی بکات؟ وەك لەمەوپێش کەموکوڕی هەبووە؟ ئایا ئێستە ویلایەتە یەکگرتووەکان وەڵامی لە لایە؟ ئەگەر سەرۆك بە هەمان شێوەی پێشینەکانی کاردانەوەی هەبێت، ئەوە بەبێ گومان ئەویش شکست دەهێنێت. ئەگەر، هەرچۆنێك بێت سەرۆك بۆش بتوانێت ڕژێمی عێراق بگۆڕێت، دەبێتە پێشکەوتەیەکی مێژوویی کە بۆ عێراق دادەیمەزرێنێ، کە لەوانەیە ببێتە یەکەم دیمۆکراسی عەرەب. بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانیش دەبێتە پیشاندەری هارمۆنی بەرژەوەندییەکان و نموونەییەکانی و بۆ جیهانیش، ئەوەیە کە بەبۆنەی ئەمریکاوە دەبێتە شوێنێکی سەقامگیرتر و عادیلانە تر.

پەیامەکە لە بەغداوە دەست پێ دەکات، بەڵام لەوێ کۆتایی نایەت. ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکان دوای سەرکەوتن بەرەو لە خۆڕازی بوون بڕوات و پاشەکشێ بکات وەك جاری پێشووی لە عێراق دا، خەتەری تازە زوو بە زوو سەرهەڵدەداتەوە. ڕێگرتن لەم ئاکامانە ئەو ئەرکە زەحمەتەیە کە جەنگی ناو عێراق لە خانەی یەکەمدا دەری دەخات ، بەڵام ئەمریکا ناتوانێت پشت بکاتە بەرپرسیارێتی ڕاگرتنی نیزامی پێشینەی جیهان. وەڵامی ئەم بەرەنگاربوونەوەیە بیرۆکەی خودی ئەمریکا خۆیەتی. لە پشتی ئەمەشەوە هێزێکی تۆکمەی سەربازی و ئابووری هەیە بۆ پاراستنی چەکدارییەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بە گوێرەی

پێویست دەتوانێت کار بۆ دابینکردنی سەلامەتی و پێشخستنی مەسەلەی سەربەستی لە بەغدا و لە وڵاتانی تریش بکات.

سەرچاوەکان و تێبینیەکان کە نوسەران کەڵکیان لێ وەرگرتووە و ئاماژەیان پێداوە.

۱. سێ شت کە دەبوایە خوا دروستی نەکردنایە.
Judith Miller and Laurie Mylroie, Times book ۱۹۹۰, p ۳۸
۲. ئێمە جاسووسەکانمان هەڵواسی.
Miller and Mylroie, Crisis in the Gulf, p. ۳٤
۳. بێ بەزەیی تری کرد.
Miller and Mylroie, Crisis in the Gulf, p. ۳٥

٤. سەردانی عێراق و چوونەناو خاکی ( بیگ برازەرەوە ).
Miller and Mylroie, Crisis in the Gulf, p.٢٤

٥. بەعس عێراقی زین کردووە.
Kanan Makiay, Pepublic of Fear. p ٤٢

٦. لە ملیۆنێك عێراقی زیاتر نەبوو.
New York Times, ٢٥ Oct. ١٩٩٤

٧. پرۆگرامی هەر نەبووە
US News and World Report, ٤ Feb. ١٩٩١

٨. ماڵ بە بلدۆزەر تەخت کراوە.
Miller and Mylroie, Crisis in the Gulf, p.٥٠

٩. زمانی خەڵك بڕدراوە.
Amnesty International, Aug. ٢٠٠١, p. ١٠

١٠. عێراق کێشەی سەرنگووم بووی زۆرە.
Iraq and Kurdistan, ١٩٩٨, p. ١

١١. قازانج کردن و بازرگانی بەتەماع.
Makiya, republic of Fear, p xvi

١٢. سزادانی سێکسی ئافرەتان لە لایەن حکومەتی عێراقەوە.
Human Rights in Iraq, Middle East Watch. Nov. ١٩٩٠, p. ٢٤٨

١٣. کوشتنی بە کۆمەڵ لە بەندیخانەی ئەبو غریب.
Cleansing, London Observer, ٣ Dec. ٢٠٠٠

١٤. چاوەکانیان دەرهێنرا بوو، پەنجەکانیان دیار نەبوو.

Human Rights in Iraq, Middle East Watch. Nov. ١٩٩٠, p. ٢٤٨

١٥. ئەشکەنجەدانی ئەلسەدر.

Miller and Mylroie, Crisis in the Gulf, p.١٠٨

١٦. راپەڕینی شیعە و مەیدانی کوشتن.

Sandra Mackey, New York: Norton, ٢٠٠٢, pp. ٢٨٩ – ٩١

١٧. ڕامالێنی خەڵکی ناوچەکە.

Wall Street Journal, ١٩. Aug. ١٩٩٢

١٨. هەموو خواردەمەنییەکانیان ڕاکێشایەوە.

Mackey, Reckoning, p ٣١٥

١٩. بۆمبارانی هەموو مەدەنییەکان بیٚ جیاوازی.

Vanity Fair, May. ٢٠٠٢, pp ١٢٠ ٣١

٢٠. میتۆدێك بۆ ئاسان کردنی کۆنترۆڵی حکومەت.

UN Human Rights Com-mission Special Report, Aug. ١٩٩٢

٢١. کوشتنی ماسی و کیسەڵ و گیانلەبەری ناو ئاو.

Murder of the Marshes, London Observer, ٢٨. Feb. ١٩٩٣

٢٢. جەنگی پاکتاوی رەگەزی.

Makiya, Republic of Fear, pp ٢٢ – ٢٣

٢٣. نیوەی دانیشتوانی کوردی عێراقی بیٚ ماڵ و حاڵ کرد.

Miller and Mylroie, Crisis in the Gulf, p.٥٢

٢٤. ئەو کوردانەی کە لە پەلاماری ١٩٧٤ دا هەڵهاتن.

Mackey, Reckoning, p. ٢٢٤

٢٥. هەموویان بە چەکی کیمیایی دەکوژم.

New Yorker, ٣. March. ٢٠٠٢

٢٦. لێیگەڕێ با بقیڕێنێ و بقیژێنێ.

New York Times, ٨ Aug. ٢٠٠٢

٢٧. ئەهرامی کەللەسەرەکان.

Associated Press, ١٥ Dec. ١٩٩٧

٢٨. دەبێ لە خانەی خراپترین حساباتی ئەم سەردەمەدا دابنرێت.

Michael Sterner, The Iraq-Iran war, Fall ١٩٨٤

٢٩. سەدام باوەڕی وا بوو کە جەنگ لە ماوەی مانگێکدا کۆتایی دێت.

Sandra Mackey, New York: Norton, ٢٠٠٢, p. ٢٥٢

٣٠. قافڵەکەی سەدام خۆی لە لایەن سەربازی ئێرانەوە گەمارۆ درا.

Miller and Mylroie, Saddam Hussein and the Crisis in the Gulf ( New York: Times book, ١٩٩٠ ) p. ١١٤

٣١. ستراتیژ و تاکتیکی نالەباری عێراقییەکان.

Makiya, Republic of Fear, pp ٢٧٦ – ٧٧

٣٢. عێراق بە لای کەمەوە ١٨٩ ڕۆکێتی گرتە تاران.

Michael R. ( Boston: Little, Brown and Co. ١٩٩٥ ) p. ٢٢٩

٣٣. ئێمە وەك باینجان سووریان دەکەینەوە.

Mark Fineman, Madness in the Marshes. Los Anglos Times. ١٤. Aug. ١٩٩٠

٣٤. دار و تێلا یان کێبل.

Los Anglos Times, ٢٢ Jan. ١٩٩١

٣٥. شایەتی دانی ئەندرۆ وایتلی.

Washington Post, ٢٥. Jan. ١٩٩١

٣٦. تاریق عزیز بە ڕاشکاوی باسی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کرد.

Jill Smolowe, Chemical Warfare, Times, ٢٢ Aug. ١٩٩٨

٣٧. بەکارهێنانی زۆرتر و خەستتر.

Associated Press, ٢٧ Aug. ١٩٩٨

٣٨. عێراق بۆ پێنج ساڵی یەك لە دوای یەك کیمیایی دژی ئێران بەکارهێناوە.

Washington Post, ٢ Aug. ١٩٩٨.

٣٩. دەرمان ڕێژکردنی ئەم جانەوەرانە.

Washington Post, ٦ March. ١٩٨٤.

٤٠. هێزەکانی سەدام، دەیانکوشتن یان تا مردن ئەشکەنجەیان ، یان کارەبایان دەدا لە شوێنی هەستیاری لەش دەدا.

Washington Post, ٢٠ March. ١٩٩٣

٤١. ئایا تۆش شیر و کۆرنفلێکست دەست دەکەوێت؟

Michael Kranish, Saddam Hussein On TV. ٢٤ Aug. ١٩٩٠

٤٢. لە کار خستنی ٧٩٤ بیری نەوت لە کوەیت.

Gulf War Update, Science News, ١٦. Nov. ١٩٩١

٤٣. ئاسمان بارانی چەور و ڕەشی دەباراند.

Dowell and Riley. A Man Made Hell on Earth. Time, ٣ March. ١٩٩١

٤٤. جوولەکەی داگیرکەری بێ ڕەوشت.

BBC, Worldwide, ١٧. Jul. ٢٠٠١

٤٥. بۆ بەرەنگاری بۆمبای حازری ئیسرائیل.

New York Times, ٢٤. Jul. ١٩٨٢

٤٦. فەرمییە عێراقییەکان بە ئاشکرا باسی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجیان دەکرد.
Richard Butter, The Greatest Threat ( New York: Public Affairs, ٢٠٠١ ) p. ١١٨

٤٧. لەناوبردنی کیانی زایۆنی.
Miller and Mylroie, Crisis in the Gulf, p. ١٤

٤٨. خزمانی خۆتەقێنەرەوەکان ٢٥٠٠٠ دۆلاریان دەست دەکەوت.
Associated Press, ٣ Apr. ٢٠٠٢

٤٩. شەڕە تفەنگی نزیك شاری ئەفولە.
London's Daily telegraph, ٣٠. May ٢٠٠٢

٥٠. بەڵگەی پتەو بە بوونی ئەندامی ئەلقاعیدە لە عێراق.
Bob Graham, chairman of the Senate Intelligence Committee, ٩ Oct. ٢٠٠٢

٥١. لەوە دڵنیا بوون کە پارە لە عێراقەوە دەهات.
USA today, ٣ Dec. ٢٠٠١

٥٢. عێراق مەشقی بە ئەندامانی ئەلقائیدە کردووە.
CIA director, gorge Tenet Letter, ٩ Oct. ٢٠٠٢

٥٣. تەنها عێراق جێگەی زامن کراوی بە ئەبو نزاڵ دەبەخشی.
Ari Fleisher, ٢٠ Aug. ٢٠٠٢

٥٤. عێراق بنکەی بۆ چەند گروپێکی تیرۆریستی خۆش کردووە.
U.S. Department. ٢١ May. ٢٠٠٢

٥٥. حەماسیش کەڵکی لە بەخشندەیی سەدام وەرگرتووە.
David Rose, Vanity Fair, ٢ May. ٢٠٠٢

٥٦. ئێمە مەشقمان بەم خەڵکانە دەکرد بۆ لێدانی دەزگەکان.

New York Times, ٨ Nov. ٢٠٠١

٥٧. تەنانەت مەشقی بەکار هێنانی چەقۆ و چەتاڵیشمان کردووە.

Iraqi defector on Salman pak, ٧ Jan. ٢٠٠٢

٥٨.دڕندەکانی سەدەی بیست و یەکەم.

President Clinton, Pentagon, ١٧ Feb. ١٩٩٨

٥٩. گەشەدان بە چەکی بایۆلۆژی لە سالانی ٧٣ و ٧٤ ەوە و توێژینەوە لەسەر میکرۆب.

UN Report Annex C, hereafter Annex C, ٢٥ Jan. ١٩٩٩, p. ٣٧

٦٠. سەدام دەستی بە دابین کردنی چەکی کۆمەڵکوژ کرد.

Miller and Mylroie, Saddam Hussein and the Crisis in the Gulf ( New York: Times book, ١٩٩٠ ) pp. ١٥٦ – ٥٧

٦١. ٨١٩ مووشەکی ماوە درێژی لە دەرەوە هێنرا.

UN Report, Annex A, ٢٥ Jan. ١٩٩٩, p. ٣

٦٢. تاقیکردنەوەی چەکی بایۆلۆژی لە ساڵی ١٩٨٧ و ١٩٩٨ دا.

Details of Iraq's BW program quoted in Annex C, p. ٣٢

٦٣. نزیکەی ١٠٠٠٠ کلاوەی گازی ئەعسابی هەبوو.

UN Report, Annex B, ٢٥ Jan. ١٩٩٩, p. ٧

٦٤. دە ئەوەندەی ژمارەی چەکی کیمیایی.

Washington Post, ١٧ Nov. ٢٠٠٢

٦٥. هاوتای جەنگ لە کۆنترۆڵ کردنی چەکدا.

Rolf Ekeus. The Greatest Threat. ( New York: Public Affairs. ٢٠٠١, p. ٥٣

٦٦. سەگ، واجبی ماڵەوەی خواردم.

Greatest Threat, p. ٥١

٦٧. بەرزترین پلەی بڕیار بۆ چەك شاردنەوە.

UN Report Annex D, ٢٥ Jan. ١٩٩٩

٦٨. لۆرییەکان بۆ سەیران چوون.

Butler, Greatest Threat, p. ١٥٧

٦٩. فەرەنسا و روسیا، هەموو هەلێکیان دەقۆستەوە.

New Republic, ٢٥ Feb. ٢٠٠٢, p. ١٩

٧٠. پیاوێکە، دەتوانم کاری لەگەڵدا بکەم.

Koffi Annan, Los Angeles Times, ٢٥ Feb. ١٩٩٨

٧١. زیاتر خۆی لە سستی نەتەوە یەکگرتووەکان نزیك دەکردەوە.

Kaplan, Bluffing why is Bush Demanding Weapons Inspectors?

٧٢. هەمان گەمەی کۆنی چاوشارکێ.

Kaplan, Bluffing why is Bush Demanding Weapons Inspectors?

٧٣. پشکنەرانی چەك، هەرگیز نەیاندەدۆزییەوە.

Miller and William, The Iraqi shell game, New York Times, ٢٠ Dec. ١٩٩٨

٧٤. بەردەوام درۆیان دەکرد.

Scott Ritter, ٣ Sep. ١٩٩٨

٧٥. عێراق بە تەواوی سەرقاڵی دروست کردنی چەکی کیمیاییە.
Richard Butler, ٢١ Jul. ٢٠٠٢

٧٦. کۆهین راپۆرتیکی پێنتاگۆن بڵاو دەکاتەوە.
Myers and Schmitt, New York Times, ٢٢ Jan. ٢٠٠١

٧٧. مستەر سعید لە بابەت چەند بەرهەمێکەوە قسە دەکات.
Miller, New York Times, ٢٠ Dec. ٢٠٠١

٧٨. ئیدارەی ئەمریکی و حکومەتی بەریتانیا، بەڵگەی زیاتر دەخەنە ڕوو.

٧٩. زۆر خراپە کە هیچیان نایدۆڕێنین.
Kempster, Los Angeles Times, ١٧ Dec. ١٩٨٦

٨٠. بانکی ئیسکیم دەتوانێ ڕۆڵێکی گرنگ بگێڕێت.
Bruce W. Jentleson, New York: Simon and Schuster, ١٩٨٤, p. ٤٣

٨١. هاندانی وڵاتانی تر بۆ پێدانی پارە و چەك بە عێراق بۆ پشت گیری ئەرکی جەنگ.
Jentleson, With Friends Like These, p. ٤٥

٨٢. سۆز بخەرە ئەو لاوە.
Jentleson, With Friends Like These, p. ٨٤

٨٣. بوونی واقعێکی ماقوولتر.
Jentleson, With Friends Like These, p. ٨٤

٨٤. چی لە دراوسێکانی داوا دەکەین، ئەوەش لە عێراق داوا دەکەین.
Jentleson, With Friends Like These, p. ١٠٤

٨٥. بە هیچ شێوەیە سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان نییە.
Jentleson, With Friends Like These, p. ١٤٦
٨٦. من لام وایە کێشەکەتان لەگەڵ میدیای رۆژئاواییە.
Jentleson, With Friends Like These, p. ١٤٦
٨٧. خەبەرێکی سەرۆکایەتی پێ گەشت.
Michael R. ( Boston: Little, Brown and co., ١٩٩٥) p. ٢٣
٨٨. رێگەم بدە کە دڵنیات بکەم.
Gordon and trainor, The Generals War, p. ٢٣
٨٩. بە شەخسی دەیناسم.
R. W. apple Jr., New York Times, ٣ Oct. ١٩٩٥
٩٠. گەلی ئەمریکا نایانەوێت رۆڵەکانیان لە دەست بدەن.
Gordon and trainor, The Generals War, p. ٢٣
٩١. پێکهاتەکانی پاسەوانی کۆماری.
Boston: Houghton Mifflin, ١٩٩٣ ), p. ٤٧٠
٩٢. ئێمە کارەکەمان بەجێ هێناوە.
Gordon and trainor, The Generals War, p. ٤١٦
٩٣. ئێمە بۆ خۆمان دێین.
George H. W. Bush, New York: Vintage Books, ١٩٩٩, p. ٤٣٣
٩٤. بەشداری ناکات.
Colin Powell, New York: Random House, ١٩٩٦, p. ٥١٢
٩٥. مەیلی ئێمە لە رووی پراکتیکەوە.
Powell, My American Journey, p. ٥١٦

٩٦. حکومەتی دوای جەنگ وا دەهاتە بەرچاوم.
Brent Scowcroft, Interview with ABC News, ٧ Feb. ١٩٩٨
٩٧. بۆ ئەوەی گەلی عێراق کارەکان بگرنە دەستی خۆیان.
George H. W. Bush, ١٥ Feb. ١٩٩١
٩٨. ئەگەر سەدام بڕوخایە.
Powell, My American Journey, p. ٥١٣
٩٩. دیاردەی خاچپەرستی رەوشت.
Hans J. ( New York: Alfred A. Knopf. ١٩٥١ ) p. ٣٥
١٠٠. هێمنی لە بەکارهێنانی دەستەڵاتدا.
Quoted in Robert Kagan, The Revisionist, New Republic, ٢١ Jun ١٩٩٩, p. ٣٦
١٠١. من لەو داناییە دوو دڵ بووم.
Bush and Scowcroft, A World transformed, p. ١٨٨
١٠٢. هەستم بە ئازار دەکرد، کە دەمدی پیلسن ..
Bush and Scowcroft, A World transformed, p. ٥٥٦
١٠٣. پشتگیری ئەوانە مەکە کە خولیای سەربەستین.
George H. W. Bush. ١ Aug. ١٩٩١
١٠٤. لە راستیدا من هیچم لە چین ناوێت بیکات.
Bush and Scowcroft, A World transformed, p. ١١١
١٠٥. دوا بە دوای جەنگی کەنداو.
David Gompert. Foreign Affairs, Jul / Aug. ١٩٩٤, p. ٣٠
١٠٦. ئێمە سەگمان لەم شەڕەدا نییە.
James Baker, quoted in Time, ١٧ Aug. ١٩٩٢

١٠٧. هەقی کورد و شیعەت نەبێت.

Bill Clinton, interview with New York Times, ٢٨ Jun. ١٩٩٢

١٠٨. ئێمە پشت هەڵناکەین.

Time, ١١ Aug. ١٩٩٧

١٠٩. ئامانجی ئێمە ئاشکرایە.

Martin Indyk, ١٨ May ١٩٩٣

١١٠. ویلایەتە یەکگرتووەکان پشتگیری لەمە ناکات.

ABC News, ٧ Feb. ١٩٩٨

١١١. ئەم پیاوانە گروپێکی بێ توانان.

Robin Wright, Los Angeles Times, ٧ Dec. ١٩٩٥

١١٢. ئەمانە لە هەموو شتێ زیاتر مێش و مەگەزن.

John L. and David B., Washington Post, ٢٣ Jun. ١٩٩٦

١١٣. بەرژەوەندی ئێمە لە کوردەکاندا.

William Perry, ١٧ Dec. ١٩٩٦

١١٤. مووشەکەکانمان ئەم پەیامەیان پێ بوو.

Bill Clinton, ٣ Sep. ١٩٩٦

١١٥. نامەیەك بوو ڕووەو عێراق

M. Albright, ٢٨ Jun. ١٩٩٣

١١٦. دیزاینی بۆ نەکرابوو.

Al Gore, interview with CBS News, ٢٨ Jun. ١٩٩٣

١١٧. لێدانێکی یەك لایی کەرەوە.

Al Gore, Houston Chronicle, ٢٩ Jun. ١٩٩٣

١١٨. ئێمە لە بابەت جەنگەوە نادوێین.

M. Albright, ١٩ Feb. ١٩٩٨

١١٩. لە هەوڵدانی قایل کردنی خەڵکی کەوتووین.

Kenneth M., New York: Random House, ٢٠٠٢, p. ١٠٢

١٢٠. ئامێری ڕێ نیشاندەر هێشتا لەوێیە.

Selean H. Associated Press, ٧ Oct. ١٩٩٩

١٢١. لەوانەیە باردۆخێك بخوڵقێنێ.

Colum L. , Washington Post, ٣١ Aug. ٢٠٠٠